# ڕەوشی کوردان

## مێژووی کوردستان

نووسینی
عبدالقادر کوڕی ڕوستەمی بابان

وەرگێڕانی
کەریمی حیسامی

چاپی هەوەڵ هاوینی ١٩٩١
ناوەندی چاپ و ڕازاندنەوەی مەنسوور

# پێشەکی

نووسینی :ڕەفیق سابیر

وەک چۆن لە ڕۆژگاری ئێمرۆدا زەحمەتە نەتەوەیەک هەبێ بە ئەندازەی نەتەوەی کورد بە دەست ژیانی ژێر دەستی و کۆیلایەتییەوە بناڵێنی. بە هەمان شێوە ڕەنگە بە دەگمەن نەتەوەیەک هەبێ وەک نەتەوەکەمان بە مێژووی خۆی نامۆ کرابێ. وا دەزانم تراژیدیای داگیر کردن و کۆیلایەتی نەتەوەیی لێرەوە دەست پێدەکات.

ئەگەر بەشێکی ئەم بە مێژوو نامۆ بوونە لەوە دابێ کە خۆمان خودانی مێژووی خۆمان نەبووین و پرۆسەی مێژووەکەمان شێوەیەکی سروشتی، یان نیمچە سروشتی، بە خۆ نەگرتبێ و چەندان بەش و قۆناخی گەشەداری کوێر کرابنەوە، ئەوا بەشەکەی تری ئەم نامۆییە لەوەدایە کە پرۆسەی کار لێکردن و تەفاعولی نێوان قۆناخە مێژووییە گرنگەکانی کوردستان و، پەیوەندی ژیانی مادی و ڕۆحی نێوان بەشە لێکدابراوەکانی نەتەوەکەمان تا ئەمرۆ سست و لاوازن. مێژووی ئێمە لە زۆر ڕووەوە وەک کۆمەڵە ڕووداوێکی لێکدابراو نەک پێکەوە گرێدراو، وەک کۆمەڵە ئامانج و ئایدیالێکی لێک جیاواز نەک هاوبەش دێتە پێش چاو، بە واتایەکیتر مێژووی سەرتاسەری نەتەوەکەمان لە زنجیرە ڕووداوو دیاردەیەکی پێکەوە لکاوی کوردستانی ناچێ کە یەک ئامانج و ئایدیالی هاوبەش پێکەوەی گرێ دابن و، هەر یەکەیان ئەویتریانی تەواو کرد بێ. یان هەر یەکەیان زەمینەی بابەتی بۆ سەر هەڵدانی دیاردەی خۆی

خۆشکردبێ تا درێژە پێدەری هەمان پەیامی سیاسی و فیکری و رۆحی دیاردەکەی پێش خۆی بێت.

ئەگەر مێژووی گرنگترین سەردەمەکانی هەر بەش و هەرێمێکی کوردستان، بە مێژووی فیکری و کولتووریشەوە بگرین دەبینین تا رادەیەکی زۆر لە مێژووی سەردەمەکەی پێش خۆی، یان لە مێژووی هەمان سەردەمی ناوچەیەکی دیکەی کوردستان جیاوازە. هەر سەردەمێکی مێژوویی کاتی کۆتایی پێهێندراوە لە گەل خۆیدا دیاردە فیکری و سیاسی و کولتورییەکانی خۆی پێچاوەتەوە و ئێتر سەردەمێکی دی لە بەشێکی دیکەی کوردستاندا دەستی پێکردووە بێ ئەوەی پێوەندییەکی تەواو کارانەی بە ژیانی رۆحی و مادی سەردەمەکەی پێش خۆیەوە هەبێ.

ئەم دیاردە ناسروشتییە بۆتە هۆی هێزی هەر رووداوو دیاردەیەکی مێژوویی نەتەوەکەمان و، وزەی هەر دیاردەیەکی مادی و رۆحی کۆمەڵگای کوردستان زیاتر تا سنوورێکی جوگرافی تەسک و تا کاتێکی دیاریکراو بڕ بکەن و،کاری خۆیان لە بەشێکی کەمی نەتەوەکەمان بکەن. لێرەوە بەرای من پرۆسەی ئەفاعولی نێوان مێژووی ئێمە و نێوان نەتەوەکەمان پرۆسەیەکی ناتەواو رێژەیی(نیسبی)یە...پرۆسەیەکی بەش بەش و قۆناخ بە قۆناخ و هەرێمییە نەک سەرتاسەری. بە واتایەکی تر مێژووی ئێمە وەک یەک بابەتی یەکگرتوو... وەک یەک شێوە ژیان... وەک یەک زنجیرە خەبات و راپەرین... وەک یەک ئامانج و ئایدیالی یەک نەتەوە کاری خۆی کردۆتە سەر نەتەوەیەک لە دوای یەکەکانی نەتەوەکەمان. بۆیە خەڵکی هەر بەش و هەرێمێکی کوردستان زیاتر بەرهەمی مێژوویی تایبەتی بەش و هەرێمەکەی خۆیانن، نەک بەرهەمی مێژووی سەرتاسەری نەتەوەکەمان، زیاتر هەست بە ئینتمای هەرێم، یان بەشە کوردستانەکەی خۆیان دەکەن نەک بە ئینتیمای

سەرتاسەری کوردستانی.

بۆ نموونە: وەک دەزانین لە سەرەتای سەدەی شانزدەیەمرا کوردستانی باکوور، لە سایەی هەندێ لە میر نشینە کوردەکاندا(میر نشینی بەتلیس، هەکاری، ...هتد) سەرەتای بوژانەوەیەکی ئابووری و سیاسی و کولتووری فراوانی بە خۆیەوە دی. بە پشتبەستن بە شەرەفنامەو سیاحەتنامەکەی ئۆلیا چەلەبی و مەم و زینی خانی، ژیانی شارستانی ئەو سەردەمانەی کوردستانی باکوور لە ئاستێکی بەرچاوو پێشکەوتووی سەردەمەکەی خۆیدا بووە. دەشێ دروستبوونی شێوە زمانی ئەدەبی کرمانجی سەروو، دەرکەوتنی مەلای جەزیری و خانی، کە دوو لوتکەی ئەدەبی و فیکری رۆژهەلاتن، بە نیشانە و بەرهەمی شارستانی ئەو سەردەمانەی کوردستان دابندرێن. بەلاّم کاتێک داگیر کەران کوردستانی سەروویان وێران کرد هێشتا تیشکی ئەم شارستانییە نەگەیشتبووە بەشەکانی‌تری کوردستان. بۆیە شتێک دەربارەی ژیانی شارستانی ئەو سەردەمانەی هەرێمەکانی کوردستان نازانین. ئەوەندە هەیە دواتر، لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نوزدەیەمدا کوردستانی خواروو لە سایەی میرنشینی باباندا، گەشانەوەیەکی ئابووری و سیاسی و کولتووری بەرچاوی بە خۆیەوە دیوەو، لەو سەردەمەدا شێوە زمانی ئەدەبی کرمانجی خواروو دروست بووە. بەلاّم ناتوانین ئەم پرۆسە مێژووییانە بە درێژە پێدەری پرۆسەکەی کوردستانی سەروو دابنێین. ناتوانین نالی و سالم و کوردی و مەولەوی و مەولانا خالید، کە لوتکەی ژیانی ئەدەبی و رۆحی ئەو سەردەمەی نەتەوەکەمانن، بە درێژە پێدەری مەلای جزیری و خانی دابنێین.

لێرەوە لام وایە دەتوانین سەربەخۆ لە زۆر قۆناخی مێژوویی نەتەوەکەمان بکۆلینەوە بێ ئەوەی بە جۆرێکی حەتمی بە قۆناخێکی تریەوە ببەستینەوە.

دەتوانین بە جیا باسی ژیانی فیکری و رۆحی و ئەدەبی سەردەمی نالی وسالم و کوردی و مەولەوی و مەولانا بکەین بێ ئەوەی بە ژیانی فیکری و رۆحی و ئەدەبی سەردەمی مەلای جزیری و خانی ببەستینەوە. دەشێ لە راپەرینی شیخ عبیداللە و لە بزوتنەوەی رۆشنگەری و سیاسی سەرەتای ئەم سەدەیەی کوردستانی باکوور، کە رواڵەتەکانی لە دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان و دامەزراندنی کۆمەڵێک ریکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا دەرکەوتن، بکۆڵینەوە بێ ئەوەی بە بزوتنەوەی سیاسی و کولتووری سەردەمی بابانەکان و ئەردەلانەکانی ببەستینەوە... دەتوانین لە کۆماری مەهاباد بکۆڵینەوە بێ ئەوەی بەم بزوتنەوە سیاسی و رۆشنگەرییە، یان تەنانەت بە شۆرشەکەی شیخ مەحموودی ببەستینەوە.

لیرەدا دەپرسین ئاخۆ لێکدابران و کار لە یەکتری نەکردنی ئەم دیاردە سیاسی و فیکری و کولتوورییانە تەنیا بۆ شاڵاوی داگیرکەران و لە بار چواندن و جوانە مەرگ کردنی ئەم دیاردانە دەگەرێتەوە؟.. یان بۆ لێکدا برانی جوگرافی کوردستان؟.. یان بۆ هێزو وزەی ژیان و سیستمی فیودالی و عەشیرەتگەری؟.. یان بۆ نەبوونی یەک ئامانج و ئایدیالی هاوبەش و نەبوونی یەکیتی ژیانی رۆحی نەتەوەی کورد ؟!

ئایا دەتوانین باسی کام ئامانج و ئایدیالی نەتەوەیی هاوبەش و کام ژیانی رۆحی هاوبەشی نیوان میرنشینەکانی بابان و ئەردەلان بکەین لە کاتێکدا بە دریژایی دەیان ساڵ سەرقاڵی پەلاماردان و پیکدادانی یەکتری بوون؟ دەتوانین باسی کام هەستی نەتەوەیی هاوبەش وئامانجی نەتەوەیی هاوبەشی میرنشینی سۆران بکەین لە کاتیکدا میری سۆران قەتلوعامی بە کۆمەڵی یەزیدییە(کافرە)کانی دەکرد ؟!. کامەیە ئایدیال و ئامانجی هاوبەشی خردی بابانەکان لە کاتیکدا زۆربەی میرەکانی، لە بەر خۆپەرستی و

دەسەلاتپەروەری شەرمهێنەرانە لەشکری داگیرکەرانیان دوای خۆیان دەخست و کوردستانیان پێ کاول دەکرد.

نووسەری ئەم کتێبە بەنرخە (عەبدوالقادری رۆستەمی بابان)، هەندێ رووداوی سەیرمان سەبارەت بە خۆ خۆری میرانی بابان بۆ دەگێرێتەوە، کە هەندێکیان، بە مەبەستی دەسەلات زەوت کردن لە مام و براکانیان، لە بەغداوە لەشکری عوسمانییان دوای خۆیان خستووە تا دەست بە سەر سلێمانیدا بگرن، هەندێکی تریان بۆ هەمان مەبەست لەشکری ئێرانیان دوای خۆیان خستووە!!. ئەم تراژیدیا ـ کۆمیدیایە لە سەردەمی جووتە برا سلێمان پاشا و مەحموود پاشادا گەیشتۆتە لوتکە، کاتێ وەک نووسەر دەڵێ:

*ئەم جوتەبرایە لە ماوەی چوار ساڵدا، یەکیان بە یارمەتی لەشکری عوسمانی وئەوی تریان بە یارمەتی لەشکری ئێرانی، شەش جار بە نۆرە بەسەر وڵاتی باباندا زاڵ بوون و، وڵات لە دەستدرێژی ئەوان تووشی وێرانی و چارە رەشی بوو!!*

پیرەمێرد لە یاداشتەکانی بە ناهەق نەینووسیوە کە: (*سلێمانی لە ئیبتیدای تەشکیلیەوە هەرچی ئەبوو بە حوکمدار برا بچوکەکەی دەری ئەپەراند)ـ ڕۆژنامەی ژیانەوە ـ ژمارەی.....*

لێکدابڕانی نەتەوەکەمان، بەر لە هەر هۆکارێکی خۆیی و بابەتی، نێو خۆیی و دەرەکی بێ، تا ئێستا گیروگرفتی گەورەیان لە بەر دەم سەرجەمی ژیانی مادی و رۆحی نەتەوەکەمان، بە تایبەتی بۆ بزووتنەوە رزگاریخوازییەکەی دروست کردووە. بە رای من ئاشکرێ لێکدا برانی ئێمرۆی بەشەکانی کوردستان و پرش و بڵاوی نێوان لایەنەکانی بزووتنەوەی کورد تەنیا بە ئەنجامی دابەشکردنی نوێی کوردستان(واتا دوای جەنگی یەکەمی جیهان) دابندرێ، بەڵکو مێژووەکەی زۆر لەوە کۆنترە، دەشێ خودی ئەم

لیکدابرانە میژووییە پاریدەدەرێکی دابەشکردنی نوێی کوردستان بووبێ کە ئیمپریالیستەکان و داگیرکەرانی کوردستان توانییان بە سوک و ئاسانی کەمە بە چارەنووسی سەرجەمی نەتەوەکەمان بکەن بێ ئەوەی رووبەرووی بەرەنگاربونەوەیەکی کوردستانی ببنەوە.

بۆیە بە رای من میژووی ئێمە وەک یەک بابەتی یەکگرتوو... وەک یەک شێوە ژیان و یەک چارەنووسی هاوبەش... وەک یەک زنجیرە خەبات ... وەک هیزی مادی و رۆحی هاوبەش... وەک یەک ئامانج و ئایدیالی یەک نەتەوە، هێشتا کاری خۆی نەکردۆتە سەر ئێمە... میژووی ئێمە هێشتا کەرەسەیەکی خاوەو نەکراوەتە هۆکاریکی پەروەردەکردنی مرۆڤەکانی کوردستان... لەبەر ئەوە ئێمە زیاتر بەرهەمی بەشێکی میژووی نەتەوەکانین نەک بەرهەمی سەرجەمی میژووەکەمان... خەڵکی هەر پارچەیەکی کوردستان زیاتر کەوتوونە ژێر کار تێکردنی میژووی هەرێمەکەی خۆیان نەک میژووی هەموو کوردستان، هەر بەشەیان سەرقالی گیرو گرفت و بەرژەوەندییەکانی خۆمانین، نەک بەرژەوەندی هەموو نەتەوەکەمان.

تۆ بلێی لە ئەنجامی ئەم دیاردەیەدا نەبێ کە ئێمرۆ، لە گەڵ ئەوەی گەلەکەمان رووبەرووی مەترسی لەناو بردنی فیزیکی و رۆحی بۆتەوە، کەچی تا ئێستا بیری سیاسی کوردستان... بیری یەکێتی خەباتی کوردستان... دەرک کردنی بە یەکێتی چارەنووس و ئایدیال وئامانجی کوردستانی بەرادەیەک لە نێو ئێمەدا لاوازە کە لایەنەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان ناتوانن لەسەر سادەترین بەرنامەی هاوبەشی کوردستانی رێک بکەون. یان کاتێ بەشێکی نەتەوەکەمان لەناو دەبرێ کەچی هێزە سیاسیەکانی بەشێکی دیکەی نەتەوەکەمان بێ دەنگ دەبن و لاشیان شەرم نییە کە هێندەی خەڵکی نەناس و بیانی لەسەر نەتەوەکەی خۆیان بە دەنگ

نایەن.

لێرەوە پێشنیار دەکەم لە سەرەتادا بۆ مێژووی نەتەوەکەمان بگەڕێینەوە، تا بتوانین سەرجەمی ئەم مێژووە وەک یەک بابەتی پێکەوە گرێدراو بکەینە هێزێکی نوێی مادی و رۆحی نەتەوەکەمان... تا ئێمەو نەتەوەکانی ئایندەمان، بە پێچەوانەی باپیرانمان، ببینە بەرهەمی مێژووی سەرتاسەری نەتەوەکەمان، نەک مێژووی هەرێمەکەمان...ببینە هەڵگری ئامانج و ئایدیالی هاوبەشی نەتەوەکەمان نەک تەنیا ئایدیال و ئامانجی تەسکی ناوچەکەمان. تا بتوانین کوردستانییانە، نەک هەرێمچیانە، بیر بکەینەوە و کار بۆ ئایندەی هاوبەشمان بکەین.

ئەگەر فیکرو هۆشیاری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیمان رەنگدانەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی و نەتەوە پێمان بێ، ئەوا گۆڕینی ئەم واقیعە بە بێ داهێنانی فیکرو هۆشیارییەکی نوێی ئەوتۆ، کە ببێتە هێزێکی مادی نەتەوەکەمان، نایەتە دی.

کارەساتی نەتەوەی کورد هەر لەوەدا نییە کە بە درێژایی سەدان ساڵ خۆی و خاکەکەی و هەموو شتێکی گیاندارو بێ گیانی نێو نیشتمانەکەی، لە لایەن دەسەڵاتدارانی سێ نەتەوەی زاڵەوە داگیر کراون، بەڵکو کارەساتەکەی لەوەشدایە کە هەر کام لەم سێ نەتەوە زاڵانەی کوردستان بە وڵاتەکەیانەوە گرێدراوە سەردەمێکی دوورو درێژ خاوەنی ئیمپراتۆرییەکی ملهوڕی چنگ بە خوێن بوون. هەر یەک لەم ئیمپراتۆرییانە: ئیمپراتۆری عەرەبی ئیسلامی، ئیمپراتۆری فارسی ئێرانی، ئیمپراتۆری تورکی عوسمانی خودانی مێژوویەکی سەدان ساڵەی پەلاماردان و داگیر کردنی وڵاتانی تر و کۆیلە کردنی گەلانی‌تر بوون. هەر یەکەیان بە ئەندازەی دەقاتی نیشتمانەکەی خۆیان خاک و وڵاتی نەتەوەکانی تریان داگیر کردبوو... هەریەکەیان دە ئەوەندەی ژمارەی

کەسانی نەتەوەکەی خۆیان خەڵکی نەتەوەکانی تریان کۆیلە کردبوو. ئەگەر دوێنێ کوردستان کاروانسەراو هەوەڵین ئامانجی پەلاماری زۆربەی ئەم ئیمپراتۆرییانە بووبێ، ئەوا ئەمڕۆ دوا پاشماوەی ئەم ئیمپراتۆرییانە و دوا وڵاتی ژێردەستەی وەچە میراتگرەکانیانە (دیارە جگە لە ئێران کە نەتەوەی تری ژێر دەستەی تێدایە).

لام وایە ریشەی کۆنە پەرستی و گیانی شۆڤینیزم لە نێو ئەم وڵاتانەدا لە داگیر کردنی سەدان ساڵەی وڵاتانی ترو لە داگیر کردنی تا ئیمڕۆی کوردستانەوە سەر چاوە دەگرن. چونکە ناسیونالیستان و شۆڤینیستانی ئەم نەتەوانە لە پرۆسەی داپلۆسینی خەڵکی دیموکراتیخواز و پێشکەوتنخوازی نەتەوەکەیان و، لە پرۆسەی کۆیلە کردن و لەناو بردنی نەتەوەی کورددا، هێزو وزەی خۆیان لە مێژووی خوێنڕێژانەی ئیمپراتۆرییەکانیان و لە کولتووری نیگەتیڤانە و داپلۆسینەرانەی نەتەوەکانیانەوە هەڵدەهێنجن و دەیانەوێ ئەم مێژوو و کولتوورە بە زیندوویی لە هۆشیاری کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیای خەڵکی نەتەوەکانیاندا بە زیندوویی بهێڵنەوە. ئەوان لە درێژە پێدانی داگیر کردنی کوردستاندا شانازی و بەرەوەری قەومی خۆیان و (سەروەری!) ئیمپراتۆرییە دۆڕاوەکانیان دەدۆزنەوە.

ناسیونالیستانی تورک و عەرەب و فارس تا ئێستاشەو بەو رۆژگارە پەمەبیەوە دەبینن کاتێ شمشێری باپیرانیان هێندە بە زەبر بوو کە دەیتوانی لە چەند وڵات و کیشوەرێکدا سەر بپەڕێنێ... کاتێ لە وڵاتانی ژێر دەستیاندا بە نرخترین شتومەکیان تاڵان دەکرد و جوانترین کیژ و ئافرەتیان هەڵدەبژارد و دەیانکردنە (جواری) شەوە سوورەکانیان و کەنیزە و خزمەتکاری ماڵەکانیان... بۆیە ئەوان ناتوانن لە روانگەی شارستانی و دادپەروەری و ئینسانییەوە دان بە مافی دیموکراسی خەلکی وڵاتەکانیان و دان بە مافی

چارەنووسی گەلی کورددا بینن. ئەوان، کە لە پیشەی کوشتن بەولاوە کارێکی‌تر نازانن، ئازادی و سەروەری خۆیان لە کویلە کردن و لە ناو بردنی خەڵکی‌تردا دەبینن.

ئەو تاوانە کەم وێنانەی داگیر کەرانی کوردستان بەرامبەر بە گەلەکەمان دەیکەن تەنها لە دەست ئەوانە دێ کە بەرهەمی میژوویەکی سەدان ساڵەی سەرپەراندن و لە ناو بردنی خەڵکی‌تر بن.. تەنیا لە دەست وەچە(شەرعی)یەکانی ئەو جانەوەرانە دێ کە بە درێژایی سەدان ساڵ وڵاتی خەڵکی تریان نوقمی لافاوی خوێن دەکرد.

باله نێو دەیان و سەدان کارەساتی جۆرتاوی کەم وێنەدا، وەک نموونەی ئەم رەسەنایەتییە میژووییە، بەراوردی روداوێکی دێرین (کە نووسەری ئەم کتێبە بە نرخە بۆی تۆمار کردووین) و روداوێکی هاوچەرخ بکەین:

کاتێ لەشکری ئیسلام بۆ کویلە کردنی نەتەوەی کوردو راوورووت و جەردەیی درێژە بە داگیر کردنی کوردستان دەدات، لە ناوچەی شارەزوورو پاوە ترشی بەرەنگار بوونەوەیەکی سەختی کوردەکان دێ کە داکۆکی لە خاک و ماڵ و ئایدیالی رۆحی خۆیان دەکەن. دوای شەرێکی گەرم کوردەکان دەشکێن، ئێنتر ـ وەک نووسەر باس دەکات:

*لەشکری ئیسلام سێ شەوو سێ رۆژ خەلکیان کوشت، لە ئەنجامدا لافاوی خوێن لە ئەدپاڵی کێو وەک چەم هەستا... هەموو کوردەکان کوژران... ژن و منداڵیان بە نسیب لەشکری عەرەب بوو... ژنەکانیان داگیر کران)*

ئایا چ جیاوازییەکی چۆنایەتی لە نێوان ئەم جۆرە هێرشانە و هێرشەکەی ساڵی١٩٨٨ی سوپای داگیرکەری عیراق بۆ سەر ناوچەکانی گەرمیان و قەرەداغ و دۆڵی جافایەتی و دەشتی هەولێرو بادینان و ...هتد هەیە، کاتێ بە هەزارانیان لە ناوبرد و بە سەدان بگرە بە هەزاران کیژ و ئافرەتی کوردیان

زەوت کردو، بەشێکیان لە پاداشتی کزمەکی (قەومی) قادسیەدا، رەوانەی عەمان و هەندێ لە پایتەختەکانی ولاتانی کەنداو کردن، تا لەوێ وەک کالایەکی هەرزان هەراج بکرێن. یان چ جیاوازیەک لە نیوان ئەم هێرشانە و هێرشی لەشکرو پاسدارانی شورشی ئیسلامی ئێران هەیە کە خومەینی فتوای خەزای دەدا و لە کوردستان ژن و پیرە پیاو و مندال و تەنانەت مەلای قورعان بەدەستیشیان سەر دەبری.

ئایا ئەم هەموو درندایەتیە کەم وێنەیەی سوپای عیراق و ئێران لە کوردستاندا دەیبینین هیستریایەکی کاتییە، یان درندایەتییەکی رەسەنە و پشت بە میژوویەکی داپلۆسینەرانەی دوورو درێژ دەبەستێ ؟!.

ئەگەر دوێنێ هەر سێ ئیمپراتوریی داتە پیوەکەی رۆژهەلات بە نیوی ئاینی ئیسلامەوە هەزاران تاوانیان بەرامبەر خەلکی خۆیان و نەتەوەکانیتر کردبێ، ئەوا ئیمرۆ وەچەرەسەکانیان هەمان تاوان، بەلام بە جۆرێکی درندانەتر و بە رێوشوێنیکی مۆدێرانە، دەر هەق بە نەتەوەی کورد دەکەن. هێزی رۆحی و (ئەخلاق)ی خۆشیان، پێش هەموو شتێک، لە میژووی خوێنرێژانەی ئیمپراتۆرەکانیان و لە درێژەپێدانی داگیر کردنی کوردستان وەردەگرن.

ئەم کتیبە شاکارێکی هەلبژاردەیترە کە مامۆستا کەریمی حسامی بە زمانێکی پاراو و رەوان کردوویە بە کوردی. کتیبەکە باس لە قۆناغێکی گرنگی میژووی نەتەوەکەمان دەکات، کە ئەویش سەردەمی میرنشینی ئەردەلان و بابانە، هەروا راگوزەرانە ئاورێک لە میرنشینی سۆران و ناوچەی موکری و یەزیدییەکان دەداتەوە.

نووسەرەکەی (عەبدولقادری رۆستەمی بابان) میژوو نووسێکی نەناسراوە لە سالی ١٢٨٥ی کۆچی (١٨٦٨ی زاینی) ئەم کتیبەی تەواو کردووە. ئەگەر چی کاتی لە دایکبوون و مردنی نووسەر دیار نییە، بەلام بە پێی ئیشارەتێک

که له بەشی حەوتەمی کتیبەکەیدا کردوویەتی پێدەچی له کۆتایی سییەکانی ئەمەنییدا له نووسینی کتیبەکەی بوبیتەوە. بەم پێیە دوور نیە له ساڵی ١٢٤٦ی کۆچی (١٨٢٩ـ ١٨٣٠زایینی) له دایک بوو بێ.

نووسەر گەلێ لایەنی شاردراوەی مێژووی هەر دوو میرنشینی ئەردەلان و بابانمان بۆ دەردەخات. بەو پێیەی خۆی و بنەماڵەکەی له نزیکەوە ئاگاداری رووداوەکان بوون و دەستیان له هەندێ کارو باری سیاسی هەر دوو میرنشیندا هەبووە، توانیویەتی راستگۆیانە چەندان بەسەرهاتی وردو گیرو گرفت و کێشەی میرنشینەکان و پیلان و کارو رەفتاری ناجوامێرانەی هەندێ له میرەکان و شتیترمان بۆ تۆمار بکات و وەک مێژوو نووسێکی شارەزا. بە دوای رووداوەکانی کوردستاندا، گەلێک سەر چاوەی مێژوویی پشکنیوەو لەگەل یەکتریدا بەراوردی کردوون، وەک خۆی نووسیویەتی. تەنیا ئەوانەی هەڵبژاردوون که جێگای باوەرن. ئەمەش شارەزایی و میتۆدی دروستی مێژوونوس دەردەخات. ئیکرای ئەمانە نرخێکی زێدەیان بەم کتیبە بەخشیوە.

بەلاّم ئەوەی جێگای داخە نووسەر کەم تا زۆر ئاوری له ژیانی شارستانی و فیکری و رۆحی ئەو سەردەمەی کوردستان نەداوەتەوە هەروا که باسی یەزیدییەکان دەکات له میتۆدی مێژوونووسانەی خۆی دوور دەکەوێتەوە و شوێن هەندێ بۆختانی ئەنەتیکانە دەکەوێ؛ بەلاّم ئەمانە له نرخی کتیبەکە کەم ناکەنەوە که سەرچاوەیەکی مێژوویی باوەر پێکراوو گەواهێکی زیندوی سەردەمی خۆیەتی.

وەرگێرانی ئەم کتیبە بۆ زمانی کوردی کارێکی یەکجار پر سوودە، بە تایبەتی کاتێ کەسێکی شارەزاو کارامەی وەک کاک کەریم ئەم کارە ئەنجام دەدات کە ئاتای کردنەوەیەکی فراوانی له بواری نووسین و هونەری وەرگێراندا هەیە و تا ئیستا چەندان شاکاری ئەدەبی وەک (دایک)ی ماکسیم

گزرکی و (حەمەچکۆل)ی یەشارکەماڵ و ئازادی یان مەرگ)ی نیکۆس کازانزاکی و گەلی بەرهەمی تری ئەدەبی و کولتوری کردووە بە کوردی.

پیرۆزبایی لە مامۆستا حیسامی دەکەم بۆ ئەم بەرهەمە نوێیەی. هیوای تەمەندرێژی بۆ دەخوازم.

١٩٩٠/٧/٢٧

# پێڕست

باسی حکومەتی شازادە «معتمدالدولە»، سیفەتی چیای هەورامان.

## فەسلی پێنجەم

راپۆرتی کوردستانی بابان، چیرۆکی مەلائەحمەد باوکی سولەیمان پاشا سەرۆکی بنەچەکەی ئەمیرەکانی بابان، باسی دەسەلاتی سولەیمان بەگ بە سەر وڵاتی بابان و بلباسدا، باسی حکومەتی فەرهادبەگی کوری سولەیمان بەگی بابان، باسی حکومەتی بەکربەگ، چوونی بۆ بەغدا و کوشتنی ئەو، دانیشتنی سولیمان پاشا لە جیگای باوکی، باسی حکومەتی مەحمودپاشا هۆی ناونانی قەڵاچوالان، باسی حکومەتی خالیدپاشا، حکومەتی محمدپاشا و یاخی بونی ئەحمەدپاشای برای و ئاکامی ئەوان، باسی حکومەتی سولەیمان پاشا، باسی شەری سولەیمان پاشا لەگەڵ رۆستەم خانی سوپاسالار، کوشتنی سولەیمان پاشا بە دەستی فەقێ برایمی، باسی حکومەتی سەلیم پاشا، باسی حالی محمد پاشا، حکومەتی خانەپاشا، حکومەتی محمدپاشا، حکومەتی مەحمودپاشا حکومەتی برایم پاشا، حکومەتی سولەیمان پاشا، حکومەتی عوسمان پاشا حکومەتی عبدالرحمان پاشا، کوشتنی محمدپاشا لەلایەن عبدلرحمان پاشاوە، شەری عبدلرحمان پاشا لەگەڵ وەزیری بەغدا و گرتنی ئەو شارە، دانانێ عبداللەپاشا بە حاکمی وڵاتی بەغدا لە لایەن عبدلرحمان پاشاوە، کوشتنی سولەیمان پاشا لەلایەن تایفەیەکی عەرەب. شەری عبداللەپاشا لەگەل عبدلرحمان پاشا و شکان و هەلاتنی بۆ ئێران. گەرانەوەی عبدالرحمان پاشا بۆ حکومەتی بابان بە یارمەتی ئێران.

گرتنی بەغدا لەلایەن مەحمودپاشاوە و کوشتنی ئەسعدپاشای والی بەغدا، گرتنی سولەیمانی لەلایەن سولەیمان بەگی برای مەحمودپاشا و هەلاتنی مەحمودپاشا بۆ ئێران- گرتنەوەی سولەیمانی لەلایەن مەحمودپاشا و بریندار بوونی سولەیمان پاشا و راکردنی بۆ ئێران، گرتنەوەی سەر لە نوێی سولەیمانی بەدەستی سولەیمان پاشا بە یارمەتی لەشکری عوسمانی و سەرکەوتنی مەحمود پاشا، وازهێنانی مەحمود پاشا لە حکومەت و سەقامگرتوویی حکومەتی سولەیمان پاشا، باسی حکومەتی ئەحمد پاشا، حکومەتی مەحمود پاشا دوای گەرانەوەی لە ئەستەنبول، حکومەتی ئەحمەد پاشا، هەلاتنی ئەحمەد پاشا بۆ

کوردستانی ئەردەلان و جیگربوونی عەولابەگ لەجێی ئەو، چوونی ئەحمەد پاشا بۆ ئەستەمبول و پاریس و گەرانەوەی بۆ ئەستەمبول و ناکامی کاری ئەو، حکومەتی عبدواللە پاشا لە وڵاتی بابان.

## فەسڵی شەشەم

سەرەتای تێکچوونی ئەمارەتی بابان بە دەستی دەوڵەتی عوسمانی، راپەرینی عەزیز بەگ بۆ ئەستاندنەوەی حکومەتی بابان و ناکامی ئەو

## فەسڵی حەوتەم

کوردستانی موکری و بڵباس، کوشتنی عەباس ئاغا بە فەرمانی عەولاخان.

## فەسڵی هەشتەم

باسی تایفەی کوردەکانی رەواندز، حکومەتی محمد بەگی ناسراوە بە «میرە کوێرە»ی رەواندز. هێرشی میری رەواندز بۆ سەر کوردەکانی داسنی، شەری محمد رەشیدپاشای دەوڵەتی عوسمانی لەگەل محمد پاشا و گرتنی ئەو، دیداری سولتانی عوسمانی لەگەڵ میر محمد پاشای رەواندز، دانانی دوبارەی میرمحمد بە فەرمانرەوای رەواندز و دژایەتی عەلی رەزا پاشای والی بەغدا لەگەڵ ئەو، فەرمانی سولتانی عوسمانی بو ئاشت بونەوەی میر محمد و عەلیرەزا پاشا و سەربادانی میر، گرتنی میرمحمد پاشا و کوشتنی بە فەرمانی سولتانی عوسمانی، باسی حالی تایفەی داسنی.

## فەسڵی نویەم

باسی مزڵ و چوار سنوری کوردستانی ئەردەلان و بابان، باسی مزل و لۆناخەکانی لە سنەوە تا سولەیمانی، سیفەتی گۆلی مەریوان. باسی سنوری سەرو لە چوار سنوری ئەردەڵانەوە تا سنوری موکری، باسی سنووری خواروی ئەردەلان بۆ لای زەهاو. باسی سنووری چوارلای کوردستانی بابان، باسی سنوری خارووی سولەیمانی بۆ لای کەرکوک.

## فەسڵی دەیەم

باسی ڕووداوە جۆربەجۆرەکان و هێندێ نیشان و شوێنەواری عەجایب لە کوردستان. باسی ئەشکەوتی حەسەنی بەسری لە زرنە، باسی تەختی سولەیمان و زیندانی سولەیمان و باسی حەکایەتی بابەگورگور، سیفەتی نیشانە و شوێنەواری ملکی بابان.

## پاشکۆیەکان

پێرستی سولتانی ئالی عوسمانی- کارەساتی کوشتنی کێژی محەمەدڕەزا وەکیلی کوردستان. کانگا و سەرچاوەی وەرگێڕاوی ڕاستکەرەوەی کتێب.

## پێشەکی راستکەرەوە

بە ناوی خوای زانای راز

لە بارەی خەلکی کوردستان و رابردوی ئەوانەوە، بە داخەوە هاونیشتمانانی ئێرانی تەواو شارەزا نین و ئەز لێرە و لەوی مەتلەبێکیش لە لاپەرەی کتێبە مێژوویی‌یەکاندا لە بارەی ئێران و یا ئیمپراتوری عوسمانی و تورکیەی ئێستاوە سەبارەت بە کوردەکان نوسراییّ مێژوونووسانی (سەر بە دەرباری شا) بە کینەو بیّ‌شێل کردنی بیّ‌لایەنیەوە نووسیویانە. ئەوان هەولیان داوە لە کوردستان و خەلکی کورد وێنەیەکی دزێو و ناراست نیشان بدەن. وای لیّ هاتوە کە گەر باسی کورد دەکری، لە زەینی گوێگردا وشە و زاراوەی وەك رێگر، پیاوکوژ ، بیّ کولتور، جیاوازی‌خواز و شتی تر دەچسپیّ. ئەگەر حاکمێك یا کوردێکی نەزان، کارێکی ناحەزی کردبی، دوژمنانی کورد هەولیان داوە ئەمە بکەنە بیانوو، وەك چەك بۆ سەرکوت کردنی هەمو کورد کەلکی لە وەرگرن. ئەو کەم لوتفی و لێو لێبادانە، بوتە هوّی ئەوەی کە زۆر لە کوردەکان لە روژهەلاتی نێوەراستدا خوّ بە بیّ‌بەش و تەنیا بزانن و لە بەرامبەری ئەو بیّ‌دادیەدا، دەست بە شۆرش بکەن و پاشانیش بکەونە بەر پەلاماری بیّ‌بەزەیی زالم و زۆرداران.

مەسعودی مێژوونوسی عەرەب هێندی جار کوردەکان لە رەگەزی جنرکە و شەیتانزادە و هێندی جاریش بە عەرەبیان دادەنی( ۱ )

خاوەنی تاج‌التواریخ بە تورکی، کوردەکان بە تورك و دوعالێکراوی پیغەمبەر (درودی خوای لیّ‌بیّ) دەزانی ( ۲ )

ئەسکەندەر بەگی تورکمان هەر لە بەر سەربادانی ئەسکەندەر سولتانی بانەیی لە بەر دەستی شا عەباسی سەفەوی، کوردەکان بە ناجسن و موناقیق ناودەبات ( ۳ )

بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم بوختانانە، چار نیە کە ئەشی مێژووی راستەقینە پەر پەر هەلدەینەوە و سرنجی خوێنەران بۆ ئەو خالانە رابکیشێن.

لە روانگەی رەگەزییەوە، مسوگەر بوە کە لە پاشماوەی ماد و لە

ڕەگەزی ئارییایین کە هەزاران سالە لە کوردستان نیشتەجێن.

لە باری بیر و باوەڕەوە لە زۆربەی سەردەمە مێژووییەکاندا، کوردەکان خواناس بوون. پاش ئەوەی حەزرەتی محمد(د.خ) بانگی ئیسلامی دا، زۆربەی کوردەکان بە ئارەزووی خۆیان موسڵمان بوون. لەوانە حاکم گەلی بانە، چونکە بە ئارەزووی خۆیان موسڵمان بوون، نازناوی 'ئیختیارالدین'یان پێ درا کە ئێستاش هێندێ لە پاشماوەکانیان هەر بەم ناوە بە ناوبانگن. هێندێ لە کوردەکانیش چونەخزمەت ڕەسولی خوا و ئەسحابەی جەلیل 'چاپان' یەکە لەوان. (۴)

کاتی غەزاکانی ئیسلامی، کوردەکانیش شان بە شانی موسڵمانانیتر بەشداریان کردووە. سالی ۱۳۵۶ لە گوندی غەزاویە لە ناوچەی عەفرین لە سوریە، ڕۆژئاوای حەلەب لە کوردیکی شارەزا بە ناوی 'جەمیل عارف' بیستم کە لە سالە کانی دواییدا عەشیرەتێکی کورد لە ئەسپانیا ناسراوەتەوە کە دەگەنە ۷۰هەزار کەس. ئەوە دەری دەخات کە لە گرتنی 'ئەسپانیا'دا بە فەرماندەری تارق کوری زیاد، کوردیش بەشدار بوون. لە شەڕەکانی خاچدا، ئەگەر کەسێکێ وەك سەلاحالدینی ئەیوبی نەچوویا مەیدان، کەس نەیدەتوانی ئەو فیتنەیە لەبەین بەری. لەبەر ئەوەیە کە هێشتا پاش چەند سەدە، موسڵمانان، بە تایبەت عەرەبی بە ئینساف بە ڕێزەوە ناوی سەلاحالدین دێنن.

سەلاح حاوی نووسەر و شاعیری بە ناوبانگی میسری کە چەند سالە لە ئێران دەژی، کاتێ توشی کوردێك دەبێ ڕێزی لێ دەگری. کاتێ هۆی ئەوەیان لێ پرسی، لە وەلاما گوتی:

سەبارەت بە سەلاحالدین ڕێز لە کوردەکان دەگرم چونکە ئێمە میسرییەکان و عەرەبی موسڵمانی دیکەش هەتا هەتایە قەرزداری پیاوەتی و جوامێری 'سولتان سەلاحالدین'ین.

بۆ قەدرزانی پیاوەتی و خزمەتەکانی سەلاحالدین بە ئیسلام و شارستانەتی جیهان، لە دیواری پەنا مەرقەدی ئەودا لە مزگەوتی امری لە دیمشق ئەم ڕستەیە بەرچاوده دەکەوی:

"قف باحترام أمام مرقد بطل الاسلام العظیم، السلطان صلاحالدین یوسف ابن ایوب شادی ولد رحمهالله فی قلعة تکریت سنه ۵۳۲ ونسبه یتصل ببطن عظیم من بطون الاکراد الروادیه. له المکر السلطان علی

مصر والشام نحو عشرين سنه الى انه توفى بدمشق سنه ٥٨٩ هـ و دفن في قلعتها ثم نقل الى هذه البقعه التى تفتخر بضم تجاليده رحمة الله اجزال ثوابه".

وەرگێڕاوەی: بە ڕێزەوە ڕاوەستە! لە بەردەم مەرقەدی قارەمانی گەورەی ئیسلام صلاحالدین یوسف کوری ئەیوب شادی، خوا لێ‌خۆشبوو سالی ٥٣٢ لە قەلای تکریت لە دایك بوە رەچەلەکی دەچێتەوە سەر یەکێ لە تیرە گەورەکانی عەشیرەتی کوردی "روادی". ئەو بیست سال لەسەر میسر و شامدا حکومەتی کرد. تا سالی ٥٨٩ کۆچی لە دیمشق وەفاتی کرد و لە قەلاکەی بە خاك سپێررا. پاشان گوێزراوە ئەو مەرقەدە کە شانازی پێوەدەکات. رەحمەتی خوای لێ‌بێ و باشترین جەزای بداتەوە.

لە شەری موسلمانانندا لە گەل دراوسی‌کانی ئیمپراتوری عوسمانی، کوردەکان هەمیشە یارمەتی موسلمانانیان داوە. لە شەری یەکەمی دنیاگردا، لە شەری روسەکانی پەلاماردەردا، خەلکێ کوردستان قارەمانەتیان نواندوە و لەو ریگایەدا زیانێکی قورسیان وێ کەوتوە.

## پێوەندی کوردەکان لەگەل ئێرانیەکان

بە درێژایی مێژوو، کوردەکان قەت خۆیان لە ئێرانیەکان جیا نەزانیوە و لە خەم و خۆشی ئەواندا شەریك بوون. لە شەرەکانی ئێران لە گەل رۆم و یونان، کوردەکان هەمیشە وەك قەلای پۆلایێ لە بەرامبەر پەلاماردەراندا وەستاون و زەبری کاریگەریان لەوان داوە. لەوانە شرکردنی دەهەزار سوپای یونانی‌یە لە کاتی گەرانەوەیان لە ئێران کە "گزنفون" مێژوو نووسی یونانی بە درێژی باسی کردوە.

لە پەلاماری مەغولدا بۆ ئێران، لە کوردستان تووشی زیانێکی قورس بوون و نەیانتوانی حاکمێك لە وێ بەجێ بێلن.

بۆ بەرگری لە سنوورەکانی ئێران هەمیشە لە کوردەکان کەلك وەرگێراوە. هەروەکو لە سەردەمی سەفەوی‌یەکاندا، بۆ بەربەرەکانی روسەکان، کواسنەوەی کوردەکانیان بۆ خوراسان بە تاقە ریگا زانی. بۆ ئاگاداری لە گیانبازی کوردەکان بۆ پارێزکاری ئێران دەتوانین لە کتێبی جەنابی "کلیم‌الله توحیدی" بە ناوی "حەرەکەتی مێژوویی کوردەکانی خوراسان" کەلك وەربگرین.

کاتی لەشکرکێشی نادرشا بو هیندوستان، گەلێك لە کوردەکانیش بەشدار بوون.
بە قەولی سەعید نەفیسی خوا لیّ‌خۆشبوو، پینجهەزار کەسیان لە وێ مانەوە. ئێستاش پاشماوەی ئەوان لە ئەفغانستان و پاکستان و هیندوستان ماونەوە. لەم بووارەشدا، بۆ ئاگاداری زیاتر دەکرێ ئاور وە کتێبی ئاغای توحدی بدەن.

## لە مەودای مێژوویی و فەرهەنگیدا.

لەو مەودایەشدا کوردەکان خزمەتیان بە فەرهەنگ و شارستانەتی ئیسلام کردوە.
سهرەوەردی خاوەنی عوارف المعارف، ئیبن ئەسیر خاوەنی تاریخ‌الکامل، دینوری خاوەنی اخبار الطول شارەزوری نووسەری نزهةالارواح، ئیبنی خەلکان دانەری وفیات الاعیان و اخیراً مەحمود عقاد مێژوونووسی بە ناوبانگ، ئیسماعیل پاشای بابان نووسەری ذیل کشف الظنون، حاجی خەلیفە شیخ محمد، عبدەفەقی و زانای بە ناوبانگ و قورعانخوێن شیخ محمد عبدالباسط عبدالصمد، هەمویان کورد بوون.

## کوردەکان و فەرهەنگی ئێران

هەمو کوردەکان لەدەورەی سنوورەکانی ئێستای ئێران، بێجگە لە زمانگەلی عەرەبی و تورکی و کوردی، فارسی‌شیان زانیوە و شوێنەواری شیعر وپەخشانی بە نرخیان بە یادگار هێشتوتەوە. شاعیرە بەرزەکانی کورد وەك ئەحمەدی خانی، مەلای جەزیری لە کوردستانی تورکیا. نالی، مەولەوی، زیوەر، محوی، نودهی، فەقی قادری هەمەوەندی، طاهیر بەگی جاف، شێخ رەزا و هی‌تر لە کوردستانی عێراق، بە فارسیش شیعریان گوتوە و نووسیویانە.
حاجی کاك ئەحمەد لە عارف و فەقی‌یانی بە ناوبانگی کوردستانی عێراق، ۹۹ نووسراوەی لە فیقەدا بە فارسی نووسیوە. تا نیزیکەی چل سال لەمەوبەر لە سولەیمانیّ مەکتەب بۆ ئەوکوردانە هەبوو کە دەیانویست فێری فارسی بن.

## ڕێژیمی شاهنشاهی و کوردەکان

ڕێژیمی رابردو قەت لە گەڵ کوردان ساز نەبوە. قەلاچۆ کردنی کوردەکان لە قەڵای "دمدم" بە قسەی مێژووی "عالم آرای عباسی" لە لایەن قزلباشەکانەوە لە سەردەمی سەفەویدا، جنایەتێکە مێژوو قەت لە بیری ناباتەوە.

بێجگە لەوە کاتێ کە تورکیە و عێراق زللەیەکیان لە کورد دابایە، ڕێژیمی ستەمشاییش مستێکی لێ دەوەشاند. هەر وەکو کاتی دەستدرێژی تورکیا یا عێراق بۆ کوردەکان و هەلگەرانەوەی ئەوان، لەشکری ئێران بۆ سەرکوت کردنی کوردەکان گورج بە یارمەتی ئەوانەوە دەچوو. نمونەکەی ئەوە بوو کە لە ساڵی ۱۹۷۵ راپەرینی خوالێخوشبوو مەلا مستەفا بارزانی تووشی ناکامی کرد و هەزاران کوردی عێراقی دەربەدەر کرد.

پەیمانی سەعدآباد لە زمانی رەزاشا لە نیوان تورکیا و عێراق و ئێران و ئەفغانستان و پەیمان بەغدا لە زمانی حەمەرەزاشادا، لە نێوانی عێراق و ئێران و تورکیا و ئینگلستان، پتر بۆ سەرکوت کردنی کوردەکان بوو. لە هەموانیش بیشەرمتر پەیمانی جزایر بوو بە دەلالی هبومدیەن، لە ساڵی ۱۹۷۵ کە بوو بە هۆی شکانی راپەرینی مەلا مستەفا بارزانی و لە ئەنجامدا عێراق سیاسەتی وڵاتی سووتاوی بەرێوە برد و تائێستا نێزیکەی شەش‌هەزار شار و گوندی کوردستانی عێراق لە لایەن حکومەتی بەعسی‌یەوە لە نەخشەی جۆغرافیا سراوەتەوە. خەلکەکەی یا کوژراون، یا گیراون یا دەربەدەر بوون یا لە شاروچکەی گەمارودراودا کۆ کراونەوە یا بۆ سنوورەکانی ئۆردن و عەرەبستانی سعودی راگوێزراون. با ئەوەش بگوترێ کە تورکیاش لە کوشتار و گواستنەوەی کوردەکاندا دەستی نەگێراوەتەوە.

لێرەدا پێویستە کە دەقی بەشە ئاشکرا کراوەکەی ئەراردادی ۱۴یونی ۱۹۷۵ی زایینی نێوان سەدام و حەمەرەزاشا بخەینە بەر چاوی خوێنەرانی بەرێزەوە.

## دەقی قەراردادی ئەلجەزایر.

ئەلف - سنوورەکانی عەرزی نێوان هەرتك دەوڵەت لەسەر بنچینەی پروتکولی قسطنطنیەی ساڵی ۱۹۱۳ و بەلگەی دیاری کردنی سنووری

١٩١٤ نیشانه بکرێن.
ب - سنوور له شطالعرب‌دا، له سەر بنچینەی هەتی قولی که به گوێرەی رەوشتی نێرنەتەوەیی دابە، دیاری بکرێ.
ج - به درێژایی سنووری هاوبەش، به شێوەی بەردەوام بۆ کوتایی پێهێنانی هەموو چەشنە تێخزانی ئاژاوەچیەتی، به بێ لەبەرچاو گرتنی سەرچاوە و ریشەی ئەو کونترۆڵ و چاوەدیری تەواو به کار بێت.
د - سنووری ئەم دوو وڵاتە ناگۆرێن و سنووری عەرزی و چومەکان هەتا هەتایە له گۆران نایەن.
ه - تعهدنامه و پرۆتکولەکانی پاشکۆی ئەو قەراردادە، دائمین و هەڵنەوەشێنەوە . . .
کورت کراوەتەوە.

پاش ئەوەی له سپتامبری ١٩٨٠دا عێراق کوتووپر ئێرانی پەلاماردا و سەدام حوسین خەیالی گرتنی خوزستان و روخاندنی شۆرشی ئێرانی هەبوو، دەقی قەراردادەکەی دراند و به نەبووی له قەڵەم دا.
ئەوە بوو به کورتی سەبارەت به کوردەکان و ئەوەی له مێژوودا به سەریان هاتوە. بەڵام سەبارەت به کتێبی "سیرالاکراد" ئاگاداری خۆم له ژێرەوە رادەگەیێنم.

## دانەری کتێب

دانەر خۆ به "عبدالقادری کوری رۆستەمی بابانی" ناو دەبات. ئەو له تایفەی بابانی کوردستانی عیراقە. مێژووی لەدایك بوون و مردنی دیار نییه. له نووسراوەکەی وا دەردەکەوێ که لەگەڵ ئەمیرەکانی بابان و ئەردەلان وسوکری پێوەندی هەبوە. دەستی له کاری ئەواندا هەبوە. وەك له دەقی کتێبەکەدا باس دەکات. خزم و کەس و کاریشی له شەر و مەسەلە سیاسیەکانی ئەو دەمی کوردستان‌دا دەستیان هەبوە.
ئەو له مێژوونووسەکانی سەردەمی ئەمانوڵاخانی گەورەی ئەردەلان رەخنه دەگرێ که گۆیا له ترسی زوڵم و توندو تیژی ئەو راستی رووداوەکانی هەموو کوردستانیان نەنووسیوە و تەنیا به راپورتی کوردستانی ئەردەڵان بەسیان کردوە. دانەر ئیدعا دەکات که بۆ نوسینی ئەو کتێبە له دیروکی موعتەبەر کەلکی وەرگرتوە. بەڵام ناویان

نامێنێ. ئەو پیشوازی لە رخنەی بەجێ دەکات. کتێبەکەی لە سەردەمی فەرهاد میرزا "معتمدالدوله" سامی ناصرالدین شادا نووسیوە و پێشکێشی ئەوی کردووە. هەر وەك لە تەعریفی ئەودا دەلێ: "تاخیرەکەی بە کورتی ئەم چەند لاپەرەم لە بارەی رووداوی کوردانەوە نووسیوە و بە دیارییەکی نالایقم زانیوە، تا پێشکێش بە پادشای دادپەروەری بکەم. جێگای بەحەتەوەرییە ئەگەر قبوڵ بکرێ."
بالله التوفیق و علیه التکلان

## چونیەتی کتێبەکە.

نوسخەی خەتی کتێبەکە ۳۱۴ لاپەرەی ۱۵ دێرییە. بەرگەکەی سەوزێکی تاریك بە کاغەزی فەرەنگی و خەتی نەستەعلیق و پێوانەکەی ۱۸.۵ لە ۲۷.۵ و بە ژمارەی ۴۱۳۵ لە کتێبخانەی میللی مەلیکی تاران، سەر بە بارەگای قودسی رەضوی راگیراوە. نووسەرەکەی دیار نییە. وەك لە سەر لاپەرەی یەکەم دەردەکەوێ هی کتێبخانەی محمدحسنخانی صنیع‌الدوله بوە. بەڵام هیچ دیار نیە چۆن کەیوەتە کتێبخانەی مەلیکی.

دانەر، کتێبی "سیرالاکراد"ی لە چەند نوسخەدا نووسیوە. لە سەرەتاوە پاش پێشەکیەکی کورت، ناو و سەرەتای حکومەتی هەمو حاکمەکانی ئەردەلان و بابانی تا سالی ۱۲۸۸ی کۆچی - مانگی نووسیوە و ناوی پاشماوە جیاوازەکانی حاکمگەلی بابانی هێناوە. بە دوای ئەودا لە پێشەکیەکی دیکەدا، کوردەکانی بەکشتی بە ۱۶ تایفە دابەش کردوە و ناوی هیناون و بە درێژی باسی حکومەتی ئەردەلان دەکات. پاشان لەگەل لێکولینەوەی ناوچەی جوغرافیایی، مەودای حکومەتی بابان و رەوەندی موسلمان بوونی کوردەکان و مێژووی حکومەتی بابانەکان باس دەکات. بە دوای ئەودا باسی کوردەکانی موکری و بلباس و کوردی رەواندز و داسنی دەکات. پاشان سنوور و مەودای سنووری کوردستانی ئەردەلان و بابان روون دەکاتەوە و باسی ژمارەیەك ئەشکەوت و شوێنەواری کۆن و ئەفسانەی ئەشکەوتەکان دەکات. پاشکۆیەکیشی هەیە لە بارەی ناوی سولتانگەلی عوسمانی و مێژووی لەدایك بوون و ماوەی حوکمرانی و مێژوو و شوێنی مردنیان لە سەرەتاوە تا ۱۲۷۷ی کۆچی. کتێبەکە بە رووداوی کوشتنی

گومان‌لێکراوی کیژی محمدرەزای وەکیلی کوردستان کۆتایی پێ دێ.
یەکێ لە حاڵەکانی جیگای سرنجی ئەم کتیبە ئەوەیە کە حاکمەکانی کوردستان قەت پێوەندی خۆیان لەگەڵ حکومەتی ناوەندی ئێران نەپچڕاندوە. ئەگەر جارو بار هێندی لەوان پەناشیان بۆ حکومەتی عوسمانی بردبێ، لەبەر سیاسەتی چەوت و کردەوەی ناڵەباری پاشاکان و دارودەستەی ئەوان بوە لە کوردستان. ئەگینا چۆن دەبێ ئێستا ۲۵ میلیون کوردی ئاریایی لەژێر دەسەڵاتی حکومەتگەلی غەیرە ئاریایی دابن.
وا قاوە کە کاتێ دەستەی نێونەتەوەیی دیاری کردنی سنوور پاش شەری یەکەمی دنیاگر لە خەلکی گوندی "چەمپارا" و بانە دەپرسن: کە دەتانەوی لەژێر دەسەلاتی حکومەتی عوسمانی (عیراقی ئێستا) دابن یا هی ئێران؟ لە ولامدا دەلێن باشترە ببێن بە کیسەڵ نەك بەردەستی عوسمانی.. جا وەرە خۆت لێکی بدەوە.
بەیاری خوا راست کردنەوەی کتێبی "سیرالاکراد" نووسین و پاکنووسی پێشەکێکەی بە قەلەمی بەندەی نالایق، محمدرئوفی توکلی، شەوی جومعەی ۱۵ی‌خردادی ۱۳۶۶، هەشتی شەوالی ۱۴۰۷ لەشاری تاران.

## پێشەکی دانەر

## بەشی یەکەم

بسم الله الرّحمٰن الرّحیم
لەو کەسانەی کە ئاگاداری دەنگو باس و ڕیستیاری سەیر و شرێنەواری ڕابردوەکانن، شاراوە نەبێ کە سالەهای سال تایفەکانی کورد لە جیهاندا، داب و ڕەسمێکیان هەبوە و هیچ کەسیش وەدوای نووسینی کار و کردەوەیان نەکەوتوە، مەگەر لە چل پەنجا سال لەمەوپەر، دووکەس لە خەلکی کوردستانی ئەردەلان بە پێچەوانەی شێوەو ڕەسمی مێژوونوسان شتێکی تایبەتیان لە ڕووداوەکانی ولاتی ئەردەلان نووسیوە. فەلبرانە لەترسی سام و هەیبەتی ئەمانولاخانی والی کە لە زەمانی ئەردەلاندا بوە، نەیانتوانیوە ئەوەی ڕاستە بینووسن و تەنیا بە ڕاپورتی کوردستانی ئەردەلان بەسیان کردوە.
بە گشتی کاتێکی ئەم بچووکە بێ ناو و نیشانە هەوای دانان و نووسینی ئەم کتێبە لە سەریدا، تێ کوشا کە ڕوداوەکانی تایفەکانی کورد بە گشتی بنووسێ. لە سایەی خواوە لە سەردەمی نووسینی ئەم نووسراوەیە دا، بێتە و بەرمەیەك لە گوریدا نییە، ئەوەی بە کەیفیەتی باشە و ئەوەی پێ حەراپە پەسندە. ئەوەی ڕاستی ئەحوالی ڕابردوەکانبێ نووسراوە. لە خوێنەرانی ئەم نووسراوەیە، بە تایبەت خەلکی کوردستانی ئەردەلان و بابان کە ئەوانەی تێگەیشتوون، زێدەبییان بەسەر کوردەکانی دیکەدا هەیە، تکا دەکەم کە بە وردی تەماشای بکەن و چاوی بێ دەمارگیری بکەنەوە، ئەوەی حەقیقەتە بیزانن و پە سەندی بکەن ئەگینا بروا بە قسەی نەزانان ناکرێ.
بەتێکرایی بناخەی ئەم نووسینە لەسەر ئاوردانەوە و تەماشای مێژووی نووسراوی کوردەکان نییە. چەند بەشێکم لە مێژووە باوەر پێکراوەکان تەماشا کردوە، لە هەر شوێنێ کە ڕوداوی کوردستان بووە دەرم هێناوە و گرینگیم پێداوە و تا لەگەلیەك بەراوردیانبکەم. فرە هیوادارم کە کەسێك لەڕوی زانینەوە ئیرادی لێ بگرێ و بە دلێ

خوێنەران بێ و بۆ ئەم بچووکەش ببێتە دەرس و لە سایەی ئەوانەوە نەزانی بە زانست بگۆردری. ئە گینا هەر لە رووی غەرەز و هەوای نەفس و دەمارگیری تایبەتی‌یەوە بێجگە لە ریسوا بوونی خۆیان هیچیان وەگیر ناکەوی.

"ئەگەر شەمشەمە کوێرە بە شەو چاوی نەبینی سەرچاوەی رۆژ خەتای چییە" بەتیکرایی ئێستا کە سایەی خوای تەعالا و گرنگی پێدانی شازادەی پایەبەرز. بۆ گشت کوردستان لە دیار و نەدیاری خەلك ئاسوودەیی هەیە، ئەگەر ئاورێك وەسەر ئەو خولامە بچووکە بدا و خزمەتێکی تایبەتی ئەوتۆم پێ بسپێری، بە یارمەتی خوای تەعالا بە باشی ئەنجامی دەدەم. بەلکوو بە لوتفی خوا و سەرنجی خزمەتکارانی ئەو بارەگایە، لەمە زیاتر تووشی بێ بەختی نەبم و بەلای رۆژکار لەمە پتر دەست و دلم لە کار نەگێرێتەوە. لەوپەری پەریشانیدا، بە پەلە ئەم کتێبەم نووسیوە.

**باسی ناوەکانی ولاتی ئەردەلان و حاکمەکانی بابان کە ناویان لەم کتێبەدا هاتوە، بە نشانی هەنحسی لە مێژووی کوچی پیغەمبەرمومیە سلاوی خوای لەسەر بێ.**

سەربەخۆیی سورخاب خان و ئەستاندنەوەی چیای پلنگان لە حاکمەکانی کەلهور سالی ٩٣٠، حکومەتی عەلیخانی کوری سورخاب خان ٩٦٠، حکومەتی هەلوخانی کوری عەلیخان ٩٨٣ ، حکومەتی خان ئەحمەدخان ١٠١٤ ، حکومەتی سولەیمانخانی کوری ئەحمەدخان ١٠٢٤ ، حکومەتی حەسەنخان ١٠٣٦ ، حکومەتی خسروخانی کوری سولەیمانخان ١٠٦٧، حکومەتی خان ئەحمەدخانی ثانی کوری خسروخانی ١٠٨١ ، حکومەتی رەزالولیخانی کوری ئەحمەدخان ١١٠٩، حکومەتی عەباسقولیخان، چەندسانگ دەستەلاتی خانەپاشای بابان و عەلیخانی کوری بەسەر ئەردەلاندا ١١٢٤ ، حکومەتی عەباسقولیخانی دووەم بە فەرمانی نادرشای سوپاسالاری سەفەوی و مردنی ئەو و لەجێ دانیشتنی سوبحانوێردی خان ١١٣٥ ، حکومەی لوتفعەلیخانی مامی خسروخان ١٢٠١ ، حکومەتی حەسنعەلیخانی کوری لوتفعەلیخان ١٢١٠ ، حکومەتی ئەمانولاخانی کوری خسروخان ١٢١٤ ، حکومەتی خسروخانی کوری ئەمانولاخان ١٢٤١ ، حکومەتی

والیە شازادەخانم کیژی فتحعەلیشا، خیزانی خسروخان لە جیاتی ڕەزاقولیخانی کوری ١٢٤٩، حکومەتی رەزاقولیخان ١٢٨٥، کار ڕاپەری میرزا هدایەتاللەی وەزیر بەبێ حاکم ١٢٥٩ ، حکومەتی دووەمی ڕەزاقولیخان، پیشکاری ئامانوالاخان بە وەکیل و چونی میرزا هدایەتالله بۆ ناوچەی ئەسفەندئاوا ١٢٦٠ ، حکومەتی ئەمانولاخانی برابچووکەی رەزاقولیخان و ناسراو بە غولامشاخان و مردنی میرزا هدایەتللەی وەزیر و کوشتنی ئەمانوللەبەگ بە دەستی غولامشا خان ١٢٦٢ ، لابردنی غولامشاخان و هاتنەوەی رەزاقولیخان جارێکی تر بۆ حکومەت. ١٢٦٣، لابردنی رەزاقولیخان و حکومەتی خسروخانی گورجی تفلیسی١٢٦٤، مردنی محمدشا و راکردنی رەزاقولیخان لە بەند و وەدەرنانی خسروخانی کورجی ١٢٦٤، حکومەتی غولامشاخان بە فەرمانی ناسرالدین شا و گرتنی ڕەزاقولیخان و بردنی ئەو بۆ تەورێز سە رەتای ١٢٦٥، حکومەتی نەجەفقولیخان لە وەزارەتی میرزا ابولقاسمی تەفرەشی مسوفیدا ١٢٧٦، حکومەتی دوبارەی والی غولامشاخان ١٢٧٧، وەزارەتی میرزا زەکی مستوفی رەشتی ١٢٨٠، مردنی غولامشاخانی والی و لابردنی میرزا زە کی ١٢٨٤ حکومرانی شازادە فەرهاد میرزا و ئەزمی ئەم ناوچەیە ١٢٨٤ و تا ئێستاش کە سالی ١٢٨٨ە حکومەتی ئەو هەر بەردەوامە.

## باسی ناوی حاکم و پاشایانی بابان و و سالی حکومەتیان بە کوێرەی سالی کوچی.

حکومەتی سولەیمان بەبەی کوری مەلا ئەحمەدی بەسەر هەمو ولاتی بابان و شارەزور و موکری و بلباسدا ٩٧٥، حکومەتی فەرهاد بەگی کوری سولەیمان بەبە ٩٩٧، حکومەتی بەکر بەگی کوری فەرهاد بەگ ١٠١٧، حکومەتی سولەیمان پاشای کوری بەکر بەگ ١٠٢٩، حکومەتی مەحمودپاشای کوری سولەیمان پاشا ١٠٣٧، حکومەتی خالد پاشای کوری مەحمود پاشا ١٠٤٧، حکومەتی محمد پاشای کوری خالدپاشا ١٠٦٧، حکومەتی ئەحمەد پاشای برای محمد پاشا ١٠٦٩، حکومەتی سولەیمان پاشای برازای ئەحمەد پاشا ١٠٧٣، حکومەتی سەلیم پاشای کوری سولەیمان پاشا ١٠٩٤، حکومەتی محمدپاشا ناسراو بە خانەزێرینە ١١١٣، حکومەتی محمود پاشا ١١١٧، حکومەتی خانەپاشا

له بابان و ئەردەڵان ۱۱۲۲، حکومەتی عەلیخانی کوری خانە پاشا ۱۱۳۴، حکومەتی محمد پاشا برای عەلیخان ۱۱۴۴، حکومەتی مەحمود پاشای برازای محمد پاشا ۱۱۵۶، حکومەتی برایم پاشا (مێژووی دیار نییە)، حکومەتی سولەیمان پاشای کوری برایم پاشا ۱۱۹۶، حکومەتی عوسمان پاشای کوری محمد پاشا ۱۲۰۰، حکومەتی عبدالرحمن پاشای برای عوسمان پاشا ۱۲۰۷، حکومەتی مەحمود پاشای کوری عبدالرحمن پاشا ۱۲۳۱، حکومەتی سولەیمان پاشای برا چکولەی مەحمود پاشا ۱۲۵۰، حکومەتی ئەحمەد پاشای کوری سولەیمان پاشا ۱۲۵۲ هاتنەوەی مەحمود پاشا لە ئەستەمبول و حکومەتی ئەو ۱۲۵۶، حکومەتی ئەحمەدپاشای دووەم ۱۲۵۷، حکومەتی عبداللە پاشای برای ئەحمەدپاشا ۱۲۶۰، تێکچوونی دەوڵەتی حاکم‌گەلی بابان بە فەرمانی سولتان عبدالمجیدخان پادشای روم و تێکوشانی محمد نامق پاشا والی عێراق، سەرەتای ۱۲۶۵ و هەتائێستا کە سالی ۱۲۸۸ە، حاکمی عوسمانی لەم وڵاتە حکومەت دەکەن و هەر سال یەکیا ن بۆ حکومەت دیت.

## باسی کورەکانی پادشاگەلی بابان کە ئێستا زیندوون و هەریەك لەم جیهانەدا بە جورێك دەژین.

لە دەلی کتێبەکەدا باسی حوکمرانی و کارەکانی حاکم‌گەلی بابان و بنەچەکەی ئەوانم نووسیوە. ئێستا رەوشتی کاری پاشماوەکانی ئەو تایفەیە دەنووسم. بنەچەکەی ئەوتایفەیە بە گشتی دەچێتەوە سەر عبدالرحمن پاشا. عبدالرحمن پاشا چوار کوری هەبوە. مەحمود پاشا کوری گەورەیان و پاشان عوسمان بەگ لەوی بچووکتر، سولەیمان پاشا و چوارەمینیان حەسەن پاشا بوە. عوسمان بەگ نەگەیوەتە حکومەت. لە سەردەمی حکومەتی مەحمود پاشادا مردوە. دوو کوری لە پاش بەجێ ماون حەمەمین بەگ و حوسین بەگ.

چونیەتی کاری حەمەمین بەگ و کوشتنی ئەو لە شەری سولەیمانێمدا نووسیوە.

حوسین بەگ ئێستا لە دەوروبەری بەغدا حاکمی چەند ناوچەی بچووکە. حەسەن پاشاش لە حکومەتی مەحمود پاشادا کۆچی دوایی کرد. منالی لە پاش بەجێ نەمان. بەڵام مەحمود پاشا چوار کور و

کیژێکی هەبوە. عبدالرحمن بەگ، عەلی پاشا، حەمەساڵح بەگ، عەولا بەگ و حلیمەخاتوون. پێش دە - دوازدە ساڵ حەمە ساڵح بەگ لە ئەستەمبول مرد. عەولابەگیش لە شاری قونیە(٥) کۆچی دوایی کرد. عەلی پاشا کچەزای کەلبەلیخانی ئەیلی لە تاران مرد. عبدالرحمن بەگ ئێستا لە شاری بەغدا لە نێو جەیشی عوسمانی دایە. حلیمەخاتونیش لە بەغدا وەفاتی کرد. بێجگە لە عەلی پاشا کە دوو کور و کیژێکی لە پاش بەجێ ماون، ئەوانیتر منالیان نەبوو. حوسێن بەگ ناسراوە بە 'میر'، لە سنە دانیشتوە و لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە موچە و بەراتی هەیە.

کورەکەی تری محمد بەگ لە تارانە و ئەویش لە ئێران مەعاش وەردەگری. کیژەکەشی لە بیجار دادەنیشی. بەڵام سولەیمان پاشا شەش کوری هەبوو. لە هەموویان گەورەتر حاجی ئەحمد پاشا بوو. پاش ئەوەی کە لە سولەیمانی وەدەریان نا، سێ چوار ساڵ لە ئەستەنبول و فەرانسە ژیا. پاشان کرا بە حاکمی یەمەن، چاردە ساڵ لەوێ بوو. دوایە چووە ئەستەنبول. ساڵێکیش کرا بە حاکمی 'وان' و دیسانیش بانگ کرایەوە نازناوی 'موشیری'پێ درا کە پلەوپایەیەکی بەرزە. دوو ساڵیش لە عەرزەروم بوو. ئێستا لە شاری قوستەنتەنیە دەژی. بیستوومە ئەمساڵ چوتە مەجلیسی شورا. برابچوکی ئەو عەولاپاشایە. براکەی تریان محمد بەگ، ئەویش بە هەوای حکومەتی بابان سەری هەڵینا و بە ئاوات نەگەیشت. ئێستا لە کەربەلا حاکمە. برایەکەی تریان حوسێن بەگ لە بە غدا دەژی. مانگی سی تمەنی مەعاشە. دوو کوری دیکەی سولەیمان پاشا، حەسەن بەگ و فەتاح بەگ لە ئەستەمبول بوون و بیستوومە مردوون.

## پێشەکی دانەر بەشی ٢

بە نێوی خوای رەحمان و رەحیم. حەمد و سەنا بۆ خوا و سڵاو لە رەسولی خوا و ئال وبەیتی.

بەدوای ئەوەدا نووسەر عبدالقادر کوری رۆستەم بابانی وا دەڵێ: لەو سەردەمەدا کە لە سایەی ناسرالدین شای قاجار خوا پشتی لەشکرەکەی بگری، ئێران بوتە بەهەشت وەك زەمانی نوشیرەوان و بەتایبەت لەبەر تیشکی دادی شازادە فەرهاد میرزا، باشترین رۆلەی وەلیعەهدی

نامدار عەبباس‌میرزا. داب و ڕەسمی پێشو لە وڵاتی کوردان نەماوە و دنیا داب و ڕەسمێکی دیکەی نوێ هەیە. دەست درێژی و زوڵمی قەدیم و کوشتاری ئەو تایفە کوتایی پێ‌هات. جا بۆیە ئەم عەبدە گومنامەش هەوای نیشتمان و دیتنی خزم و قەومانی لە سەر دا. لەبەر دەست تەنگی و نەبوونی دەرمەتانی ڕۆیشتنم بۆ ئەولا نیە. هەمیشە لە خوای تەعالا دەپاڕێمەوە، کە دەرمەتانی سەفەر و هەرەکەتم بو، پێك بێنی و شتێکم بکاتە دەست کە لە خزمەت حەزرەتی واڵا بمناسێنی. ئاخرەکەی بە کورتی ئەوچەند بەشەم لە بارەی ڕووداوی کوردەکان نووسی و وەك دیاری‌یەکی نالایق پێشکێشی شازادەی دادپەروەرم کرد، جێگای بەختەوەرییە ئەگەر بە دڵی بێ و قبوڵی بکات. بە هیوای خوا.

# فەسڵی یەکەم

لە خوێنەران شاراوە نەبێ نووسینی ئەو کتێبە ڕۆژی پازدەی شەعبانی ساڵی هەزار و دووسەدو هەشتاوپێنجی کۆچی ڕێکەوتی هەزار و سەد و شەست و هەشتی زایینی، ڕێکەوتی حەوتسەد و هەشتاو نۆی جەلالی، ڕێکەوتی ئیلانئیلی تورکی(٦) دەست پێکراوە و لە ماوەی دو مانگدا تەواو بوە و ناونراوە "سیرالاکراد"

مەبەست لە نووسینی ئەم نووسراوەیە ئەوەیە کە بە کورتی هێندی لە حاڵ و کردەوەی تایفەکانی کورد و داب و شوێنیان لە جیهاندا و پەیدا بوونی ئایین و میللیەتیان لە هەموو دەور و زەمانێکدا باس بکرێ و تا ئەم ڕۆژەی کە بێنەرەکان ئاگایان لە بار و دۆخی ئەوان هەبی.

## باسی ژمارەی چینی کوردەکان

بزانە کە کوردەکان بە گشتی دوازدە دەستەن. عەرزی ئەوان لە نێزیك موسڵەوە تا نیزیك عمان و لە دیاربەکری ڕۆم تا چوار فەرسەخی هەمەدانە. حاکمەکانی ئەوان بەسەر ئەومندەدا حکوومەتیان کردوە. ناو و چونیەتی حاڵی ئەو تایفەیە بەم جۆرەیە کەدەنووسری. باسی سەرەتا و بنەتای رۆژگاریان بە درێژی ئیشەڵا دەنوسرێ.

## باسی ناوی تایفەی کوردەکان.

گەورەترین وڵاتی ئەو تەبەقەیە کوردستانی ئەردەڵان و کوردستانی بابانە کە هەردوکیان بە ناوی کەسێك ناونراون کە لەوی دانەری داب و رەسمی حکومەت و سیاسەت بوون. پاش ئەو دوو تایفەیە کوردستانی موکری و تایفەی "بلباسە" حاکمەکانی شنۆ، هەکاری "مەرگەوەر" و "برادۆست" پاشاکانی وان، بەگزادەکانی جزیر و پاشاکانی موسڵ، پاشایانی ڕواندز، گوندەکانی داسنی شەیتانپەرەست لە چیای ژەنگار، بەگزادەکانی زەعاو، ئەمیرەکانی کەلهور، ئەمیرگەلی گۆران لە ماهی‌دەشت، خانەکانی سەقز، دانیشتوەکانی دەوروبەری نەهاوەند و خورەماوای فەیلی کە ئێستا شوێنی سەروکایەتی لورەکانە، لە وانەش پتر

هێندی لە تایفەکانیان لە رەی و لە خوزستان و لە مازەندەران بە گوێرەی هەلکەوتی زەمانە نیشتەجێ بوون. بە گوێرەی زانیاری خۆم باسیان دەکەم.

## باسی دەستەی یەکەمی کوردەکان کە پێیان ئێژن کوردستانی ئەردەلان.

درێژایی ئەم وڵاتە لە بوکانی موکری تا سنووری گەرمەسێری زەهاو چل و حەوت فەرسەخە(٧) پانایی ئەو لە کرێوەی چەقان کە پالی وە شارەزور داوە، تا چیای ئالەقلاغی هەمەدان ٤٢ فەرسەخە. لەم بەینەدا نێزیکەی هەزار و سێ سەد گوند و شارێك و شاروچکەیەك هەیە. بنەچەکەی حاکمەکانیان دەگاتەوە ئەحمەدی کوری مەروان. یەکەم کەسێك لەو بنەمالەیە ئالای سەربەخویی هەلکرد ئاشەوانێك بوو بە ناوی خسرو کە بە یارمەتی ئەبوومو‌سلیمی مەروزی لە زەمانی سفاح ئەبوالعباس ئەحمەدی عەباسی بە سەر کوردستاندا زال بوو. بەم هویەوە ئەو تایفە بە بەنیئەردەلان ناویانگیان رویشتوە. لە سەرەتای سەربەخۆیانەوە تا ئیستا شوێنی سەروکایەتیان لە چوار جیگا بوە. یەکەم لەلای "زلم" کە لە خاکی شارەزوورە و ئیشەلا بەم زوانە باسی دەکری. شوێنەواری بنەوبارەگایان تا ئێستاش ماوەتەوە. پاش وێرانی ئەوی، لە چیای پلنگان کە ئێستاش سەربە خۆیانە. ئەویش چیایەکی زرە رژد و سەختە و رێگای تێپەربوونی لە رادەبەدەر دژوارە. چەند ساڵان جیگای حکومەتی ئەمیرەکانی کەلهور بوە. ئاخرەکەی بە گوێرەی نووسراوەی مێژوویی حاکمی ئەردەلان ئەو تایفەیەی پەلامار داوە، وەدەری ناون و خۆی لەوی نشتەجێ بوە.

پاش ماوەیەك لە چیای پلنگانەوە گواستیانەوە بۆ چیای حەسەناوا، ماوەیەکیش لەوی دانیشتن، پاشان ساڵی هەزار و چل و شەشی مانگی لە یەك فەرسەخی چیای ناوبراو گوندی سینەیان کردە ناوەندی حکومەتی خۆیان، تا ئێستاش لە وی دادەنیشن، ئێستا شارێکی لە رادەبەدەر جوانە، خاوەنی خانوبەرەی بەردە، خەلکی ئەم شارە بەلکو گشت کوردستانی ئەردەلان، بە ئەدەب و ناسك و مێهرەبان و شیرنزمانن. لە چێشتی بە چێژو چلی پاك و خاوێن بە سەر کوردەکانی دیکەیاندا هەیە. لەگەل خەلکی بیانی خۆش رەفتارن و

ئەوەندەی بویان بکری بە خۆشی رادەبوێرن. لە گەڵ ئەوەش کاتی شەر لە سوار چاکی و ئازایەتیش‌دا بێ بەهرەنین. لەم تایفەیە ئەمیری خاوەن شیر و وەزیری دلپاك هەلکەوتوە. هەروەك لەم کتێبەدا باسی هێندیکیان دەکرێ.

## باسی ئایین و مەزەبی کوردستانی ئەردەڵان پێش هاتنی ئیسلام

کوردستانی ئەردەڵان یەك میللەت نەبوون زەردەشتی و لەلەو دەستەی بوت‌پەرستیشیان هەبوە. کاتی هاتنی ئەسکەندەری فیلقوس بۆ شارەزوور و مەجبور کردنی ئەو تایفەیە بە بوت پەرستی، لای رۆژئاوای کوردستانی ئەردەڵان کە لە دوو لاوە بە شارەزوورەوە نووساوە، بوون بە بوت پەرست. خەلکی رۆژهەلات و سەرەوەی ئەم ولاتە بە تەواوی زەردەشتی بوون. لە هیچ دەور و زەمانێك‌دا. تا پەید ابوونی ئیسلام ئەو دوو دەستەیە ئایینی خۆیان نەگوری. لای خواروی کوردستانی ناوبراو، ماوەیەك بوت‌پەرەست بوون. پاشان هاتنە سەر دینی عیسا. لە دوایە بە تێکوشانی سوپاسالاری ئێران بوونەوە زەردەشتی، حکایەتەکەش ئاوابوە:

کاتیك لە زەمانی خەلیفەی دووەم عومەری کوری خەتاب عێراقی عەرەب گیرا، یەزدگردی شای عەجەم جیگای پێ لێژ بوو، لە مەداین باری کرد و روی کردەعێراقی عەجەم. کە گەیشتە دەور و بەری کرماشان دەیویست پارمەتی لە کوردەکان بخوازێ. سوپاسالاری لەشکری خوێ بە ناوی "باو" کوری شاپور کوری کیوسی کوری قوبادی کەباوکی ئەنوشیرەوانی دادپەروەربوە، لە گەڵ پێنج هەزار سوار نارد بۆ دلخۆشی دانەوە و راکێشانی ئەوان. لە پێش‌دا "باو" رووی کردە شارەزوور. وەسەر چیا بەرزەکان کەوت، لێرەوارە و چر وپرە رزەکانی بری و لە پەنا چەمی سیروان بارگە و بنەی بە عەرزی دادا. پاشان بە دەستکیسی قاسید و ناردنی نامە، ئەوسی شارەزوری بانگ کرد، کە ئەودەم سەبارەت بە زۆری خەلك و پالەوانی زۆر بە سەر کوردەکانیان‌دا هەبوو، تا سە ر بو شاهاشای ئێران دابنوێنن. ئەوانی بە چاکە و بە دم شیرن کردن رازی کرد ئەو تایفەیە فەرمانی سەرداری لەشکری ئێرانیان قبول کرد. بە ناردنی تفاق و ئازوقە دلی "باو"یان شاد کرد.

پاشان خەریکی ئامادەکردنی چەك و کەل وپەلی شەر بوون. لەو سەر و بەندەدا کە پادشای ئێران بەرەو خوراسان دەچوو ئەو هەواڵەی پێگەیشت. بە بیستنی ئەو خەبەرە گەلێك پەریشان بوو. زانی کە دەولەتی عەجەم لەروخاندایە. کەوتە بیری حالی خۆی. نامە و تەتەرێکی بۆ کوردەکانی شارەزوور نارد و لە نامەکەدا نووسیبووی:

شاهنشای عەجەم بۆ یارمەتی خاقانی چین و سنووردارێ خوراسان 'ماهوری سوری' کە لە پەروەردەکانی دەولەتی ئێرانە، بۆ روژهەلات دەچی. ئێستا واباشە کە ئێوە لە جێگا و نیشتمانی خۆتان بە ئاسوودەیی دانیشن تا ئەوکاتە کە شەهریاری عەجەم لە روژهەلاتەوە بۆ لای مێرالی عەرەب دەگەرێتەوە. کاتێکی پێویست بیٚ دیسان ئێوە بۆ یارمەتی بانگ دەکا. هێندیٚ شتی بە نرخ و نایابیشی بە دیاری بۆ پیاوانی ئەوی نارد. خۆشی دەستبەجیٚ قوناخێك لە پەنای چەمی ناوبراو گەرایەوە دوایە. چیا و لێرەوارێکی گەورەی چاو پیٚ کەوت. گوندێکی گەورەی لە بناری چیا دیت. بەرەو ئەو شوێنە رویشت. بارگە و بنەی لە نێو لێرەوار و پەنا ئەو گوندەی بە عەرزی دادا. ئازوقەو تفاقی لەشکری ئامادەکرد و لەگەل چەند کەس لە گەورەپیاوانی گوندی چوە بارەگای 'باو' لە دەست تەنگی و نەبوونی جێگا عوزریان هێناوە. فەرماندەی ئێران ئەوانی باش لاواندەوە و داوای لیٚکردن کە لەگەل پاشا پەیمان ببەستن و بێنە سەر ئایینی زەردەشتی. گەورەو بچوکیان فەرمانی ئەویان قبول کرد و ئاورگەیان درست کردن 'باو'یش لە سەر کێو عیبادەتخانەیەکی دروست کرد. ئەوەندە لە وی ماوە تا عیبادەتخانەکە تەواو بوو، ناوی نرا 'ئاورگە' پاشان گوندەکەشی بە ناوی خۆی کرد و بە باو ناسرا. هەتا ئێستاش هەر بەم ناوەدەناسریٚ. ئاشکرایە کە 'باوەیە' کوردەکان وای بە کار دێنن.

'باو' پاش دوو مانگان باری کرد بە هەموی کوردستاندا تیٚپەری. بە گوێرەی توانا هەلکی بە کەرمی پاشا هیوادار کرد. تا پاش مانگێك لە شاری هەمەدان سەری وەدەرنا. لە وێشەوە چوە ئیسفەهان و گەیشتە خزمەت پادشای عەجەم. زوری هەول دا کە لە سەفەری خوراسانی پەشیمانی کاتەوە، فایدەی نەبوو. چونکە پێشتر 'باو' لە گەل 'ماهوی سوری' نێوان ناخۆشیان ببوو. ئاخرەکەی قسەکانی لای یەزدگرد کاریان نەکرد، تیری لەزا ولەدەر وە نیشانەکەوت و روژگاریش چاوە

نواری بینو و بەهانەنەبوو.
ماوەیەکی پێ چوو کە بانگەوازی ئیسلام لە خوزستان و کوردستان و هەمەدان دەنگی دایەوە. پاشا لە ئیسفەهانیش توانای بەربەرەکانی نەما. لە ڕێگای یەزدەوە بەرەو خوراسان کەوتە ڕێ. "باو" لەگەل پاشا نەچوو و گەڕاوە مازندەران کە نیشتگەی ئەسلی ئەو بوو. لەوێ دروشمی هێربدی هە لگرت و ماوەیەك لە مالی خۆی حەسایەوە. تا ئەوکاتە کە لە مێژوودا گوتراوە، یەزدگردی شەهریار لە خوزستان کوژرا و کارو باری ئێران لە برەو کەوت.
ولات و شاری عەجەم لە بەرابەر لەشکری عەرەبدا بێ سەتال مایەوە. پاشان "باو" بە تکا و ویستی خەلك پاشایەتی ئەوی قبول کرد. هەر وەك چیروکی حالی ئەو لە دیروکدا، بەتایبەت لە دیروکی مازەندەراندا کە هەموو باسی پاشاکەلی "باوەندیە" تۆمار کراوە. ئەم بەسەرهاتە سالی سی و یەکی کۆچی، کاتی خەلافەتی عوسمان کوری عەفان رووی داوە. هەر لەو سالەشدا یەزدگردی شەهریار بە فەرمانی "ماهوی سوری" لە خوزستان بە دەستی ئاشەوانێك کوژرا. لەبەر ئەوەی مەبەستی ئێمە راپورتی حالی کوردستانە، زمان و قەلەم لە بیرهێنانەوەی ئەو راگرت. مەگەر لە کاتی خۆیدا ناوی بێنین.

# فەسڵی دووەم

باسی کە پشتنی بانگەوازی ئیسلام بە کوردستان و هاتنی سوارەی عەرەب بۆ وڵاتی کوردان و شەڕی نێوان کورد و عەرەب و سەرکەوتنی عەرەبەکان.

ساڵی ١٨ی کۆچی ئیمام حەسەنی کوڕی عەلی مورتوزا و عەولای کوڕی عومەر و ئەبی عوبیدەی ئەنسار و سوارەی تری عەرەب، بە فەرمانی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب بۆ گرتنی ئێران وەری کەوتن. لە میرالی عەرەب تێپەڕین و گەیشتنە دەوروبەری کرماشان. جەنابی ئیمام حەسەن و خەلیفەی یەمانی و تەمەشی کوڕی عەبباس کوڕی عبدالمطلب بۆ گرتنی هەمەدان و ڕەی و سازمندەران بە لەشکرێکی ئامادە لە سوار و پیادە بەرەو مەقسەد کەوتنە ڕێ. بەڵام عەولای عومەر و ئەبی عوبەیدەی ئەنسار لەگەل پێنج هەزار سوار بۆ گرتنی شارەزوور ڕویشتن. لە سەر چەمی سیروان دابەزین. لە پێش‌دا بە هۆی نامە و تەتەر ئەو تایفەیان بۆ ئیسلام بانگ کرد. ئەوان قبوڵیان نەکرد و ئاخرەکەی بوو بە شەر.

عەولا و ئەبی عوبیدە شەۆ لە چەمی سیروان پەڕینەو و لەوبەری چەم بارگەو بنەیان بە عەرزیدا دا. ڕوژی دوایە کوردەکان لە هاتنی ئەوان ئاگادار بوون. بە دەهەزار سوارەوە هاتنە سەریان‌شەر دەستی پێکرد و لە بەیانی‌یەوە تا ڕوژئاوایە شەر بلێسەی دەدا. لەم ناوەدا ئەبی‌عوبیدەی ئەنساری شەهید بوو.

شەو دوو لەشکر لێك جیا بوونەوە. لەم شەڕەدا عەولای عومەر و گەورەپیاوانی عەرەب ئازایەتیان نواند. لەشکری کوردان لە کزی دا. شەو هێندی لەوان بڵاوەیان کرد بەیانی لەشکری عەرەب پاشماوەکانیان پەلامار دا و لە هێرشی هەوەلی‌دا ڕایان کرد. پالەوانانی عەرەب وەدوایان کەوتن و سوارەو ئەسپیان وەسەرێك دەگێڕا. دیهات و نیشتەگەکانیان گرت. سێ شەو و ڕوژان دەستیان لە کوشتار نەگێڕاوە. هاواری ژن و منداڵان بۆ عاسمان دەچوو. بە زوری یان بە خوشی سەریان بۆ ئیسلام شۆڕ کرد. پاشان بە فەرمانی عەولای عومەر

لەشکری عەرەب دەستی لە تالآن و کوشتاری کوردەکان هەلگرت. پاشماوەکانی ئەو م بەزەلیلی و سەرشۆڕی لە خزمەت عەولا لە کردەوەی خۆیان پەشیمان بوونەوە داوای لێبووردنیان کرد. بە قبول کردنی ئیسلام ئەمانیان درایە. پاشان مەینی ئمبی عوبیدەیان لە بناری چیاکەی شارەزوور ناشت و خانویان لەسەر دروست کرد.

نوسەری ئەم دێرانە زۆرجار چۆتە زیارەتی ئەو. ئێستاش شوێنی دانیشتنی ساداتی حوسینی و شێخە کوردەکانی شارەزوورە.

بە کورتی عەولای عومەر بوتخانەکانی روخاند و لە جێگای ئەوان مزگەوت و میحرابی دانا. فێری یاسا و شەریعەتی محمدی کردن و بۆ ئیسلام فرە پل و پای کرد. پاش دوو مانگ بو گرتنی 'پاوە' کە باسمان کرد لە شارەزوورەوە کەوتە رێ. لە چەمی ناوبراو پەڕیوە و رۆژی دووەم لە لێرەوار سەری وەدەرنا. لە ناخافل کوردەکانی پەلاماردا و شەر دەستی پێ کرد. خەلکی پاوەش پیاوانە وەخۆ کەوتن. لە بەیانێوە تا رۆژئاوا بەربەرەکانیان کرد. شەو کە شەر وەستا لەشکری عەرەب لەپەنای لێرەوارە وەرکەوتن. خەلکی پاوەش خەندەکیان لە دەوری شار هەلکەند و لە سەربانان مەتەرێزیان ساز کرد. گاشەبەردیان لە سەرڕێگای عارەبان دانا و رێگایان لێ گرت.

بەیانی کە لەشکری عەرەب بۆ شەر ئامادە بوون، ئەوهەمو خەندەك و مەتەرێز و گاشەبەردەیان دیت، زۆر ترسان. پێیان وابوو لە غەیبەوە یارمەتیان بۆ هاتوە. ئەگینا بە شەوێك ساز کردنی ئەو هەمو مەتەرێز و خەندەکە دژوار بوو. عەولا و گەورە پیاوانی عەرەب زۆریان هەول دا کە بە خۆشی راویان بکەن. بۆیان نەکرا. بێجگە لە توندی و بەردمباران، وەلآمی دیکەیان وەر نەگرتەوە. فەرماندەی عەرەب توورە بوو. ئەمری کرد لەشکر لە ئەسپان دابەزن بە پێیان سەتال هەلگرن و لە خەندەکان وەپەڕن. هەر چەندی بەرد و تیریان بە سەردا باراندن، نەگەرانەوە. پالەوانانی عەرەب وە نێو شار کەوتن و دەستیان بە کوشتار کرد. خەلکی پاوەش دەستیان لە گیان شوشت و پێنجسەد کەسیان لە عەرەبان کوشت. بۆخوشیان ئەلآچۆ کران. لافاوی خوێن لە قەدپالی کێو وەك چۆم هەستا. هەمویان کوژران. ژن و منداڵیان بە نەسیب سوپای عەرەب بوو.

بە کورتی پاش وێران کردنی خانوان و کوشتاری خەلك ئاورگەی

"پاوە" شیان وێران کرد. هێندێ لە لەشکری عەرەب کە ئەو شوێنەیان بە دڵ بوو، هەر لە وێ نیشتەجێ بوون. مزگەوتێکی گەورەیان دروست کرد. عەولای عومەر بە دەستی خۆی کوڵەکەکانی چەقاند. بەندە بە چاوی خۆی ئەوەی بینیوە و لە بینا پتەو و قایمەکانی ئەو ولایەتیە. خەڵکی وێ ئەوەی بە کەراسەتی عولای عومەر دەزانن. تا ئێستا ئەو کولەکانە لە گەندەڵی و کرمی بوون پارێزراون.

پاشان عەولا یەکێ لە کورەکانی مەعازی کوری جەبەلی لە پاوە دانا و خۆشی بۆ گرتنی بەشەکانی دیکەی کوردستان کەوتە رێ. کوری مەعازی جەبەل لەگەڵ هێندی لەو عەرەبانە کە لە پاوە مانەوە، ژنی کوژراوەکانیان داگیر کرد ومنداڵی زۆریان لێ وەپاش خستن و لە دەوروبەریش پێوەندی خزمایەتیان پەیدا کرد و کەم کەم ئیسلام لە و چیاو و لێرە وارە بلاو بووە و تائێستاش خەڵکی پاوە و دەوروبەری بنەچەکەی خۆیان دەبەنەوە سەر مەعازی کوری جەبەل و عەرەبەکانی تر کە لەوێ نیشتەجێ بوون.

بە کورتی عەولای عومەر لە ماوە یەکی کورتدا بە سەر دەشت و چیای کوردستاندا زاڵ بوو. لە گوند و ئاواییەکان مزگەوت و خانەقای دروست کرد و لەوێشەوە بۆ گرتنی هەمەدان و نەهاوەند و بروجرد کەوتە رێ. چونکی مەبەستی ئێمە راپورتی کوردستانە ئیتر باسی ئەوانیتر ناکەین.

# فەسڵی سێیەم

## دامەزرانی ئەمارەتی ئەردەڵان

لە هەموو دەور و زەمانێکدا، وڵاتی کوردستان گەورە و کەیخودایەکی هەبوە. بە شێوەی جۆر بەجۆر لە دنیادا ژیاون. تا لە سەرتای دەوڵەتی سفاحی عەبباسی، هەر هەمان خوسرەو ناو بە حوکمی ئەبوموسلیمی بە سەر ئەم وڵاتەدا زاڵ بوو دابی حکومەت و سیاسەتی دامەزراند. پاشانیش ڕۆژ بە ڕۆژ ئەولاد و نەوەی پێ گەیشتن، تا ساڵی نوسەدوسیی کۆچی سورخاب خان ناوێك لە وان، قەڵای پلنگانی لە حاکمەکانی کەلهور ئەستاند و لە وی شارێکی دروست کرد و نێزیکەی سی ساڵ بە سەربەخۆیی ڕایبوارد و پاشان مرد و عەلیخانی کوری لە جیی دانیشت. ئەویش بیست وسی ساڵ حکومەتی کرد و ساڵی ۹۸۳ کۆچی دوایی کرد.

## حکومەتی هەڵۆخان

هەڵۆخان کورەگەورەی ئەو، ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکرد و ئەوەندە هێز بوو کە شائیسماعیلی سانی کوری تەهماسبی بە هیچ دەزانی.

شائیسماعیل-یش لە خۆی ڕانەدی ئەم کردەوە سەزا بدا. هەڵۆخان ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر دەبوو. تا نێزیك هەمەدان و کرماشانی خستبوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

پاش مردنی شائیسماعیلی سانی و هاتنە سەرتەختی سوڵتان محەمەدی برای، کاری هەڵوخانی برەوی پەیدا کرد. ساڵی ۹۹۹ی کۆچی کە ساڵی مردن یا وەلانانی سوڵتان محەمەد و هاتنەسەر تەختی شا عەبباسی کوری بوو، پاشایەتی ئێران بوژایەوە. لەشکرێکی پەرداخ بوو لێدانی هەڵۆخان ئامادەکرا و بە مەقسود گەیشتن و گەڕانەوە.

جاری تر کە لەشکری ئامادەتر لە پێشو مەعمور کرا. لە سنووری کوردستان کەوتنە بەر شیری هەڵۆخان و بە پەرژ و بڵاوی ڕایان کرد و

گەرانەوە. ئەم کارەساتە گرانی خستە سەر دڵی پاشای ئێران. و کەوتە بیری روخاندنی رۆژگاری هەڵۆخان. بە نهێنی لە گەڵ ئەحمەدخان کە لاوێکی وێچو و ئازا بوو پێوەندی گرت و خوشکی خۆی دایە. لە رواڵەتدا نامە و خەلاتێشی بۆ هەڵۆخان ناردە قەڵای پلنگان. لە نامەکەدا هەمو لوتفی شایانەی نواندبوو، هەروەها داوای چاوپێکەوتنی کردبوو.

هەڵۆخان وەك پێویست بوو تەتەری لاواندەوە و چاکەی لە گەڵ کرد. لە پارچە و شتی کوردستان ئەوەی شایەنی ئەو بوو داییە. شتی بەلیمەت و عەنتیکەی وەك ئەسپی عەرەبی و چنراوی کوردی بۆ شاعەبباس نارد. سەبارەت بە پیری و بێ تاقەتی لە چون داوای لێبووردنی کرد.

پیاوی شاعەبباس لە گەرانەوەدا باسی توانا و جەلالەتی هەڵۆخانیان بۆ گێراوە. پاشا جارێکی دیکەش هەر بەو کابرایەدا نامەیەکی دیکەی بۆ نارد. لە نامەکەدا بۆی نووسی: چونکە لەبەر پیری ناتوانی بێی، کورەگەورەکەی خان ئەحمەدخان کە شایەنی لوتفی پاشایە بۆ بارەگای بنیرێ. پاش گەیشتنی نامە هەڵۆخان لەگەل گەورەپیاوانی وڵات ئەگبیری کرد. بێجگە لە ناردنی کوری چارەیەکی تر نەبوو. بە داب و دەزگایەکی رازاوە بۆ بارەگای شای نارد. کاتی خەبەری هاتنی خان ئەحمەد بە پاشا گەیشت گەورە گەورەکانی دەوڵەتی بۆ پێشوازی نارد لەو پەری مەزنەتی و شکۆدا هێنایانە شاری و کەوتە بەر لوتف و میهرەبانی شا. خان ئەحمەدخان پیاوێکی شێرین پەیڤ و خۆش ئەخلاق و ئازا بوو. لە بواری کوشتنی بەبر و شێر و سوارچاکی لە خزمەت شا هونەری نواند. رۆژ بە رۆژ لای شای پلە و پایەی دەچوە سەری و دەکەوتە بەر کەرەمی پاشا. وای لێ هات کە بەگم خاتوونی خوشکی شای کە بە کلاو ئالتون ناسرابوو، لێ مارە بکرێ. نێزیکەی دوو ساڵ لە خزمەت پاشای ئێران مایەوە. ئاخرەکەی گەورەپیاوانی بارەگا وایان بە باش زانی کە فەرمانی حکومەتی کوردستان بە ناوی خان ئەحمەد خان بنوسن.

باسی گەرانەوەی خان ئەحمەد خان بۆ کوردستان و

## ڕوونکردنەوەی حاڵاتی ئەو

خان ئەحمەدخان بە خەڵات و نیشانەوە گەڕایەوە بۆ کوردستان لە ڕێوە چووە لای باوکی و کەرەم و لوتفی شاعەبباسی بۆ باس کرد. هەرچەند هەڵۆخان هەمووی بە مەکر و فێڵ و درۆ دەزانی، بەڵام لەبەر خاتری کوڕەکەی خۆشی خۆی نیشاندا. چەند شەو و ڕۆژ شایی و زەماوەندی گێڕا و خەڵکی نان‌دا. گەورەپیاوانی کوردی بۆ شایی بانگ کرد و فەقیر و هەژاری نان دا و دیاری ئەسپ و جل و بەرگی دا بە ڕیش‌چەرموك و گەورەپیاوان.

پاش شایی و زەماوەند کەوتە بیری نەزم و ڕێك و پێکی کاری ڕەعیەت و لەشکر. بەڵام خان ئەحمەد خان ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەستی لە کار و باری وڵات وەردەدا و بە گوێرەی فەرمانی شاعەبباس دەیویست باوکی لە کاری سیاسەت دووربخاتەوە و خۆی حکومەت بگرێتە دەست. بە دزی کاربەدەست و گەورە پیاوانی وڵاتی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. هەڵۆخان هەستی بەو کارە کرد و لە لاوە کوڕەکەی لەم خەیالە ئاگا کردەوە. بەلاتاو تێی‌گەیاند کە دە ست لەو کارە هەڵگری. بەڵام فایدەی نەبوو. ئاخرەکەی لە شوێنێك بەندی کرد. چەند ڕۆژێك چاوی بە باوکی نەکەوت. تەواو شپرزە بوو. تکاکاری ناردن و لێی خۆشبوو. دووبارە ئاشتی کردەوە و ئەمری کرد کە بێجگە لە کاری شەراب و ڕاو، خان ئەحمەد خان خۆی دە هیچی تر نەکێنێ.

بەڵام خان ئەحمەدخان هەمیشە لەگەڵ گەورەپیاوانی وڵات بە مەیل و موحیبەت دەژیا. خەڵکی بە خەڵات و دیاری دەلاواندەوە، بە جۆرێك کە خەڵك ڕووی تێدەکرد و خۆشیان دەویست.

لەولاشەو هەڵۆخان بە فێز و لوت بەرزی دەژیا و توند و تیژی دەکرد و بە چاوی سووك تەماشای گەورەپیاوانی دەکرد. خەڵك لێی نارازی بوون، تا لە نەکاو لە باوکی ڕاپەڕی و دەستی پێ لە کاری حکومەت هەلگرت لە جێیەکی خۆش دایناو خواردەمەنی و جێ و بانی باشی بۆ ئامادەکرد و خۆی حکومەتی گرتە دەست. نامە و پێشکێشی بۆ شای نارد و لە کردەوەی خۆی ئاگاداری کرد. شا عەبباس فرە شاد و کەیف‌خۆش بوو. ئەسپێکی بە زین و بەرگی جەواهیربەند و شیری جەوهەردار و جلی زێڕ درووی بە خەڵات بۆ نارد. تەتەرەکەشی بە ئەسپ و لیباس خەڵات کرد و هێندی ئالتوون و پارەشی بۆ خەرشکی

نارد

بە کورتی خان ئەحمەدخان ماوەی سێ ساڵ هەر ئاوای رابوارد و هەر سێ مانگ جارێك دەچوە لای بابی و لە کردەوەی خۆی پەشیمان دەبووە بە عوزرهێنانەوە دڵی باوکی رادەگرت. بەڵام هەڵۆخان لە ئەنجامی کار و تێکچوونی دەوڵەت بە دەستی عەجەم، خەمبار بوو. هەمیشە دە یگوت: ئەی روڵە من ئەوەندە دڵم بە حکومەت کردنەوە نییە دیارە میراتی باوك بە کور دەگات. بەڵام زۆر دەترسم کە تۆ پەردە لەسەر کاری کوردان لابدەی و دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێران بە سەر ئەم مولك و وڵاتەدا بسەپێنی. ئەنجامی ئەم کارە لە شەرمزەیی بەدەر شتێکی تر نییە.

چەند مانگێکی پێ نەچو، هەڵۆخان تووشی نەخۆشی مەرگ بوو و لە جێدا کەوت. کاتێك زانی هەڵناستێتەوە، کورەکانی خۆی لەگەڵ گەورەپیاوانی وڵات بانگ کرد. هەمویان هاتنە بن سەری. چاوی هەڵینا و بە خان ئەحمەد خانی گوت: ئێستا من دەمرم، چەند وەسیەتێکم بۆ تۆ هەیە. دەبێ لەو قسانە تێ‌نەپەری. یەکەم ئەوەیە کە رێز و حورمەتی دین رابگریّ و لەگەڵ خزم و کەس و کارت چاکە بکەی. وریا بە ئەوکەسەی واز لە خزم و کەس دینێ بە مراد ناگات. چاوەدێری خزم و کەس و کارت بە واجب بزانە. ئەو خەڵکەی کوردستان وەك کراسی ئێمەن چاك و خراپ، نهێن و ئاشکرا لایەنگری تۆن. ئەگەر بە هەڵکەوت دوورویی لە وان سەری هەڵدا لێیان مەگرە، چونکە کاتی هاتنی بەڵا لە بەخشینی گیان و مالیان درێغی ناکەن. رۆڵە زۆرجار گوتوومە، رێگای لەشکری ئێران مەدەو هەمیشە بە بەخشینی ماڵ دڵی پاشا رابگرە و بە گوێرەی توانای خوت راستێی لەگەڵ بلێ. ئەوەی گوت و تەواو بوو. ئەو رووداوە سالی ۱۰۱۴کۆچی قەوما.

هەڵۆخان پیاوێکی ژیر و خاوەن را و سەخی و خۆش گوفتار بوو. بەڵام لە ئاخری حکومەتیدا تووشی فێز و لوتبەرزی بوو. بۆ تاوانێکی کەم سەزای دیاری دەکرد. خەڵك لێی دور کەوتبوونەوە و دڵیان رەنجابوو. لە سەر دینی ئیسلام و ئایینی سوننی پێداگر بوو. لەگەڵ جەماعەتی شیعە دەمارگیری هەبوو. رێگای نەدەدان پێ دە مولکی ئەو بنێن. کاتێك کە بیستی خان ئەحمەد خان خوشکی پادشای هێناوە و کومەڵێك قزلباشی لە گەڵ هاتوون، گوتی: "انا لله و انا الیه راجعون"

چونکە زوری پیێ ناچێت کە بانگی رافزی لە کوردستان بڵاو دەبێتەوە.
خان ئەحمەدخان بە داب و رەسمی پاشایان باوکی بە خاك سپارد.
چوار مانگ تازیەی بۆ راگرت. پلنگان لەبەر هاتنی گەورەپیاوانی دونیا وەك شاری گەورەی لیێ هاتبوو. هەموو رۆژیێ بە گوێرەی دابی مەشیرەتی نان و خوانی دەدا بە هەتیو و فەقیران. لە لایەن شا عەبباسەوە تەتەرێك بە خەڵاتی گران نیمەتەوە گەیشتە لای خان ئەحمەد خان و بۆ کورەکانی دیکەشی.
پاشان خان ئەحمەد خان لە سەر تەختی حکومەت دانیشت.
سەرتای سالی ١٠١٥ بارەگای حکومەتی لە قەڵای پلنگانەوە بۆ چیای حەسەناوا گواستەوە کە ئێستا فەرسەخێك لە شاری سنە دوورە.
جێگایەکی بەرزمو بەسەر دەشتی گاوردا دەروانی و دوو ئاوی بە ویدا هێناون. خان ئەحمەد خان بە تێکوشانێکی زۆر ئەو شوێنەی ئاوەدان کردەوە و بە ناوی کوری خۆی کرد. کە ناوی حەسەن خان بوو و لە "تاریخ الاکراد"دا باسی کراوە.
کاتیێ کە پاشایانی بابان حکومەتیان لەق ببوو، خان ئەحمەد خان هێندی وڵاتی ئەوانی پەلامار داو و پالە و جوتیاری ئەو تایفەی بۆ ئاوەدان کردنەوەی قەڵای حە سەناوا دەهێنا. تا چیای ناوبراو وای لیێ هات بۆ دانیشتن بییێ. نێزیکەی دوو هەزار ماڵ لە ویێ نشتەجیێ بوون.
وەك بلێن پاش چوار ساڵ خان ئەحمەد خان تووشی شەراب خواردنەوە و رابواردن بوو لەگەل جوانچاکانی لەش و لار زێوین. بەگم خاتوونی ژنی ناسراو بە کلاو ئالتون ئەوەی بیستەوە و و نامەیەکی بۆ شای نووسی. خۆشی لەگەل لاوێك بەناوی یوسف کە لە جوانچاکیدا بە ناوبانگ بوو، دەستی تێکەل کرد و لە فرسەتدا دەیبردە کن خۆی. ئەم لاوە یەکیێ لە گورانیبێژانی مەجلیسی خان بوو و جارجارە لە دیوی ژووریێ ئامادە دەبوو.
وردەوردەچیروکی دڵداری بەگم خان لەگەل یوسف گەیشتە نێو خەلك و لە کوچە و کولانان دەنگی دایەوە. ئاخرەکەی خانیش بیستیەوە. یوسف خۆشی چەند گورانی بە ناوی کلاوئالتون بلاو کردەوە. لە بەر بیێ عەقلی و ئاگری ئەڤین جار و بار لە کن دوستەکانیشی دەیگوت.
شەوێکیان لە سەرخۆشیدا لەکن خان ئەحمەدخان شیعرەکانی

خوێندەوە. بە دەنگێك كە بیسەرەكان واقیان ورما. ئەحمەدخان شك و گومانی لیّ وە راستی گەرا. هەرچەند شەیدای جوانی و هەستان و دانیشتنی یوسف بوو. بەلام پاسداری دەزگای پاشایەتی چاوی خوشەویستی دروو. نێوە شەو ئەمری كرد هەر ئەودەم لە داری بدەن و تەرمەكشیان لە نێو چینی دیواردا شاردەوە.

رۆژی دوایی كلاوتالتون لە كردەوەی میر ئاگادار بوو. فرە خەمبار بوو، بەلاّم لەترسی ریسوایی دەنگی نەكرد. رۆژ بە رۆژ لەگەل خان نێوانی ناخۆشتر دەبوو. كاتێك ویستی میردەكەی دەرماندراو بكا یەك لە لەرمواشەكان پێی‌زانی و دایكی خانی ئاگادار كرد. پاشان زۆر بە وریایی و لەسەر هەست دەژیا، نەیدە هێشت تخون خواردن و خواردنەوە بكەوی.

شاعەبباس بەو كارەی زانی و خوشكی بۆ پی‌تەخت بانگ كردەوە . خان ئەحمەدخان بە دەزگا و دەبدەبە بەرێی كردەوە. بە كورتی خان ئەحمەدخان ٢٨سال بە سەر كوردستاندا "حكومەتی كرد و چونیەتی كاری ئەو لە "تاریخ الاكراد"دا نووسراوە. لە سەرەمەرگی‌دا سولەیمان خانی كوری لەجێی خۆی دانا و كۆچی دوایی كرد.

## باسی حوكمرانی سولەیمانخانی كوری خان ئەحمەد خان.

لە ئاخری سالی ١٠٤٤ سولەیمان خان بوو بە حوكمرانی گشتی ولاّتی كوردستان. بەگوێرەی داب و رەسمی باب و باپیرانی برەوی بە كار و باری ولاّتدا. ئەو لاوێكی فرە دلێر و جوامێر و شەركەر بوو. كاتی خۆی بە راوی پلنگ و حەیوانی درندە رادەبوارد. كەمتر وەدوای هەرزەكاری و رابواردن دەكەوت. لەگەل خەلكی بێگانە فرە خۆشرەفتار و ڕووخۆش بوو. لە سالی دوومی حوكمرانی‌دا گوندی سنەی كردە پی‌تەخت كە ئێستا شارێكی گەورە و جێگای سەروكایەتی ولاّتی ئەردەلاّنە. شاری سنە لە سالی ١٠٤٦ی كۆچی دانراوە. شاعیرەكانی ئەو دەم مێژووی ئەو شارەیان بە "غمہا" داناوە. شوێنەوار و بنا و بنایەتەكانی ئەو شارە، ئێستەلاّ لەكاتی خۆیدا دەنووسرین.

سالی ١٠٤٧ سولەیمان‌خان سەبارەت هاوسێیەتی و پێكەوە نووسانی سنوور لەگەل خالیدخانی حاكمی بابان كێشەی لیّ پەیدا بوو و كار كەوتە شەر. لە سەحرای مەریوان لە رۆخی بەحر لە بەرامبەری

یەك ڕاوەستان. لە هەرتك لا خەڵكێكی زۆر كوژرا. ئاخرەكەی خالدپاشا سەركەوت و سولەیمان‌خان بەرەو سنە و چیای حەسەناوا ڕای كرد. هێندی لە خاكی كوردستانی ئەردەلان وەگیر بابان كەوت.
بە كورتی سولەیمان‌خان پاش بیست ساڵ حكومەت كۆچی دوایی كرد و حەسەن‌خانی برای بوو بە حوكمرانی وڵات.

## باسی حكومەتی حەسەنخانی كوری خان ئەحمەدخان.

ساڵی ١٠٦٥حەسەنخان لەسەر تەختی حوكمرانی دانیشت. شوێنەوارێكی وای لە پاش بەجیّ نەما كە بەكاری نووسین بێت. تەنیا ئاوەدانی شاری سنەی تۆزێك زیاتر كرد. پاش چوار ساڵ كوت و پڕ كۆچی دوایی كرد. لەپلنگان تەرمەكەیان بە خاك ئەسپارد. گەورەپیاوانی كوردستان خسروخانی كوری سولەیمانخانیان كرد بە حاكم.

## باسی حكومەتی خسروخانی كوری سولەیمانخان

پاش مردنی مامی، خسروخان بوو بە میراتگری مولكی بابی. ئەو پیاوێكی هێندی و لەسەرخۆ بوو. بۆ ئاوەدانی شاری سنە تەواو تێدەكۆشا. لەسەر تەپولكەیەكی نێو شار بارەگایەكی حكومەتی دروست كرد كە لە پەناكانی قایم و پتەوە. حاكم‌گەلی ئەردەڵان هەریەكەی شتێكیان لیّ زیاد كردوە. بە گشتی بەقەد هەشتاهەزار تمەن، ئالتونی لیّ خەرج كراوە. ئێستا گوندی سینە بوتە شارێكی گەورە و بە سنە ناوبانگی كردوە كە دەبێتە سنندج. ئێستا كە ساڵی ١٢٨٥ە نێزیكەی پێنج‌هەزار ماڵ لەو شارەدا دەژین، كەلێك باخ و خانوبەرەی بەرزی هەیەبە گشتی خسروخان لەگەڵ رەعیەت و لەشكری وڵات ڕەفتارێكی باشی هەبوو. هەمیشە بە ناردنی دیاری باش و بەنرخ دلی شا عەبباسی دووەم پاشای ئێرانی ڕادەگرت. شازدەساڵ لەوپەری سەربەخۆییدا حكومەتی كرد و پاشان ئەمری خوای بەجیّ‌هێنا و مولكی بۆ خان‌ئەحمەدخانی دووەمی كوری خۆی بەجیّ هێشت.

## باسی حكومەتی خان ئەحمەدخانی كوری خسروخان.

خان ئەحمەدخان ساڵی ١٠٨١ لەسەر كورسی حوكمرانی دانیشت. پیاوێكی جوامێر و سەخی‌تەبع بوو. دەستی لە نووسینی شێعر و

بەخشاندا هەبوو. بە بەخشینی ماڵ و شت، چاك و خەراپی رازی کردبوو. نامە و دیاری و پێشکێشی بۆ شاس ولەیمانی سەفەوی نارد. شەیتان و شوڤاری بارەگا بە دلیان نەبرو و تەتەریان بەدیارییەوە ناردەوە.

خان ئەحمەدخان بە ناچاری لەگەڵ دەولەتی عوسمانی رێك کەوت. لەگەڵ سولەیمانپاشای بابان بوو بە یەك و لە شای ئیران یاخی بوو و تا نێزیك هەمەدان و کرماشانی خستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

گەورەپیاوانی بارەگای شاسولەیمانی سەفەوی، وایان بە باش زانی کە بەبێ شەر و کێشە دلی خانئەحمەدخان بدەنەوە و نێوانی لەگەڵ دەولەتی عوسمانی تێك بدەن. پاشان سولەیمانپاشای بابان سەرکوت بکەن. چونکە لێدانی هەرتکیان دژوار بوو. بە شیوەی جۆر بە جۆر خەلات و دیاری و فەرمانیان بۆ خانئەحمەدخان نارد. بە حوکمی ئەوە "مروف عەبدی چاکەیە" لەگەڵ دەولەتی عەجەم ئاشتیان کردەوە. سولەیمانپاشای بابان لەو کارەی ئەو نارەحەت بوو، لەگەڵ دووهەزار سوار رووی کردەسنووری ئەردەلان. دێهات و ناوچەی ئەردەلانی خستە ژێر دەسەلات. لەولاشەوە خانئەحمەدخان بە شەشهەزار سوار و پیادەوە بۆ پێشوازی شەر چوو.

لە پەنا گۆلی مەریوان شەر ساز بوو. قارەمانانی بابان وەك روستەمی داستان و سامی نەریمان لەشکری ئەردەلانیان پەلاماردا. ئالا هەلگریان بە ئالاوە خستە سەر زەوی و لەشکری لەبەر یەك بلاو بوو، مەیدانیان بەجێ هێشت. خانئەحمەدخان کە وەك پلنگ وابوو ماوەیەك خۆی راگرت و پاشان ئەویش رای کرد و بەرەو ولاتی خۆی رێگای داگرت. لەشکری بابان وەدوایان کەوتن. خانئەحمەدخان تا پەنا شاری سنە لە هیچ کوێ خۆی نەگرت. لەشکر کەوتە نێوشار. لەنێوشار بوو بە شین و شەپور. چونکە زۆر کەس لە گەورەپیاوان کوژراو و بریندار ببوون. لەولاشەوە سولەیمانپاشا بە سەرکەوتن و بە ئالانێکی زۆرەوە بەرەو ولاتی خۆی گەرایەوە. چەند حاکم و پیاوی خۆی لەسەر چەند ناوچەی کوردستان دانا. نووسەر ئیشەلا لە کاتی باسکردنی شەری رۆستەمخانی سوپاسالاری شاسولەیمانی سەفەوی لەگەڵ سولەیمانپاشای بابان لە کاتی راپورتی کوردستانی باباندا بە درێژی دەینووسم.

ئێستا بچینە سەر چیروکی ئەردەلان. پاش ئەم کارەساتە،

خان‌ئه‌حمه‌دخان پاشماوه‌کانی قه‌ومی به به‌خشینی مال و دیاری زۆر شاد کرد. به یارمه‌تی رۆسته‌مخانی سوپاسالار، خاکی داگیرکراوی ئه‌ستانده‌وه که له جێی خۆیدا باسی ده‌کری. ماوه‌ی بیست و هه‌شت ساڵ له‌سه‌ر هه‌مو وڵاتی کوردستاندا حوکمرانی کرد. له سه‌ره‌مه‌رگدا، وڵاتی به ره‌زاقولیخانی کوره‌گه‌وره‌ی ئه‌سپارد و بۆ خۆی بۆی ده‌رچوو.

ره‌زاقولیخان ساڵی ۱۱۰۹ی کۆچی بوو به حاکمی کوردستان. ئه‌و لاوێکی جوامێر و زمانزان بوو. گه‌وره و بچووکی وڵاتی له خۆی رازی کردبوو. به ناردنی دیاری و پێشکێش دڵی گه‌وره‌پیاوانی باره‌گای شاسولتان‌حوسێنی سه‌فه‌وی راگتبوو. کاتیّ له‌باره‌ی مولك و وڵاته‌وه ئاسوده و دلنیا بوو، ده‌ستی کرد به رابواردن. مه‌جلیسی هه‌میشه به کچی جوان و چاوکاڵ ده‌کرد به به‌هه‌شتی به‌رین. شه‌و و رۆژ له‌گه‌ل شه‌راب و ژنی به‌ژن و باڵا جوان رای ده‌بوارد. پاش چارده‌سال به نه‌خوشی ماخولیایی (شێتی) بۆی ده‌رچوو.

عه‌باس‌قولیخان یه‌کێك له ئامۆزاکانی بوو به حاکم. ئه‌ویش هونه‌رێکی نه‌بوو. ئاته‌بایی که‌وته وڵات. خانه‌پاشای کوری محمدپاشای بابان بۆ گرتنی ئه‌رده‌ڵان به له‌شکرێکی به‌رداخه‌وه به‌ره‌و سنووری مه‌ریوان که‌وته‌ری. چونکه به‌ربه‌ره‌کانی نه‌کرا، به خێرایی تا پێنج فه‌رسه‌خی شاری سنه هات. گه‌وره‌پیاوانی کوردستان بۆ پارێزکاری ماڵ و سامانی خۆیان که‌وتنه به‌ر فه‌رمانی خانه‌پاشای بابان. سه‌ید و زانا و شێخ چوونه پێشوازی و به ده‌زگاو ده‌بده‌به هێنایانه نێو شار.

## باسی حکومه‌تی خانه‌پاشای بابان له کوردستانی ئه‌رده‌ڵان.

ساڵی ۱۱۲۴ی کۆچی خانه‌پاشا بوو به ئه‌میر و حوکمرانی کوردستانی ئه‌رده‌ڵان. له‌سنووری که‌رکوکه‌وه تا پێنج فه‌رسه‌خی مه‌ریوان که‌وته ژێر ده‌سه‌لاتی ئه‌و. سروفێکی ئازا و ره‌شید و سه‌خی بوو. گه‌وره‌پیاوانی وڵاتی به به‌خشش و چاکه دلخۆشی دایه‌وه. دادپه‌روه‌ری په‌ره پێدا و دڵی گه‌وره‌و بچوکی رازی ده‌کرد. خه‌ڵك له‌سه‌رده‌می حکومه‌تی ئه‌ودا حه‌سابوونه‌وه. سه‌باره‌ت به شێرزه‌یی بار و دۆخی سه‌فه‌وی و ده‌وڵه‌تی ئێران و ده‌سه‌لاتی ئه‌فغانه‌کان، که‌س نه‌بوو ده‌ستی وه‌به‌ر بێنی. ناوبراو به ئیراده و شێلگیری حکومه‌تی ده‌کرد. گه‌ڵاله‌ی خانوبه‌ره و بنای دارشت. مزگه‌وت و مه‌دره‌سه‌ی له‌و شاره دروست

کرد و چوار ساڵ لە سنە مایەوە.

لەبەر ئەوەی ترسی لە ئەحمەدپاشای حاکمی بەغدا هەبوو، نەیتوانی بمێنێتەوە. عە لیخانی کوری کرد بە حاکم. خۆشی بۆ وڵاتی بابان گەڕایەوە. تەگبیری کار و باری ئەم وڵاتەی بە باپیرەگەورەی نووسەر ئەسپارد.

عەلیخان سەرەرای هەرزەکاری و تەمەنی کەم ئەت وەدوای رابواردن و کاری ناحەز نەکەوت. ژیانی خۆی لەگەل زانا و شاعیران دەبردە سەر. لەو سەردەمەدا شێخ ئەحمەدی مەردوخی خاوەنی زانستی ئەستێرە ناسی بوو. عەلیخان لای ئەو فێری زانستی ئەستێرناسی (اسطرلاب) بوو. گەورەپیاوانی وڵات لە کار و کردەوەی جوامێرانەی ئەو گەلێك شاد بوون. دە ساڵ بەم جۆرە تێپەری. تاساڵی ۱۱۳۴ی کۆچی ناوبانگی توانا و دەسەلاتی نادرشای ئەفشار کە سوپاساڵاری شا تەهماسبی سەفەوی بوو گەیشتە وڵات. لەولاشەوە خانەپاشای باوکی عەلیخان کۆچی دوایی کرد. عەلیخان لە ترسی دەسەڵاتی بێگانە بە سەر وڵاتی باباندا، خۆی گەڕایەوە. شاعەبباسی سەفەوی بە راوێژی سوپاساڵار، عەباس‌قولیخانی ئەردەڵاتی ناردە کوردستان. چرای بوونی ئەردەڵان دیسان گەشایەوە. بەڵام عەباس‌قولیخان زۆر نەژیا و رووی کردە دنیای دیکە. سوبحانوێردی خانی کوری لەجێی ئەو بوو بە حاکم.

## هاتنە سەر حوکمی سوبحانوێردیخان لە شاری سنەی کوردستانی ئەردەڵان.

سوبحانوێردیخان ساڵی ۱۱۳۵ی کۆچی بوو بە حوکمرانی ئەردەڵان. پیاوێکی عابد و بەدین بوو. بەگوێرەی یاسای کوردی و خێڵەکی دەبزووتەوە. بەڵام بۆ پەرەپێدانی شاری سنە و ئاوەدانی بارەگای حکومەت‌هەولی نەدا. چوار ساڵ پاش هاتنە سەرحوکمی ئەو نادرشای ئەفشار پاش کوشتنی توپاڵ عوسمان پاشای فەرماندەری دەوڵەتی عوسمانی لە پەنا کەرکوك بۆ شاری سنە گەڕایەوە. لە کۆشکی روو بە شیمالی نێزیکەی بارەگای ئەوی کە نێزیکەی بیست گەز درێژ و دوازدە گەز بەرین بوو، دابەزی بە سوبحانوێردی خانی گوت: "کۆشکی تۆ زۆر گەورەیە. لایەکی بۆ من بی و لایەکەی دیکەشی بۆ تۆ" لەم کاتەدا ماوەیەك بە سەر ئەم رووداوەدا تێپەریوە، بناخەی ئەم کۆشکە

ده یا نو گەزی هەر ماوە. لە نەخش و نیگاری دیواری شکاو و روخاوی شوێنەواری هەجەم دەدیتری.

سوبحانوێردیخان پاش هەشت سال حکومەت ئەمری خوای بەجێ هینا. خانئەحمەدخانی برازای لە جێی ئەو دانیشت. یازدە سال حوکمرانی کرد و مرد. حکومەتی کوردستان وەك میرات بۆ خسروخانی کوری بە جیٚما.

## باسی حکومەتی خسروخانی کوری خانئەحمەدخان.

سالی ١١٥٠ لەسەر کورسی حوکمرانی دانیشت. پیاوێکی دەرویش سیفەت و ئەخلاق باش و سەخی و جوامێر بوو. ئێژن لە هەمو تەمەنیدا کراسی زیادی نەبووئەگەر بە هەلکەوت جلێکی باش و بەنرخیان بۆ هێنابایە هەر دەست بەجێ دەیبەخشی بە نۆکەرەکانی کوردستان. لە نێو کوردەکانما بە "خاندەروێش" ناونرابوو.

لە سەرتای حوکمرانیدا دەسەلاتی مولك و مالی دا بە برایمبەگی وەکیل کە لە شوێنی خۆی باسی دەکری. سالێك بە سەر حکومەتی ئەودا تێپەری بوو برایم بەگ بە دەستی رێگران کوژرا. حەمە رەشیدبەگ لە جێگای بابی دانیشت. بەلام لەبەر هۆیەك لە هۆیەکان لەگەل خسروخان نێوانی تێکچوو. بە ناچاری لەگەل عێل و عەشیرەتی خۆی روی کردە لورستان و ماوەیەك لە نێو تایفەی فەیلیدا بە نهێنی دەژیا.

تایفەی فەیلی بە "ترشمال" ناویان دەبرد، وایان دەزانی کە کەیخودای هێلە. شێوەی ژیان و بەریچوونیشی هەر وەك ژیانی مەردار و هێلەکیان بوو. ماوەی سال و نێویك هەر بەم شێوەیە لە نێو لورەکاندا مایەوە. لەم ژیانە فرە جارز و نارەحەت بوو. چاوەروان بوو نەجاتی بێ. لەو سەر و بەندەدا خەبەری کوشتنی نادرشای ئەفشار بلاو بووە. بە حوکمی حەمەرەشیدبەگ، دار و دەستەکەی کە زوربەیان لە جلی پەشم و کەپنکی دابوون، لەپر بە جل و بەرگی رازاوە و بە چەك و نفاقی پەرداخەوە لەنێو رەشمالەکان هاتنە دەر و سیٚسەد سواری چەکدار لە خزمەت وەکیل راوەستان. لورەکان کە ئەوەیان بینی ترسان و لە یەکێکیان پرسی: "ترشمال" ئەو دەزگا و دەبدەبەی لە کوێ هێناوە؟ کابرا لە ولامدا گوتی ئەو "ترشمال" نییە، ئەوە حەمەرەشیدبەگی وەکیلە

که تا ئێستا نەتان ناسیوە.
سەرۆکانی لوڕ سەریان سوڕما و لە وە بە پەرۆش بوون کە بە چاوی سوکیان چاو لێ کردوە. ئاخرەکەی هەموو خان و توشمالی لوڕ بە دیاری و پێشکێشەوە چوونە لای وەکیل و لەوەی کە نەیان ناسیوە، داوای لێبوردنیان کرد. ناوبرار بە گوێرەی شانی هەرکەس چاکەی لەگەل کردن.
رۆژی دیکە لەگەل ۳۰۰ سوارەی خۆی و هێندی ئازایانی لوڕ، بەرەو کوردستان کەوتنە رێ. کاتێك گەیشتنە دەوروبەری "سەحنە و کەنگاوەر" خەبەری زانی کە ئەلاقولیخانی زەنگەنە هەوای پاشایەتی لەسەر دایە و بە لەشکرەوە بۆ گرتنی ئەردەلأن و دەرپەراندنی خسروخان خۆی ئامادە کردوە. لە بیستنی ئەو هەواڵە فرە شاد بوو. لە رێگا وەپەلەکەوت و لەنێزیك ئوردووی ئەلاقولیخان پرسیاری حالی وی کرد. گوتیان حەمەرەشیدبەگی وەکیلە و دچیتە سەر خسروخان.
ئەلاقولیخان ئەوەی بە فالی باش و بە شانسی خۆی زانی. کوری خۆی بە پێشوازەوە نارد. بە رێز و حورمەت هێنایە نێو ئوردوی خۆی. هەرتکیان بۆ گرتنی کوردستان هاودەست بوون هاتن تا گەیشتنە سنووری کولیایی. خسروخان لە هاتنی ئەوان ئاگادار بوو. لەشکری ئەردەلأنی کۆ کردەوە و بۆ بەرگری کەوتە رێ.
لە سنووری کوردستان و خاکی کولیائی هەرتك لەشکر گەیشتنە یەك. لە هەردوولاوە شەر دەست پێکرا. لەم ناوەدا، تیرێك وە ئەلاقولیخان کەوت و کوشتی کاتی لەشکر سەرداری خۆیان بە کوژراوی دیت خۆیان پێ را نەگیراو هەلاتن. هەرچەند حەمەرەشیدبەگ بە بەریاندا گەراو هانی دان کە خۆیگرن، فایدەی نەبوو. ناچار، ئەویش بە دوایاند. لەشکری خسروخان کەوتنە دوویان. خەلکێکی زۆر کوژراو بەدیل گیرا. بە هەلکەوت ئەسپی وەکیل سەرسمی دا و وەکیل کەوتە هەرزی. گەیشتنە سەری و گرتیان و هێنایانە لای خسروخان.
هەموکەس پیێی وابوو کە دەست لە جێ دەیکوژێ. بەلأم بە پێچەوانە کاتێ وەکیل لە دوورەوە دەرکەرت خسروخان هەستا و چەند هەنگاوێك بە پێریەوە چوو و لە پەنا خۆی دانا. دەگێرنەوە دەلێن گوتی: "وەکیل ئەوچاوە کە تۆ نەبینی گوێرە بێ" پاشان ئەمری کرد ئەو تالأنەی لەوان گیرا بوو، هەمویان وێ دانەوە بێجگە لەوە پێنجهەزار تمەنێشی بە خەلأت

دابە. کاتی رویشتنی خانوویەرەی وی ویران کردبوو، ئەمری کرد بۆی چاپکەنەوە و لە ماوەی شەش مانگ ئاوەدانیان کردەوە. پاشان خسروخان هاتە ماڵەکەی ئەو. چاریان کێشا و خەڵك کۆ بوونەوە. سەرلەنوێ وەکیلی کردەوە پێشکار و بەرپرسی هەموو کوردستان. بەبێ ئیمزای ئەو هیچ کەس توانای هیچی نەبوو.
بە کورتی خسروخان حکومەتەکەی فرە لەوی بوو. لافی سەربەخۆیی لێئەدا. لەگەڵ پاشای بابان نێوانی خۆشبوو. لە هەرتك لاوە مەودای دوستایەتیان پتەو دەکرد. هەرتك تایفە ئاسوودە بوون.
حەمەرەشیدبەگی وەکیل لەگەڵ ئەحمەدبەگی باپیری باوکی نووسەر کە لە ولاتی بابان راوێژکەر و لە جێگای وەکیل بوو، خزمایەتی کرد و خوشکی وی بۆ ئەتمەلی‌بەگی کورەگەورەی خۆاست. کە لە پاشان باسی دەکرێ. بەم هۆیەوە کار و باری حەمەرەشیدبەگ تەواو قایم بوو. بە سەر تەواوی کوردستانی ئەردەلان و باباندا حوکمران بوو.
خسروخان لە ئاوەدانی شاری سنە و بارەگای حکومەتیدا فرە شێلگیر بوو. کۆشك و قەلای رووبە رۆژهەلاتی دروست کرد کە بە 'خسرویە' ناوبانگی کرد. کە ئێستاش هەروا بەرقەرارە. پاش چوارساڵ حکومەت، جەعفەرخانی زەند کە ئیدعای پاشایەتی ئێرانی دەکرد لە ئیسفەهانەوە بۆ دلدانەوەی خسروخان هاتە هەمەدان. ئەو دەم خسروخان والی کوردستان بوو. گەورەپیاو و پالەوانی بە سەر هەموو ئەمیرەکانی ئێراندا هەبوون جەعفەرخان بە نامە و تەتەر داوای لێکرد کە بچێتە لای.
خسروخان لەگەل گەورەپیاوانی ولات تەگبیری کرد. لەگەڵ و دژ قسەکران. میرزا[٩] ئەحمەدی وەزیر کە بابەالباب لە کوردستان خاوەن پایە و ناونیشان بوو -بەسەرهاتی خۆی و کور و نەوەی لە باسی ئەردەلاندا دەنووسرێ- بە خسروخانی گوت: خانەکانی زەند لە عیلایەتیدا، هەمیشە لە حاکمەکەلی کورد کەمتر بوون. بێجگە لە کەریم خانی وەکیل کە خوا بوو بە رێنوێن و پشتیوانی و بوو بە پاتشا، دوای ئەو کور و تایفەی ناکۆکیان لێ پەیدا بوو، رێك نەکەوتن و لە هەموو بارێکەوە وا دەردەکەوی کە تێکچوونی دەولەتی زەندیە روون و ئاشکرایە. ئەگەر چەند ساڵێك کەریمخان شانسی هەبوو، ئێتر بۆ دەبێ خسروخانی والی کوردستان بەر حوکمی جەعفە رخان بێ؟ ئەم قسەیان بردە لای

حەمەرەشیدبەگ. ئەویش قسەکانی میرزا ئەحمەدی پەسەند کرد.
ئاخرەکەی برپاریان دا کە خسروخان شەری لەگەڵ بکات. رۆژی دوایی بە لەشکریکی زورەوە بۆ شەری جەعفەرخان کەوتەری لە گوندی "بەهار" لە دوو فەرسەخی هەمەدان تووشی یەکتر بوون. لە بەیانێوە تا ئێوارە پالەوانانی کورد و پیاوانی لور لێکیان دەدا. لە هەرتك لا خەلکێکی زۆر کوژران. لەشکری کوردستان کەمێك بەرەو کزی دەچوو. خسروخان هەستی بەوە کرد. خۆی باسکی لیّ هەلمالی و نێزە بەدەست هاتە مەیدان. روی کردە سوارانی کوردستان و گوتی: لێرە تا خاکی کوردستان پتر لە چوار فەرسەخ نییە ئەگەر ئێوە لەبەر دەستی ئەوانە بشکێن، بێگومان وەدوامان دەکەون و لۆری سەرکەوتوو بە دەمارگیری مەزەبی جوقەوارمان لیّ دەبرن. کە وابوو پیاوانە وەخو کەون و شورەیی هەلاتن مەخەنە سەر خوتان. ئەوەی گوت وەك پڵنگی برینداو خۆی بە لەشکری زەند دادا.
کاتیّ گەورەپیاوانی کوردستان سەروکی خۆیان وەها بینی، هەموویان بە سەرگرانی وەشەر کەوتن. لەشکری لۆر خۆیان نەگرت و هەلاتن جەعفەرخانیش کە دەنگی خسروخان و غیرەتی لەشکرەکەی دیت، ترسا و بەر لە هەموان تییّ تەقاند. بارگەو بنەی پاشایەتی کەوتە دەست خە لکی کوردستان.
خسروخان بە شوکرانەی ئەم سەرکەوتنە سوژدەی برد و ئەمری کرد: کەس وەدوای راکردوان نەکەوی زەحمەتیان نەدەن. چونکە زۆریان بریندارن و خوای تەعالا ئازاری ئەوانی پیّ خۆش نییە. پاشان لە وەی بەتالان وەگیری کەوتبوو ئەو شتانەی باش بوون، وەك پێشکێش لەگەڵ نامەی سەرکەوتنی و یەکێك لە گەورەپیاوانی کوردستان ناردی بۆ مازەندەران بۆ بارەگای محمدشای قاجار.
پاشا لە بیستنی ئەم هەواڵە فرە شاد بوو. چونکە نەمانی دوژمنێکی وەك جەعفەرخان و هاتنە ژێر باری خسروخان کارێکی گەورە بوو. لە راستیدا بەخت و ئیقبالی ئەم پاشایە هەر لەم کاتەوە دەرکەوت. ئەمری کرد کە ئەسپێك بە زین و بەرگی جەواهردار و خەنجەرێکی ئەلماس و دەستێك لیباسی تایبەتی خۆی بەخەلات بۆ خسروخان بنێرن. فەرمانێکی پیروزبایی و دەست خۆشانە و سەروکایەتی ولاتی "سەنقر و کۆلیایی" -بو بنووسن.

پاشان قاسیدەکەی بانگ کرد و لە بارەی نەزمی ئەم ناوچە و سنوورە هێندێ ڕاسپاردەی پێ گوت و ئەویشی خەڵات کرد. قاسید بە خەڵات و فەرمانەوە هاتەوە لای خسروخان.

خسروخانیش ئەحمەد بەگی کوڕی حەمەڕەشیدبەگی وەکیلی کردە حاکمی سنقر. لە زەمانی حکومەتی خسروخاندا خەڵکی کوردستان بە ژمارە زیادیان کرد و لە ئاسایش و ڕەحەتی‌دا بوون لە ساڵی چل و یەکی حوکمڕانیدا تووشی نەخۆشی بوو. لوتفعەلیخانی مامی لە جێگای خۆی دانا و مرد.

هەرچەند نیشانەی گەورەیی و سەروکایەتی لە نێوچاوانی ئەمانوڵاخانی کوڕیدا، دیار بوو، بەڵام چونکە بە زیندوویی سەری مزگێنی حکومەتی دابوو بە لوتفعەلیخان، ئەویش سەری بۆ گەورەیی برازای دانواندبوو، پەیمان شکێنی بە پێچەوانەی ئەزم و داب دەزانی. کردی بە حاکمی گشتی کوردستان و ئەمانوڵاخانی کوڕی کردە ژێردەستی ئەو. لە بنەوە زۆر شتی لە بارەی ئەمانوڵاخانەوە بە حەمەڕەشیدبەگی وەکیل ئەسپارد.

خسروخان پیاوێکی ئازا و ڕەشید و سەخی بوو کە لە پێشدا باسی سەخاوەتی ئەو کراوە. لەوپەڕی هێدی و هێمنیەتی‌دا لە گەڵ خەڵک دەبزووتەوە. هەر وەک پاش مردنی ئەو لە گەورە و بچووک، وەزیر و وەکیل کەس ئەما کراسی بۆ لە خەم نەنێ. نازناوی "خان دەروێش" و لە سەر مەزهبی شیعە بوو. دەڵێن بە سەر شیعریشدا دەسەڵاتی هەبوو. بەڵام کەس شیعری وی بە نوسراوی نەدیوە. بە کورتی دوو مانگ تازیەی بۆ دانرا. برایم پاشای بابان خۆی هاتە شاری ئەردەڵان و لە تازیە و پرسەی ئەودا بەشدار بوو.

## باسی حکومەتی لوتفعەلیخان

ساڵی هەزار و دوسەد و یەک لوتفعەلیخان لەسەر تەختی حوکمڕانی دانیشت. کار و باری وڵاتی برەو پێدا. حەمەڕەشید بەگی وەکیلی هەروەها لەسەر کار و باری وڵات دانا.

سەرنج و بڕوای بە پاشای ئێران (ئاغا محمدخان) هەبوو. نامە و قاسیدی بۆ بارەگای پاشا نارد و خزمەتکاری خۆی ڕاگەیاند. پاشاش فەرمانی حکومەتی کوردستانی لەگەڵ خەڵات و میداڵیا بۆ نارد.

لوتفەلیخان بە دڵێکی زانایانە و تواناوە سنوورەکانی کوردستانی رێك و پێك کرد. لەگەڵ پاشای بابان دوستایەتی بەردەوام بوو. لە سەردەمی حکومەتی ئەودا، باپیری نووسەر ئەحمەدبەگی ساحێبقران کە پاش حکومەتی بابان باسی دەکرێ، لە عوسمانپاشا ترسا و بە ماڵ و منداڵ و کەس و کارەوە هاتە وڵاتی ئەردەڵان. لە ماڵی وەکیل و جێگای خوشکی بارگە و بنەی بە عەرزی دادا.

لوتفەلیخان بە هاتنی ئەو شاد بوو. رێزی لێ گرت و رۆژ بە رۆژ پتر ئەدری دەگرت، بەڵکو دڵی لە وڵاتی بابان بێتەوە و تایفەی خۆی بۆ وڵاتی ئەردەڵان بێنێ. حەمەرەشید بەگی وەکیلیش بۆ هاتنی کوردستان هانی دا، بەڵام فایدەی نەبوو. پاش دوو ساڵ مانەوە لە سنە، بۆ بەغدا گەڕایەوە. سولەیمانپاشای والی زۆر رێزی لێ گرت. ئێشەڵڵا لە شوێنی خۆی باسی ئەویش دەکرێ.

بە تێکڕایی لوتفەلیخان ماوەی نۆ ساڵ لەوپەڕی سەربەخۆیی‌دا حکومەتی کرد. لە ساڵی هەشتی حکومەتی ئەودا، حەمەرشیدبەگ تووشی نەخۆشی گورچیلە بوو. بۆ عیلاج چوە ئیسفەهان. لە وێ هەر بەو نەخۆشی‌یە مرد. دوو ساڵ پێش مردنی بە ماڵ و منداڵەوە چوە حەج و پاش سێ مانگ ئەمری خوای بەجێ هێنا گەورە و بچوك بۆی تازیەدار بوون. فەتحەلی‌بەگی کوڕە گەورەی ئەو بوو بە وەکیل و کاربەدەستی کوردستان.

## حکومەتی حەسەنعەلیخان

لە ئاخری ساڵی ۱۲۱۰دا، لوتفەلیخان مرد و حەسەنعەلیخانی کوڕی بوو بە حوکمڕان. لەو ساڵەدا ئاغا محەمەدخانی قاجار لە قەڵای شوش کوژرا. باباخان فەتحەلیشای قاجار بوو بە پاشا. حەسەنعەلیخانی کوڕی لوتفەلیخان بوو بە والی کوردستان. چونکە لە سەردەمی گەمارۆی شوش‌دا ئەویش لەگەڵ ئاغا محەمەدخان بوو و خزمەتی زۆری کردبوو. لە لای پاشا پلە و پایەیەکی هەبوو. کاتێك کە لوتفەلیخان مرد، وەك میراتگر بوو بە حوکمڕان. کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران خەڵات و بەداڵیایان دایە. بەڵام لە نێوان ئەو و فەتحەلی‌بەگی کوڕی حەمەرەشیدبەگی وەکیل‌دا بوو بە کێشە و ناکۆکی. ئەوەش بوو بە هۆی تێکچوونی کار و باری. حەمەرەشیدبەگ بە زیندوویی سەری کیژی

لوتفەلیخانی بۆ محمدزمانبەگی کورەبچکۆلەی خۆی خواستبوو. خۆشی دەویست.
کاتێك حەمەرەشیدبەگ مرد، فەتحەلیبەگی کورەگەورەی ئەو بوو بە وەکیل. حەسەنعەلیخان چوونکەخوشکی دابوو بە محمدزمانبەگی، دەیویست ئەو بکا بە وەکیل. فەتحەلیبەگ و برایەکانی کە بە گوێرەی تەمەن و لێهاتویی بە سەر محمدزەمانبەگیاندا هەبوو، نارەحەت بوون. کەم کەم نێوانیان لەگەل حاکم تێکچوو. ئاخرەکەی ئەمانوڵاخانی کوری خسروخانیان هەلگرت و چوونە تاران لای فەتحەلیشای قاجار و کێشەیان بردە لای ئەو. بە تێکوشانێکی زۆر فەرمانی حکوومەتیان بە ناوی ئامانوڵاخان وەرگرت و بە خەلات و دیارییەوە بۆ کوردستان گەرانەوە. لەوە غافل بوون کە بنەچەکەیان بە دەستی ئەو ئامانوڵاخانە لەبەین دەچێ.
بەکورتی حەسەنعەلیخان لەشکرێکی هەلگرت و بە هیوای پشتگیری عبدالرحمانپاشای بابان روی کردە دەشتی مەریوان. بەلام ئەمانولاخان دەرفەتی نەدا. بە لەشکرێکی زۆرەوە کەوتە دوای. لە سنووری بابان گەیشتە سەری و لە هەرتك لاوە بوو بە شەر. حەسەنعەلیخان کە پیاوێکی ئازا بوو، نێزیك بوو لەشکری دوژمن بشکێنی، بەلام قەزا و قەدەر جۆرێکی دیکەیهێنابوو. لەپر ئەسپەکەی دەکێتلی قەبرێك هەلەنگوت و کەوت. دەوریان دا و هێنایانە کن ئەمانولاخان. کە دیتی هەستاو دەستی کردەوە و گوتی: ئامۆزا! خسروخانی باوکم کە لە سەرەمەرگدا بوو، هەرچەند میراتی باوك بە کور دەگات، بەلام بە گوێرەی پەیمانێکی لەگەل بابی تو بەستبووی، لانی منی بەرداو ئەوی کرد بە حاکم. لە تەواوی حوکمرانی ئەودا من بۆ نانی شەو موحتاج بووم. بە هیچ جۆر چاکەی خسروخانی لەبەرچاو نەگرت. هەمیشە دەیویست ئەولادی ئەو نابوت بن. پاش ئەوەی دەمات بمری، دیسان ئینسافی نەبوو. توی کرد بە حاکم. خوای گەورە مافی منی داوە بە من کە خاوەن مافم. ئێستاش من تو ئازاد ناکەم و دەتنێرم بۆ بارەگای شا تا لەوی حوکمی تو بدەن.
حەسەنعەلیخان گوتی: یەکەم ئەگەر باوکت توی بە شایانی پایەی حکومەت زانیبا، میراتی خۆی نەدەگوری. دلرەقی و لەچەری توی لە ئاست هەبەکانی خۆدا زانی بوو. هەرلەبەر ئەوە باوکت منی لە جێگای

خۆی دانا. هەرئێستاش کورەکانی وەکیلن کە لەم کارەدا رێنوێنی تۆ بوون، لە تۆڵەی ئەم کارە بێجێیەدا، گیرۆدەی دەستی تۆ دەبن و هەر چوار برا دەکوژرێن و راستی قسەکانی منیش بۆ هەموو کەس دەر دەکەوێ. ئەمانوڵاخان لە قسەکانی ئەو تورە بوو و روی خۆی گرژ کرد.

بە کورتی باش چەك کردنی حەسەنعلیخان هاتەوە شاری سنە ولە گەڵ دوو کەس ناردیە تاران و نامەیەکیشی لە بارەی یاخی بوونی ئەو بۆ پاشا نووسی. ناوبراویان گەیاندە بارەگای پاشا و کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران بروایان بە یاخی بوونی ئەو کرد. چەند رۆژێك لە ژێر چاودێریدا رایان گرت و پاشان بەندیان کرد. پاش چەند مانگ مرد و لە ئیمامزادە ناشتیان. حکومەتی کوردستان بەبێ بەشداری بێگانە بە نسیب ئەمانوڵاخان بوو. کیژی حەسەنعلیخانی لە خۆی مارە کرد. ساڵی هەزار و دوسەد و سیزدە بوو بە حاکمی کوردستان بەڵام لە حوکمرانیدا هەر ناوی هەبوو. تەواوی کار و بار و نەزمی وڵات بە دەستی فەتحعەلیخان بەگی وەکیل بوو. ئاخرەکەی خۆی را نەگرت و چوە تاران و سکاڵای حاڵی خۆی بە شای ئێران راگەیاند.

وەکیلی کوردستان و براکانی بە دوای ئەودا کەوتنە رێ. ناکۆکی ئەوان لەلای کاربەدەستانی دەوڵەتی ئاشکرا بوو. ئاخرەکەی ئاشتیان کردنەوە. هەرتك لە خزمەت پاشا ئیجازەی گەرانەوەیان پێدرا. بەڵام ئەمانوڵاخان بە نهێنی ئیجازەی تەمبێ کردنی ئەوانی لە پاشا خواست. شا گوتی: مەگەر ئەوەندە کە ئەوان دەسەڵاتیان نەمێنی و کار و باری تۆ رێك و پێك بیێ، ئەگینا رێگات نادەم. ئەگەر ئازار و ئەزیەتیان پێ بگەیێنی، دەکەویە بەر ئازار و تەمبێ و هیچ عوزرێکیش ئازادت ناکات.

ئەمانوڵاخان لە کن پاشا سوێندی خوارد کە خەراپەیان لەگەڵ نەکات. بە کورتی والی و وەکیل بۆ کوردستان گەرانەوە. خەڵك بە دیداریان شاد بوو. وەکیل و براکانی هەروەها بەسەر هەمو کوردستاندا خاوەنی دەسەڵات بوون. کیژی میرزا ئەحمەدی وەزیر بەناوی عادلە خانم بوو بە دەزگیرانی نسروڵلا بەگی برا بچکۆلەی وەکیل. پێوەندی ئەم دوو بنەماڵە بەرقەرار بوو. والی لە بنەوە خەریکی لێدان و تێکدانیان بوو. ئەم رازەی لەگەڵ دوست و رازدارانی خۆی باس دەکرد و بە ئاشکرا دەری نەدەبری. چونکە لە هەموو کوردستان کەس نەبوو لێیان نەترسی، یان بە بەخشین و چاکە رێنوێنیان نەبێ.

به کورتی ئەمانوڵاخان ساڵێکی دیکەش بەم دەرد و کەسەرە رای بوارد. تا چەند کەسێکی لە خۆی کردە هاریکار و پەیمان. کاتێ دیاری کرد کە بەیانی پاش تەواو بوونی سڵاو، وەکیل و براکانی بۆ مەجلیسی حەلومت بێن. هەروەك دیاری کردبوو رۆژی دوایی لەگەڵ رازدار و نێزیکانی کۆڕی لوساریان ساز کرد. بە هەڵکەوت وەکیل و براکانی لەو کۆڕەدا ئامادە بوون. کاتێ مەجلیس بڵاوەی کرد، ئاماژەی دا بە دەست و پێوەندەکانی. ئەوانیش ئامرازی کاریان ئامادە کردبوو. لەگەڵ ئاماژەی لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دان و زنجیریان کردن. پاشان بە ئەمری خانی لە دیوی ژوورێ بەندیان کردن. دەست بەجێ پیاوی لەسەر ماڵ و ملك و منداڵیان دانا و هەرچی هەیان بوو دەستی بەسەر داگرت. شەو خۆی لەگەڵ دوو جەلاد چوە سەریان. لە پێشدا فەرمانی کوشتنی ئەوەی دا کە کاتێ خۆی بێئەدەبی لێ بینی بوو. ئەویش کە رۆژگاری خۆی بەدی نەدەکرد، جنێوی بە والی دا و نێوی دایکی هێنا. پاشان جەلاد بە شیری پولاً کوشتی. دوو برای بچوکی، محمد زمان بەگ و نسروللا بەگ-یش کە هەرتکیان لە هەرەتی لاوێتی‌دا بوون کوژران. پاشان روی کردە وەکیل و گوتی: من لە هەوەڵەوە ممنون و شەرمەزاری رەفتار و کردەوەی تۆم. بەڵام پاش ئەوی سێ برات لە بەر چاوت کوژران، ئیتر دڵت لەئاست من پاك نابێتەوە. کە وا بوو بە شەرمەزاری توش لەو دونیا خەفەتاویە رزگار دەکەم. وەکیل گوتی: خوا لە رۆژی جەزا تۆڵەت لێ بکاتەوە. هیچی تری نەگوت. فەرمانی کوشتنی ئەویشی دا و رەگەڵ براکانی خست. ئەم کارەساتە حەوتی رەمەزانی ساڵی ۱۲۱۷ روی دا.

به گشتی ئەمانوڵاخان لە رادە بەدەر کەس و کار و پاشماوەکانی ئەوانی ئازار دا. دەڵێن حاجی ماهرۆخ خانمی خێزانی حەمەرەشید بەگی وەکیل کاتێك توند و تیژی پیاوەکانی خانی بۆ ئەستاندنی ملك و ماڵ زانی، هەر چەند جەواهێراتی هەیان بوو کە بایی ۵۰ هەزار تمەن ئالتونی سوور بوو لەگەڵ بایی بیست هەزار تمەنیش ئەشرەفی سکەدار، لەسەر کەشفێك دانا و قورئانێکیشی لەسەر دانا و بۆ خانی نارد. سوێندیشی خوارد کە لە هیچ شتێ بایی دەتمەنمان نەماوە. لەوەش زیاتر ئەزیەت و ئازار بۆ گەورەپیاوان ناشێ. کاتێك خان ئەو شتانەی لە گەڵ قورئان چاو پێکەوت، ئاوێك راما و پاشان گوتی: کەسێکی بێ لێدان و

بریندار کردن، هەر بە هەڕەشە ئەو هەموو جواهێر و پارە و مرواریێ بتێری، ئەگەر ئازار بدرێن بێگومان چەند ئەوەندە دەنێرێ. پاشان چەند ئەراش و نوکەری زالمی لە سەر دانان. لە ئەزیەت و ئازار هیچیان تێدا نەهێشتەوە. دەلێن قامکی ماهرخ خانمیان بە گاز پەڕاند کە ژنێکی ئاوا بەرێز لە هەمو کوردستاندا نەبوو. منالی دە دوازدە سالەشیان ومپاش خۆ نەدا. حەقدە شەو رۆژ ئەو فەلیرانە ئازار دران. لەگەڵ ئەوەش هیچی دیکەیان نەمابوو بیدەن. هێندی لە ریش‌سپی و گەورە پیاوان تکایان بۆ کردن و ئەوانیان نەجاتدا. لە دوایە ئەمری کرد خانووبەرەکانیان بروخێنن.بە دو سی رۆژ وێرانیان کردن. حوکمی کرد جێگاکانیان بکەنە شێومرد. جاریان کێشا کە هەرکەس چاوەدێریان بکا بە دەردی ئەوان دەچی. کەس نەیتوانی پشتیوانیان لێ بکات. سێ سەد هەزار تمەن و ملك و ماڵ و دار و نەداریان تالان کرا. حوکمی کرد زانایانی کوردستان ئەو مولك و ماڵە بە ناوی ئەو بنووسن کەس نەیوێرا دەنگی لەبەر بێتەدەر.

کاتێ لەو کارانە بووە هەزار ئەشرەفی بە دیاری بۆ پاشای ئێران نارد. بۆ کاربەدەستانی دەوڵەتیش هەریەك دیاریەکی نارد. چوتیەتی کار و کردەوەی خوشی نووسی. نامەیەکیشی بۆ میرزا ئەحمەدی وەزیر نووسی کە ئەودەم لە تاران بوو، قاسیدەکەی راسپارد کە بە میرزا ئەحمەد بلێ: وەکیل و براکانی کوژران ئەگەر نسرولڵا بەگ زاوای تۆ بوو ئێستا من لە جێگای ئەوم خۆم کیژەکەت دەخوازم و کار وبار و شوغلی بەرز دەدەم بە کورەکانت. تازە ئەو کارەکراوە. کوژراوەکان زیندوو نابنەوە. باشترە تۆ لە لای کاربەدەستانی دەوڵەت ئەم کارە چاك بکەی، بە کورتی قاسید بە نامە و پێشکێشەوە گەیشتە تاران و لە ماڵی میرزا ئەحمەد دابەزی. روداوەکانی بۆ گێراوە میرزا ئەحمەد زۆر پەژارە بوو، سەعاتێك گریا. پاشان بیبجگە لە تەسلیم بوون، چارەی دیکەی نەبوو بەیانی چوو لای میرزا شەفیعی سەدری‌ئەعزەم و کارەساتەکەی بۆ باس کرد. نامە و دیاریەکانی والی‌شی دایە. سەدری ئەعزەم گوتی کارێکی گەورەی کردوە. ئەوە لە کن شاهەنشا سوێندی خواردوە کە دەست لە گیانیان ناوەشێنی. ئێستا دەترسم چۆن ئەوە بۆ شا باس بکەم. ئاخرەکەی بڕیاریان دا کە باسی کوشتنی ئەوان نەکەن، تا بزانن چون دەبێ.

رۆژی دوایە سەدری ئەعزەم چوّ کن پاتشا و حکایەتی والی و داماوی وەکیل و دار و دەستەی بۆ گێراوە. دوازدە هەزار تمەنیشی وەك پێشکێش دایە.

شا گوتی: هەر ئەوەیە کە گوتوومە. ئەگەر والی زیان بە گیانیان بگەیەنی، سزا دەدری. ماوەیەك با بەندیان کاو پاشان ئازادیان بکا. ماوەیەك پێچوو والی پێشکێشی دیکەی نارد و لە نامەیەکدا سەرگوزەشتی خۆی بۆ پاشا نووسی. بۆ سەدری ئەعزەمیشی نووسی کە راستی بە پاشا بێژی.

نامەی والی لە رێگای سەدری ئەعزەمەوە گەیشتە دەستی پاشا. لە کوشتنی ناوبراوان ئاگادار بوو. تووڕە بوو و سوێندی خوارد کە بە تۆڵەی ئەوکارە ئەمانوڵاخان لەسەر حکومەت لاببات.

کاربەدەستانی دەوڵەت زمانیان وەگر خست و گوتیان والی بە ناچاری ئەو کارەی کردوە. کورەی ڕقی پاشایان دامرکاندەوە.

پاش ماوەیەك ژن و منداڵی کوژراوەکان بۆ دادخوایی، خۆیان گەیاندە بارەگای پاتشا. بەڵام هیچیان بۆ نەکرا. بە دڵی بریندار بۆ کوردستان گەرانەوە. لە دێهات خۆیان شاردەوە تا منالەکانیان گەورە بوون و بوون بە خاوەنی جێگاو پایەی باوکیان. لە ئاخری باسی کوردستاندا، باسی ئەوانیش دەکری.

پاش کوشتنی وەکیل حکومەتی ئەمانوڵاخان باشی خۆ گرت. ترس بە سەر خەڵکدا زال بوو، کەس نەیدەوێرا لە قسەی ئەوبچێتە دەر، عادلەخاتونی کیژی میرزا ئەحمەدی لە خۆ مارە کرد و کورکانی میرزا ئەحمەدی هەریەك کارێکی پێ ئەسپاردن. میرزا عەبدولکەریمی کوری میرزا یوسفی برازای میرزا ئەحمەدی بوو بە باوەرپێکراوی والی و زوربەی پرس و راوێژی بەوی بوو. کاری وەکالەت درا بە حەمە رەحیم بەگ کە لە ئاموزاکانی وەکیلان بوو. بەڵام هەر ناوی بێ ناوەروك و هیچ کارە نەبوو. تەنیا رۆژەکانی باری عام لە جێگای تایبەتی وەکیل دادەنیشت پاش یەك دوو ساڵ ئەویش کوژرا، لەو تایفەیە بیجگە لە منداڵ پیاویان نەمان.

بە گشتی ئەمانوڵاخان ماوەی دە ساڵ لەوبەری سەربەخۆییدا حکومەتی کرد. میرزا ئەحمەدی وەزیر پاش زیارەتی ماڵی خوا کۆچی دوایی کرد. ئیتر لە گەورەپیاوانی کوردستان کەسی وا بە دەسەلات نەما

که پێی وبەر پێ بدات. بەڵام سەید مەحمودی شیخ‌الاسلام و سیدزەکی کوری که قازی بوو. له سادات حسینی و گەورەپیاوی وڵات بوون و له باری بنەچەکە و شوێنەوە بە سەر خەڵکیاندا هەبوو، لە هێندی کردەوەی والی دڵ ئێش بوون. چونکە زۆر جار داوای لێ دەکردن کە قەبالەی نابەهەقی بۆ مۆر بکەن، ئەوانیش نەیان دەکرد. دەیانگوت: دین به دونیا نافروشین. وردە وردە نێوانیان تێکچوو. ئاغا زەمانی کوری یوسف بەگ که له پلەی وەکیل‌دا بوو، بابەلباب له گەورە پیاوانی کوردستان ناسرابوون، له کردەوەی خان دڵگیر بوو. شەوێکیان لەگەڵ کور و کەس و کاری خۆی، له خزمەت ئەو دوو سەیدەدا رایان کرد. سکالایان بردە بارەگای پاتشای ئێران و لە سالی سەدری ئەعزەم دابەزین. پاش ماوەیەك چوونە خزمەت شا. سەید مەحمودی شیخ الاسلام دەستی به لسان کرد و زوڵم و زۆری والی بۆ شای باسکرد. ئەوانی تریش هەرچی دەیانزانی خستیانە سەر. لەو کاتەدا تەتەری والی بە دیاری و پێشکێشەوە گەیشتە تاران و نامەی والی کە باسی هەلگەرانەوە و فیتنەی سەیدی دەکرد نووسیبووی ئەوانە بە تەعەسوبی ئایینی دەیانەوی وڵاتی کوردستان بدەن بە دەوڵەتی عوسمانی. ئەوەندەی لەم بابەتانە نووسیبوو کە شا توورە بوو فەرمانیدا کە ئەشێ بگەرێنەوە کوردستان بۆ لای والی.

ئاغا زەمان و کورەکانی گوتیان، ئەگەر بچینەوەکوردستان دەکوژرێین. تایفەی وەکیل لە ئێمە گەورەتر بوون، چی‌یان بەسەر هات. ئەگەر دەتانەوی ئێمەش بە دەردی ئەوان بچین هەر ئێرەتا لە تاران ئەوەی پێویستی سزامانە بیکەن.

شا قسەی وانی پەسند کرد و ناردنی بۆ کرماشان لای محمد عەلی میرزای کوری، کە نوکەری ئەو بکەن. بەڵام سەید محمود و کورەکەی، سەبارەت بە سەیدایەتی و بنەچەکە گومانیان لە کوشتن یا سوکایەتی نەبوو، رازی بوون کە بچنەوە کوردستان و خۆیان بە قەزا و قەدەر ئەسپارد. فەرمانیشی دا بە والی کە ئاگاداریان بێ. پاش ئەوەی گەیشتنە سنە و خزمەت خان، چەند رۆژێك لە جێگای خۆیان مانەوە. پاشان گیران. هەرچی هەیان بوو لێیان ئەستاندن و لە ئازاردانیش هیچیان تێدا نەهێشتەوە.

پاش ماوەیەك بردنیان بۆ سەقز و بە ئازار و ئەشکەنجە بە خاکیان

ئەسپاردن. ئاغا زەمان و ئەوانی تر کە بۆ کرماشان ناردرابوون، پاش گەیشتنیان والی پێنج هەزار تمەنی وەك پێشکێش بۆ شاهەنشا نارد و داوای کوشتن و کرتنی ئەوانی کرد. هێندێ لە نۆکەر و خزمەتکاری شازادە کە لە بنەوە لەگەڵ ئەمانوڵاخان پێوەندییان هەبوو لە کن شازادە بۆ پەسند کردنی داوای والی هەوڵیان دا. بەیانی رۆژی چوارشەمە، ساڵی هەزار و دووسەد و بیست و شەشی کۆچی فەراش و خزمەتکار بە سەریان وەر بوون. لە پێشدا هەرتك چاوی ئاغا زەمانیان دەرهێنا کە باب و گەورەی ئەو بنەماڵە بوو. پاشان بە گژ ئەوانی تردا چوون. یەکێکیان لەکاتی کوێرکردندا گیانی دەرچو. چەند کەسیان کوێر کردن. ئەوانی دیکەیان بە زنجیرکراوی هێناوە لای خان. ژن و منداڵیان کەوتنە بەر زوڵم و دەستدرێژی. پاشان کە چیان پێوە نەهێشتن، بردیانن بۆ هەوراسان و پاش ماوەیەك لەگەڵ ئەم دونیایە ماڵ ئاواییان کرد.

نهێنی نەبێ ئەگەر تەواوی رووداوەکانی کوردستان بنووسم، درێژدەبێ و نووسراوەکە زیاد دەبێ. جا بۆیە لە درێژ دادری خۆ دەپارێزم و بە کەم نووسین واز دێنم. پاش قەڵاچۆ کردنی سەیدەکان و تایفەی ئاغا زەمان، وەها بەسەر وڵاتی کوردستاندا زاڵ بوو کەس نەیدەوێرا لەگەڵ ژنی خۆشی لە جێدا باسی بکا.

لەوکاتەدا ئەمانوڵاخان لە عادلەخانمی کیژی میرزا ئەحمەدی وەزیری منداڵی بوون، گەورەکەیان خسروخانە کە لە جێ خۆی باسی دەست بڵاوی و پیاوەتی و قسەخۆشی دەکرێ.

بەر لەوانە والی لە ژنێکیتر کوڕێکی هەبوو بە ناوی محمد حەسەنخان. کوڕێکی ئازا و بە ئەدەب و گەورەپیاو. تەمەنی بە راو و شکار و سواری رادەبوارد. هەرچی مرۆی ئازا و بەکار بوو رەگەڵ ئەو دەکەوتن. لەگەڵ کورانی میرزا ئەحمەد کە خاڵی خسروخان بوون دوژمنایەتی هەبوو. لە کوشتنیان دەخەفتا. ئەمانوڵاخان لەوەی کە زوربەی مروی ئازا و بەکار لێی کۆ دەبوونەوە ترسی رێکەوتبوو.

ماوەیەك هەر وا تێپەری. ئاخرەکەی حەمەحەسەنخان، لە باوکی زیز بوو لە گەڵ هێندێ لە ئازایان چوە کرماشان. ماوەیەك لەو ناوە سورایەوە. حەمەحەسەنخان لە سەر ئەوە لە باوکی زیز بوو کە باوکی کیژی پاتشای ئێرانی بوو خسروخان خواست کە لە جێگای خۆی باسی

دەکەم. ئەمە گرانی خستە سەر دڵی حەمەحەسەنخان و ناردمیە کن بابی کە من کوری گەورەم و خسروخان هێشتا منداڵی مەدرەسەیە، ئەوە بێئینسانییە کە لە گەڵ من دەکری. کیژی پاتشا بۆ ئەو دەخوازی، ئاشکرایە پاش مردنی تۆ شا حکومەتی کوردستان دەدا بە زاوای خوی.
پاش بیستنی ئەو پەیامە، والی بانگی کردە کن خوێ و گوتی: کورم بۆ وا بێ ئاقلی، تۆ کورەگەورەی بنەماڵەی ئێمەی. بە زهندویی سەزم تۆ والی کوردستانی. جێ نشین و جیگری من ئەتوی. ئەگەر کیژی پاتشام بۆ براتی خواستوە، کیژی عەبباس میرزای ولیعاد بۆ تۆ دەخوازم. کورم! بنەماڵەکانی کوردستانم تەفر و تونا کردوە، لە ئەخدینە و جەواهێرات خەزێنەم بۆ ئێوە وەسەریەك ناوە. منیش تەمەنم ئەوەندە نەماوە. پاش من ئەگەر لە دوژمنکاری و ناکوکی بە دوور بن، لەت دەستی دوژمنان ئاگاتە کوردستانتۆزی لەو قسانەی بە کوتیدا چیاند و نەختێ گریا. حەمەحەسەنخان گەراوە بۆ جیگای خوێ لە گەڵ باورپێکراوانی نەخشەی راکردنی کێشا و لە کاتی دیار کراودا، نیوەشەو لە گەڵ هەزار سوار کە هەر یەکەی حەریفی سەد کەس بوو، لە شاری سنە وەدەر کەوت و چونە کرماشان. لە وێشەوە چو نێو عیلەکانی کوردستان لە گەرمەسێر. چوار مانگ لە وێ بوو والی لەم کارەی کوری فرە دڵگیر بوو. رووداوەکەی بۆ شای تێهران نووسی. کاربەدەستانی دەوڵەت وایان بە باش زانی کە بێژن دڵخۆشی بدەنەوە و بیتەوە کن بابی.
باباعەلیخانی شاترباشی کە مرۆیەکی قسەزان و زمانلوس بوو، بۆ ئەم کارە دەستنیشان کرا. فەرمانێك بۆ بەڵێن و هەرەشە بۆ حەمەحەسەنخان نووسرا. والیش لەم کارە بێجێیانەی سەرکو نەکرا. باباعەلیخان خوێ ساز کرد و بەرەو کوردستان کەوتە رێ. کە گەیشتە سنە چاوی بە ئەمانوڵاخان کەوت و فەرمانی شای پێ راگەیاند. والی بێتاوانی خوێ لە ئاست کوری و خەڵکی کوردستان پاکانە کرد. چەند رۆژێك لەوێ بوو، پاشان لەگەڵ خان بۆ سنووری کرماشان کەوتە رێ.
لەو کاتەدا حەمەحەسەنخان بە لەشکرێکی گەورەوە لە ماهی دەشتێ بوو. کاتێك هەواڵی بزوتنی باوکی بیست فەرماندەکانی سوپای خوێ بانگ کرد. کاتێك هەموویان کۆ بوونەوە، گوتی: دەنگ و باسی هاتنی والی-مان پێدەگات. بیستوومە شاهەنشا کەسێکی بۆ دڵدانەوەی

من ناردوه. بلّێن لەبارەی شەر و ئاشتی‌یەوە بیّر و رای ئێوە چی‌یە؟ تا هیچ نەفەوماوە بە تەگبیر و ئاقل دەکریّ ئەو فتنەیە بکوژێتەوە.
هەموو ئێکرا گوتیان: تۆ کوری والی، ئاشکرایە، دلّی لە تۆ نائێشێنی. بەلاّم هەموو کردەوەکانی تۆ خەتای ئێمە دەگریّ. سوێند بە زاتی خوا، ئێمە تازە بە پێی خومان ناچینەوە دە زاری ئەهەنگ و بەر چەنگالی پلنگ. ئەگەر تۆ سلامەتی خۆت دەوی، هەر ئەو قاسبدەی شا بکە تکاکار و بچۆوە حزمەت باوکت. ئێمەش خوا گرشەیەکی سلامەت‌مان پیّ‌رەوا دەبینیّ، "عەرزی خوا بەرینە". ئەومیان گوت و لە دەوری ئەو بلاّومیان کرد. حەمەحەسەن‌خان دلّی بە حالیان سووتا. هەمووی گێرانەوە و گوتی: براپانی من! دەمویست ئێوە تاقی کەمەوە. بە یەکێتی خوا تا گیانم لە بەدەن‌دایە، لایەنی ئێوە بەر نادەم. ئێستا کە وای لێهات، وەرن پەیمان بە سوێند ببەستین کە لە رۆژی شەردا خۆمان بە هەلاّتن شەرمەزار نەکەین. حەمەحەسەن‌خان قورئانی پیرۆزی لە باخەلی دەرهێنا و لە وێ دانا. یەك یەك هاتن بە کەلامی خوا سوێندیانخوارد کە تا گیانیان لەبەردایە لە شەر هەلّنەیەن.
پاشان هەرکەس چووە شوێنی خۆی. شەو خۆیان بۆ شەر ئامادە کرد. بەیانی لەگەلّ خۆر هەلات حەمەحەسەن‌خان لە شوێنی خۆی بزووت هەزار و سیّ‌سەد سوار کە هەموویان وەك رۆستەم و ئەسفەندیار بوون بەرەو کوردستان وەریّ کەوتن.
ئەو دەم خێوەت و بارە گای والی لە دەولّەتاوا لە دوو فەرسەنگی خاکی کرماشان بوو. هەموو گەورەپیاوانی کوردستان لە خزمەتیدا بوون. لە دەشتی رەوانسەر سانی لەشکری دی، فەرماندەرانی لەشکر دەستیان بە بژاردن کرد. دوو هەزار سوار و پێنج سەد تفەنگچی هەورامانی و سیّ سەد شمنخالّچی و زەنبورەچی لەگەلّ بوون.
بە کورتی کاتێك پتر لە فەرسەخێك نەمابوو بگەنە یەك، ئەمانولاّخان مەلا و سەید و شێخی بە کەلامولاّو فەرمانی پاتشاوە بۆ دلّدانەوەی کورەکەی نارد. ناردراوەکان گەلێك پارانەوە و تکایان کرد، فایدەی نەبوو. گوتی: هەرچەندی من لای بابم ویستیاری لابردنی کورانی میرزا ئەحمەد بروم. جوابی نەدامەوە. ئێستا خەلّکێکی زۆر لەگەلّ من سەرگەردانە و لە والی دەترسین. دەسەلاّت بە دەست من نەماوە. ئەم کارە بە شیر نەبیّ چاری ناکریّ. ئەوەی گوت و قاسبدەکانی

ناردەرە و خووی ئامادەی مەیدان کرد.

## شەری ئەمانوڵاخان و حەمەحەسەنخانی کوری و کوژرانی حەمەحەسەنخان.

پاش گەرانەوەی قاسیدەکان و بیستنی قسەکانی حەمەحەسەنخان بە جارێك بریاری شەریدا. راست و چەپ بە شەرکەران رازاوە. کورەکانی میرزا ئەحمەد هەرچەند هەڵگری شیر و ئاڵا نەبوون و خاوەنی کاغەز و قەڵەم بوون، بەڵام ئەو رۆژە وەك شیری رق هەستاو مەیداندارییان دەکرد. هێندی لە پاڵەوانانی حەمەحەسەنخان سوێندی گەورەیان خواردبوو کە بێجگە لە ئەمانوڵاخان کەس نەکەنە نیشانەی رمب و تیر. بەمجۆرە کەوتنە مەیدانی شەر. هێندی لە ئازایان دەورەی میرزا عەولا و میرزا فەرەجولای کوری میرزا ئەحمەدیان دا. لە هەوەلین پەلاماردا میرزا عەولا کوژرا سێ کەسی دیکە بە کۆ میرزا فەرەجولادا چوون کە لە شوێنی خوی باسی سیفاتی ئەو دەکری. میرزا عەبدولکەریم کە پاریزەری والی بوو دڵی بە ئاموزای سوتا و تاوی دا مەیدانی. هەرچەندوالی چوونە مەیدانی لێ قەدەغە کرد فایدەی نەبوو. رەگی پیاوەتی هەستا بوو. لەگەڵکو گەیشتێ، یە کی لەو سێ کەسانەی کوشت و دووکانی تر هەڵاتن و میرزا فەرەجولای نەجات دا.

بە کورتی شەرێکی وا ساز بوو کە بارامی خوێنخور بە زمپی پێیاندا دەهات. ئەوانەی دەیان ویست ئەمانوڵاخان بکوژن خۆیان دەکەس نەدەگەیاند. لە هەمووی چاویان لە سوپا دەکرد و دەگەران. والی لە بەر ئەوەی تفەنگچی هەورامی وەپێش خۆی دابوو بۆ خۆشی لە دوای ئەوان دەبوو بە جارێ هەزاران تیر بەسەریاندا دە باراندن و هەموویان کوشتن، تاقە کەسێك نەبی بە برینداری لە هیچ نەترسا و لە سەفی هەورامیانیش تێپەری. والی لە هێبەتی ئەوکابرایە ترسا و خەرێك بوو رابکا کە کابرایەك نێزەیە کی لە سنگی ئەو سوارەدا و لە ئەسپ خستیەخوار. گورج سەری بری و بردیە حزمەت خان و فرە شاد بوو. حەمەحەسەنخان کە بۆخۆی شەری ساز کردبوو، بە هەموولایەکدا رای دەکرد و لەشکری خۆی هان دەدا و دڵخۆشی دەدانەوە. لەوکاتەدا بەرەو رووی میرزا لوتفولای ئاموزای میرزا ئەحمەد هات کە لە ئازایی و پیاوەتیدا تای نەبوو. دەنگی دا و میرزا لوتفولا بە نەرمی وڵامی داوە و

گوتی تو کورەگەورە ی خان و چرای بنەماڵەی من ناتوانم لە بەرامبەر گەورەی خومدا شیر هەڵکێشم، وەگەری و وەبزانە منت نەدیوە. لە بەر تو رادەکەم بەو شەرتە وەدوام نەکەوی. حەمەحەسەنخان گوێی نەدایە سەری دەدو نا. جنێوی پێدەدا و دەیگوت تۆ کە رۆژی مەیدان خۆت بە ئەفراسیاب ئەدەدا بۆچی وەك رێوی رادەکەی.

میرزا لوتفولا لەو قسانە وەغیرەت کەوت و لێی گەراوە و تفەنگێکی پێوەنا. گوللە وە رانی راستی کەوت و هەر لەوی راوەستا. میرزا لوتفولا دەرباز بوو. دوو کەس لە نوکەرانی حەمەحەسەنخان دەستیان کرد بە شین و گریان. هەرچەند دەیگوت مەگرێن فایدەی نەبوو. دەنگیان لەنێو لەشکر بلاو بووە و لەشکر شکا. عەلی سولتان ناوێك بروا پێکراوی بوو سواری ئەسپی خان بوو لە پێش خوێ دانا بەرەو کرماشان رای کرد. سوارەی سەرکەوتوو وە دوایان کەوتن و هێندێکیان لێ بە دیل گرتن. عەزەم خان ناوێك کە گەورەی هیلی "بەراز" بوو گەیشتە حەمەحەسەنخان. لە پشتەوە گرتی و لە ئەسپ بە عەرزی دادا، رانی بریندارى بە جارێك شکا. سەیر ئەوە بوو، پێش سالێك ئەو عەزەمخانە دووهەزار تمەن بە سەرکاری والی قەرزدار بوو. نەیدەداوە. پیاویان لەسەر دانا کە لێی بستێننەوە. کاتێك فەراشان گرتبوویان و لە داریان بستبوو لێیان دەدا، حەمەحەسەنخان بە وێدا تێدەپەری. لەبەری پاراوە و داوای بەزەیی لێ کرد. خان بەزەیی پێدا هات. بە وەکیلی خوێ گوت: دوەهەزار تمەن بدە بە عەزەم خان. هەر ئەو دەم لەو بەڵایە نەجاتی‌دا و گوتی: رەنگە ئەو پیاوە بە کاری خزمەتێك بێ. تولەی ئەو خزمەتەی ئەوها کردەوە. حەمەحەسەنخان لەو کارە سەری سورما. بە زەردەخەنەیەك تە ماشای عەزەم خانی کرد.

خەبەری بریندارى و گرتنی گەیشتە باوکی لەئەسپ کەوتە خوار. بە گریان و خوڵ وەسەر کردن خوێ گەیاندە حەمەحەسەنخان. پاڵی وە حەمەسولتانخانی حاکمی سەقز دابوو خوێن لە برینەکەیدەهات.

ئەمانولاخان لە خۆ چوو. کە وەهوش هاتەوە، دەی‌ناڵاند و ریشی هەڵدەکەندەوە بابا عەلیخانی شاتریباشی و مەلا و گەورەپیاوان بە سەریدا هاتن و نەختێ هێدی بووە. پاشان لە سەر بەردێك دانیشت. دیلەکانیان دەستە بە دەستە هەریەك بە ناو تایفە دەیناسین. پاش چەند ناخافتنێك فەرمانی کوشتنیانی دەدا. لە وانە مولەیمانویردیخانی کوری

حەمەحوسین بەگ کە لە گەورەپیاوانی وڵات بوو، والی هەمیشە لە دەست ئەو هەراسان بوو، هەڵگەڕانەوەی حەمەحەسەنخانی لەوی دەزانی، کە هێنایان هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: تۆ قاتلی کوری منی. پاشان پێی گوت هەستە و کوری خۆت بکوژە. ئەگینا لە سەرت دەدەم. ئەو فەقیرە دەپاراوە و دەلەرزی. بابا عەلیخانی شاترباشی تکای بۆ کرد و ئەوەندەی پێ داگرت تا حەمەحوسین بەگی لە کوشتنی کورەکەی رزگار کرد. بەڵام بە والی تری گوت بە شیران لەت لەتی کەن. دەست بە جێ لە بەر چاوی حەمەحەسەنخان هەمووی کوشتن. دەڵێن ئەو رۆژە پتر لە سەد کەسی مل پەڕاند. بێجگە لەوەی نێزیکەی ۲۰۰ کەسیش لە مەیدانی شەر کوژرابوون.

خەبەری بۆ کرماشان و تازەربایجان نارد. داوای دوکتورانی کرد. بە شەو و رۆژێک جەراحێك لە کرماشانەوە هات و برینی حەمەحەسەنخانی دیت. پاشان تەختی رەوانیان هێنا برینداریان لە سەر دانا و رێگای کوردستانیان گرتە بەر. بە دوای ئەودا فیلقوسی نشداری ئەرەنگی لە تەورێزەوە گەیشتێ. ماوەیەك خەریکی تیمار کردنی برینەکەی بوو بەڵام فایدەی نەبوو. پاش دوو مانگ کۆچی دوایی کرد. ئەم رووداروداوە لە ساڵی ۱۲۳۵ی کۆچی‌دا بوو. خەڵك بە گشتی تازیەدار بوون. سێ مانگ تازیە دانرا. دەوروبەر هاتنە سەرەخۆشی. تەرمی کورەکەی بە جا و جەلال بۆ کەربەلا نارد. لە دەوری تەرمەکەی دەگریا و خۆڵی وەسەر دەکرد. مزلێك لە گەڵ تەرمی کورەکەی رویشت پاشان بۆ شار گەڕایەوە. بابا عەلیخانیشی ئیزن دا و بەسەرهاتی خۆی بۆ شای نووسی. ناوبراو لە کوردستانەوە بۆ تاران گەڕایەوە و رووداوەکەی بۆ پاشا باس کرد. شاھەنشای عەجەم تازیەنامە و خەڵاتی بۆ والی کوردستان نارد و تازیەشیان دانا.

یەك دوو ساڵ بە سەر چوو، کەوتە بیری بوك هێنان بۆ خسروخان و گواستنەوەی (حوسن جیھان بیگم) کیژی پاتشای ئێران. لە پێشدا لە بارەگای پاتشا ئیجازەی وەرگرت. پاشان لەگەڵ کۆمەڵێك لە زانا و گەورەپیاوانی کوردستان ژن و پیاو چوونە تاران. دەزگای بەزم و خۆشی کەوتە کار. دە شەو و دە رۆژ بەزم و ئاھەنگ و شایی بوو. ۲۰۰هەزار زێری سوور بۆ ئەم شایییە خەرج کرا. لە سەعاتی موبارەکدا بوکیان هەڵگرت و بەرەو کوردستان گەڕانەوە.

ئەمانوڵاخان لە تارانەوە تا کوردستان لە هەموو شوێنێ لە بەزم و شاییدا بوو. لە سنووری وڵاتی خۆی چاك و خەراپ هاتنە پێشوازی و ڕێ و ڕەسمی پێشوازیان بەجێ هێنا. دە شەو و ڕۆژ شاری سنەی ڕازاندەوە. گەورە گەورەکانی کورد لەو دەورەدا لە شاییدا ئامادە بوون. پاشان لە سەعاتی موبارەکدا بوکیان دا دەست زاوا.
پاش تەواو بوونی بەزم و هەرا والی بە ئاسوودەیی خەریکی کار و باری حکومەت بوو. چوار ساڵی دیکەش بە سەربەخۆیی ڕایبوارد. پاشان تروشی نەخۆشی مێشك هات و شێت بوو. قسەی سووکی بە گەورەپیاوانی کوردستان دەگوت. لە هەموو کەس دردونگ و بەد گومان بوو. کەوتە بیری لەوتاندنی کورانی میرزا ئەحمەد، بەڵام ئەجەل مولەتی نەدا و ساڵی ١٢٤٠ی کۆچی ماڵاوایی لە جیهان کرد. خەڵك بە مردنی تازیەدار بوون، چل ڕۆژ پرسەیان دانا. پاش تازیمانە خسروخانی کوری لەجێی بابی دانیشت.

## باسی حکومەتی خسرو خانی کوری ئەمانوڵاخان

ساڵی ١٢٤٠ی کۆچی خەڵکی کوردستان لە گەڵ خسرو خان پەیمانیان بەست. ئەو لاوێکی وێژەر و زمان خۆش بوو. لە دەست بڵاوی و بەشینەوەدا حاتەمی تایی نەدەگەیشتێ. بە سەر شیعری فارسیدا دەستی هەبوو. لە سەردەمی حکومەتی ئەودا کوردستان تووشی قاتی و قوری هات. وابوو کە چوار ربە گەنم بە لیرەیەك دەفرۆشرا. خەڵك هاواری گەیشتبوە عاسمان. خسروخان لەو ساڵەدا سێ هەزار خەروار گەنمی دا بە فەقیر و هەژاران. خەڵکی وڵات لە سایەی ئەوەوە لە بزسێتی ڕزگار بوون. ناوبراو کاتی خۆی بە خواردنەوەی شەراب و هاودەمی ژنی جوان ڕادەبوارد. بەو مانایە "خەڵك لە سەر دینی پاتشان" زوربەی پیاو ماقولی کوردستان کاریان ببوە خواردنەوە و ڕابواردن لەگەڵ ژنان.
لە ساڵی پێنجی حوکمرانیدا، حەمەبەگ و سنەقابەگی کورانی فەتعەلی بەگی وەکیل کە کوشتنی ئەو و براکانی بە دەستی ئەمانوڵاخان باسکرا، ئەم دوو برایە لەگەڵ سولتان عەلی بەگی کوری عرسمان لە ناوچەی ئەسفەندئاوا لە گوندی "قسلان" بە فەرمانی خسروخانی کوژران. ئەمانوڵابەگ حەمەعەلی بەگ و تایفەکەیان چونە

تاران و سکالایان بردە بەر بارەگای شا. لە بەر هێندێ دوستی والی کە لەوێ بوون، داوایان نەپرسرا. ئاخرەکەی بە وەرگرتنی هەشت هەزار تمن مروچە و بەرات لە ئیسفەهان نیشتەجێ بوون. بە کورتی خسروخان ماوەی سێ ساڵ لەوپەری کەیف و شادیدا رایبوارد. لە کیژی پاتشای ئێران منداڵی وەسەر یەك نان کە لە شوێنی خۆیدا باسیان دەکرێ. خسروخان ساڵی۱۲۴۹یان ۵۰ کۆچی لەبەر خواردنەوەی زۆر مێشکی تێکچو وکۆچی دوایی کرد. گشت خەڵکی کوردستان بوی رەشپۆش بوون و لە تازیەدا بوون. دوو مانگی تەواو تازیمانە درێژەی هەبوو.

لە هەمو وڵاتی کوردستان بەتایبەت وڵاتی بابان کە دراوسی و لە ژنانیشەوە خزم بوون. لەم پرسەیەدا بەشدار بوون و دابی هەشیرمتیان بەجێ گەیاند.

تەمەنی خسروخان ۲۹ساڵ بوو لەبەر ئەوە بە ناکام ناوی دەر کرد. مرویەکی بە دل و دەست بڵاو بوو. وەك باسی دەکرێ ئەمانوڵاخانی باوکی لە ماوەی حکومەتی خۆیدا نێزیکەی دوسەد کرور تمەنی کو کردبووە. پاش مردنی، خسروخان لە ماوەیەکی کەمدا خەزێنەی باوکی دا بە خەڵکی کوردستان. پاش مردنی والی گەورەپیاو و خەڵکی کوردستان لەگەڵ رەزاقولیخانی کوری خسروخان پەیمانیان بەست کە منداڵێکی دەساڵە بوو. بەڵام تەواوی کار و باری وڵات بە میرزا فەرەجولای وەزیر سپێردرا. شازادەخانمی کیژی شاهەنشا بە گوێرەی دابی والی لەگەڵ خەلکی کوردستان رەفتاری دەکرد.کاربەدەست و پیاوماقولی وڵاتی لە ئەخلاق و کردەوەی خۆی رازی و شاد دەکرد. لەگەل حاکمی بابان بە گوێرەی یاسای والی‌یە قەدیمەکان دەبزوتەوە. لە بارەگای پاشا نازناوی 'والیە'-یان پێ بەخشی.

رەزاقولیخانی کوری خسروخان ئەو دەم دە ساڵ بوو، خەریکی فێربوونی ئەدەب بوو. فەرمان و حوکمی وڵات بە مۆری ئەو دەردەچوون. لەو ساڵانەدا باوکی، سەبارت بەم هۆیەی کە دەنووسری بابانی بەجێ هێشت و لە سنە نیشتەجێ بوو. چونیەتی روداوەکە وەهایە: وڵاتی بابان کە پاش راپورتی ئەردەلان باسی دەکرێ، سەرزەوییەکە لە سنووری ئێران و عوسمانیدا و هەمیشە جێگای کێشە و ناکۆکی ئەم دوو دەوڵەتە بوە. حاکمەکانی بابانیش وەك والیەکانی ئەردەلان لە زەمانی کونەوە بە سەر ئەم ولاتەدا فەرمانرەوا بوون بە گوێرەی هەل و مەرج پالیان وە

یەکێ لەو دوو وڵاتانە داوە.

کاتێك نورەی حکومەت گەیشتە مەحمود پاشای کوری عبدالرحمان پاشا، بە گوێرەی چاکزانی ومەسلەحەت، باوکی نووسەر کە بە بیر و باوەر هەمیشە لاینگری دەوڵەتی ئێران و یەکی لە نۆکەرانی نایب‌السلطنە عباس‌میرزای رەحمەتی بوە بەجارێك وازی لە پێرەوی 'هاونیشتمانی' عوسمانی هێنا و رەگەڵ دەرباری دەوڵەتی ئێران و پەنای نایب السلطنە کەوت. چەند ساڵێك هەروا تێ‌پەری. رومی دەرفەتیان هێناو هەر وەك لە کاتی راپورتی باباندا دەنووسری، مەحمود پاشایان گرت و ناردیان بۆ ئەستەمبول. باوکی نووسەریشیان حەبس کرد. بەتەد ٦٠ هەزار تمەنیان جەریمە لێ ئەستاند. پاش نەجات بوونی لە رێگای بەغداوە بەرەو ئێران کەوتە رێ و لە سنووری سامرا گەیشتە عەشیرەتی 'السعید'. شێخ سەعدونی گەورەی ئەوان ئەوپەری جوامێری و میوانداری بەجێ هێنا.

سەبارەت بە دوژمنایەتی لەگەڵ عەلی‌رەزا پاشای والی بەغدا(١) باسکرا لە بارەی تێپەر بوون بۆ لای ئێران دژوار بوو. لەبەر ئەوە لە دەوروبەری بەغدا لە عەشیرەتی ناوبراو هەلبرا و لەگەڵ زیارەتکەران قەسدی کرماشانیان کرد. پاش شەش رۆژ لە دەوروبەری قەسری شیرین ٣٠٠سوار لە جەماعەتی ئەحمەد وندی هاپان، بە فەرمانی سولەیمان پاشای حاکمی سولەیمانی بە سەریان وەربوون. پتر لە پەنجا سوار لەگەڵ باوکم نەبوو. کەسێك بەرگری کرا. چەند کەس لە هاورێیان کوژرا و برینداری کران. پاشان هەرچی هەمان بوو بە تاڵان بردیان. بە رووتی و بە پێیان گەیشتینە وڵاتی زەهاو کە سەرمتای خاکی عەجەمە. ئەو دەم تەمەنی نووسەر سی ساڵە بوو. بە قەدرایی دووهەزار تمەن ئالتون و سوارێیان لە رێگران شاردبووە، پاش رۆیشتنیان هینابویانە دەرێ. لە شاروچکەی زهاو هێندێ جل و بەرگیان بۆ خۆ و هاورێیان ئامادە کرد و رومان کردە کرماشان. پاش دوو رۆژ وەستان لەوی بەرەو کوردستان کەوتینە رێ‌خزم و دوستی ئەم وڵاتە بە تایبەت میرزا فەرەجولای وەزیر و خزمەکانی دیکەشی لە تایفەی وەکیلان، بو پێشوازی نارد. لەوپەری رێزدا هێنایانە شاری سنە. گەورە و بچوك و بەرز و نەزمی ئەم وڵاتە بە گوێرەی توانای خوی میوانداری هێلی بەجێ هێنا. شازادە والیەش ئەوپەری لوتف و مێهرەبانی نیشان دا.

ئەو کاتە سەرەتای پاشایەتی محمد شای خوالێخۆشبوو بوو. باوکی نووسەر چوە بارەگای پاتشا و کەوتە بەر کەرەمی شاهانە و لاواندنەوەی کاربەدەستانی دەولەت. هەشت سەد تمەن مرچە و سێ سەد تمەنیش نان و چێشت-یان دایە و هەموو ساڵێ لە مالیاتی ئازەربایجان ئەو پارەی پێدەگەیشت. ئیشەلا لە شوێنی دیکەدا باسی وەزعی خۆم دەکەم. ئێستا با وەگەڕێین بۆ چیرۆکی وڵاتی کوردستان.

پێشتر گوترا کە ڕەزاقولیخانی کوڕی خسروخان لە تەمەنی دە سالیدا بوو بە والی کوردستان و کار وباری وڵات و خەڵکیش بە میرزا فەرەجولا سپێردرا. شەش حەوت ساڵ وا تێپەڕی، ڕەزا قولیخان بوو بە پیاو. والیەی دایکی تویا خانمی خوشکی شاهەنشا کیژی نایب السلطنەی ڕەحمەتی بۆ خواست. خۆی لەگەڵ گەورەپیاوانی کوردستان چوە تاران تا بە داب و دەستوری پاتشایان بوك بگوێزنەوە و شایی بکەن.

پاش ئەو کارانە زۆری پێ نەچوو میرزا فەرەجولا کۆچی دوایی کرد. میرزا هیدایەتولای برا گچکەی ئەو بۆ بە بەرپرسی کار و باری وڵات. ساڵێکیش وا تیپەڕی. هێندی لە گەورەپیاوانی وڵات لە میرزا هیدایەتولاّ دڵگیر بوون و لە لای والی سکالایان کرد شەیتانیان لێ کرد. کەم کەم ناکوکی کەوتە نێوان والی و وەزیر.

لەو سالەشدا مەحمود پاشای بابان لە دەولەتی عوسمانی زیز بوو و لەگەل هەزار ماڵی گەورەپیاوانی وڵاتی بابان، پەنای بۆ دەولەتی ئێران هێنا و ڕوی کردە ئازەربایجان بۆ لای شازادە قارەمان میرزای حاکمی ئازەربایجان. ڕەزا قولیخانی والی و میرزا هیدایەت و خەڵکی کوردستان لەوە ئاگادار بوون و بە پەلە نامە و تەتەریان بۆ لای مەحمود پاشا نارد و داوەتیان کرد بۆ وڵاتی ئەردەلان و چونی ئەویان بۆ ئازەربایجان لە ڕەسمی عێلایەتی‌دا بە عەیب زانی. چونکە لە کاتی تەنگانەدا هەمیشە پەنایان بۆ ملکی یەکتر هێناوە. لەو لاشەوە باوکی نووسەر بە لای ئازەربایجان‌دا بوو، مەحمود پاشای بۆ چوونی ئەوی تیژ دەکرد.

پاشان لە دەوروبەری سەقز بای داوە بۆ لای کوردستان. لە هەموو مەنزل و جێگایەك لە لایەن والی‌یەوە پێشوازی تازەی بۆ ڕێك دەخرا. تا گەیشتە سنە. گشت خەڵکی شار بە مەلا و سەید و کاربەدەستەوە لەگەڵ والی تا دوو فەرسەخ بۆ پێشوازی وەدەر کەوتن و ئەوپەڕی ڕێز و

حورمەتی لێگیرا. چونکە باسەکەی ئێمە ئێستا راپورتی کوردستانی ئەردەڵانە، پاشماوەی ئەم باسە لە روداوەکانی بابانەدا باس دەکرێ.

بە کورتی رۆژ بە رۆژ نێوانی والی و میرزا هیدایەتوڵا ناخۆشتر دەبوو. والیەی داپکی والیش لە بەر چەن هۆیەك لایەنی میرزا هیدایەتولای دەگرت. ئەمانولاخانی کورەچکولەی کە بە غولام شاخان ناسراوە هەڵیگرت و لەگەڵ وەزیر و خەڵکێکی زۆر بۆ تاران رۆیشت. لەم لاشەوە والی لەگەڵ دەستەیەك خەڵکی وڵات رووی کردە تاران.

پاش دەمەتەقە و گفتگۆیەکی زۆر، حاجی میرزا ئاغاسی بەیات ئێرەوانی کە وەزیری خاوەن دەسەڵاتی ئێران بوو، لایەنی میرزا هیدایەتولای گرت. وایان بە باش زانی کە رەزاقولیخان ماوەیەك لە تاران بمێنێتەوە و میرزا هیدایەتوڵا بە تەنیا فەرمانرەوای کوردستان بێ. والیە و ئەمانولاخانیش لە بارەگای شا بمێننەوە.

دار و دەستەی رەزاقولیخان کە ئەومیان زانی، نێزیکەی ۶۰۰ کەس لە مزگەوتی شا مانیان گرت. کەسیش نەیدەتوانی دەستیان لێ بدا. چونکە ئەو دەم مزگەوتی ناوبراو "دارالأمان" بوو. هەرکەس لەوێدا با دەپارێزرا.

میرزا هیدایەت لەگەل تایفە و دارو دەستەی خۆی چونەوە کوردستان و هەژدە مانگ بێ بەرهەڵست حکومەتی کرد. پاشان شاهەنشای ئێران لەبەر خاتری خوشکی رەزاقولیخانی کردەوە حاکم و بریار درا کە خوشکی شا بچێتەوە کوردستان و ماوەیەکی تریش والی بچێتەوە.

لە لایەن شازادە خانم و رەزاقولیخانەوە، ئەمانولابەگی کوری فەتعەلیبەگی وەکیل بوو بە بەرپرسی کار و باری کوردستان و گەیشتە پلە و پایەی بابی. مرۆیەکی چرامێر و سەخی بوو. کاتی مانگرتنی مزگەوتی شا، ئەو ۶۰۰ کەسە لە سەر خەرج و سفرەی ئەو بوون. لە لایەن بارەگای پاتشاوە بلوکی ئەسفەنداوا کە لە نێزیکی هەمەدان و سەر بە کوردستان بوو درا بە غولام شاخان و میرزا هیدایەتولاخان و کەس و کاری ئەو. ناوبراو لەگەل قەوم و عەشیرەتی خۆی چوونە ئەسفەنداوا. شازادە خانم لەگەڵ وەکیل گەیشتنە سنە. بە گوێرەی داب و رەسمی وڵات خان و گەورەپیاوەکانیان خەڵات کرد. هەر کەسێکی لە کونەوە شوغل و پلە و مەنسەبێکی هەبوو، پێی بەخشرا. وەکیل گرنگی

زوری دەدا بە "ئاسایشی گشتی". پاش شەش مانگ والی لە بارەگای پاتشاوە ئیزن درا و گەڕایەوە بۆ وڵات. خەڵک بە هاتنەوەی ئەو شاد بوون. وەکیل و خزمەکانی گاو و گەردونیان لە پێش کرد. رەزاقولیخان لە کارزانی و لێهاتویی وەکیل فرە کەیفخۆش بوو. کار و باری وڵاتی کوردستانی بە تەواوی بە ئەو ئەسپاردرا. خۆیشی شەو و رۆژ خەریکی کەیف و رابواردن بوو. ماوەی دوو ساڵ لەوپەڕی سەربەخۆییدا رایبوارد. خۆی و خێزانی خەریکی خواردنەوە و رۆژگاری لە هەیش و نۆشدا دەبردە سەر بوون. چونکە ویستی هەرزەکاری و توانای لاویتی، والی توشی کردەوەی ناشایست دەکرد. شازادەخانم لەو بارەوە دڵگیر دەبوو جار جار نامەی بۆ "مهدی علیا"ی دایکی دەنووسی و سکاڵای دەکرد. وردە وردە لای پاتشا و حاجی میرزا ئاغاسی-ش ئاشکرا بوو. هەر چەند وەکیل ویستی بە تکا و بەڵگە والی لەو کارانە بگێڕێتەوە فایدەی نەبوو. لەولاشەوە دەیویست شازادەخانم دڵخۆشی بداتەوە و نسحەتی دەکرد. شەو و رۆژیش خەریکی کار و باری وڵات بوو.

چەند مانگێك ئاوا تێپەڕی. محمد شەریف خانی قاجار بە داوەتی شازادە و رەزاقولیخان لە تارانەوە هاتە کوردستان. وەکیل ئەوەندەی پێ هەڵاگوت و رێزی لێ گرت کە بە جارێك ناوبراوی لەگەڵ خۆی کردە هاودەست. لە بارەی نەزمی کار و باری وڵات و رازی بوونی خەڵك لە وەکیل و لە والی نامەی بۆ کاربەدەستانی وڵات نووسی، بەڵام فایدەی نەبوو. والیان بردەوە تاران و جارێکیدی حکومەتی کوردستان دراوە بە ئەمانوڵاخانی ناسراو بە غولام شا خان و میرزا هیدایەتوڵاش کرانەوە بە وەکیل و پیشکار. ئەمانوڵاخانولاخان لەگەڵ میرزا جەعفەری کوری میرزا هیدایەت بە پەلە هاتنەوە سنە. ئەو دەم میرزا هیدایەتوڵا ئیفلیج ببوو. و بەو حاڵەش لە سەر تەخت بۆ کوردستان کەوتە رێ. لە دوو مەنزلی تاران و گوندی ئیشتەهارد کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەیان بردەوە وڵات و بە دابی عێل ناشتیان.

چەند رۆژێك تازیەیان بۆ دانا. پاشان میرزا جەعفەر لەجێی باوکی دانرا و بوو بە وەزیر. لەو کاتەدا ئەمانوڵا بەگی وەکیل لەگەڵ عێیل و تایفەی خۆی چووبوە هەورامان و لە وێ نیشتەجێ ببوو. چاوەڕوانی فەرمانی کاربەدەستانی دەولەت بوو کە داخۆ بۆ دار و دەستەی رەزاقولیخان کوێ دیاری دەکەن.

شازادە خانم لە شاری سنە و لە دیوی ژووری "دارالایالة" بارەگای حکومەتیدا نیشتەجێ بوو چونکە غولامشاخانیش هەر لەو بارەگایە دادەنیشت، بۆ خزمەتکارانی شازادە بێ گیر و گرفت نەدەبو. نامەیەکی بۆ ئەمانولابەگی وەکیل نووسی و رایگەیاند کە چۆن رەوا دەبینی خوشکی شاهەنشا و خێزانی گەورەی خوت لە شاری سنە بە سووك و زەلیلی رابوێرن؟ ئەگەر دەتوانی چارەیەك بکە. نامەکەی بە پەلە گەیاندە وەکیل. ناوبراو لە بیستنی ئەو خەبەرە رەگی غیرەتی بزووت، نامەکەی بە گەورەپیاوانی وڵات نشان دا و تاوێك گریا و گوتی: سبەی لە خزمەت شا چون وڵامی ئەم نامەیە دەدەمینەوە؟ لە شەریعەتی دین و دەوڵەتدا چۆن رەوایە کە ئێمە مل بو ئەو خەراپەیە راکێشین، ئەوەی گوت و سەروك عێل و حەسەن سولتان و ئەحمەد سولتانی هەورامی بانگ کرد و روداوەکەی بۆ گیراونەوە. ئەوانیش یەك یەك بە دەنگ گوتیان: رێبەر و پێشەوای ئێمە وەکیل خویەتی. هەرچی ئەو بێژی وادەکەین و بۆ نەجاتی خێزانی والی خۆمان لیدا دەکەین. ئەومیان گوت و سوێندیان بە قورعان خوارد کە هەتا گیانیان دەبەردایە هەمویان لە ئەمری وەکیل سەرپێچی ناکەن.

بە کورتی ئەمانولابەگ ژن و منداڵی خوێ لە هەورامان دانا و لەگەڵ هەزار سوار لە عێل و کەس و کاری خوێ و دوو هەزار تفەنگچی هەورامی بەرەو سنە کەوتە رێ. ئەمانولاخان و میرزا جەعفەری وەکیل لە چوار فەرسەخی سنە لە هاتنی وەکیل ئاگادار بوون. عەلی محمدی ئامۆزای کە بە تەمەن لەو گەورەتر بوو، ئەمانولاخان هەمیشە رێزی دەگرت و وەپێش خوێ دەدا و رۆژ و شەویش لەگەڵ میرزا هیدایەتولای خالی رایدەبوارد و پاش مردنی ئەویش هەر لەگەڵ غولامشاخان دەبوو، پایەی وەکیلیشی پێ نەسپێردرابوو بەڵام خوێ دە هیچ کارێك هەل نەدەنواند، ناردیانە کن وەکیل و نامەیەکی پر لە وادە و بەلێنییان بۆ نارد. لە سێ فەرسەنگی سنە چاوی بە وەکیل کەوت و راسپاردەکانی والی تێ گەیاند. بەڵام ئامۆژگارییەکانی فایدەیان نەبوو. بێ ئاکام گەرایەوە. لەملاشەوە ئەمانولاخانی والی رێگای نەدا شازادەخانم وەدەر کەوێ. میرزا جەعفەر و کومەڵێکی زۆر لە سوارەی جاف بۆ شەر وەدەر کەوتن.

لە گوندی حەسەناوا هەرتك لا گەیشتنە یەك. بەر لەوەی شەر

دەست پی‌بکا، نێزیکەی دوو سەد کەس لە سوارەی لەك کە باوەر پێکراوی وەکیل بوون، هەڵاتن و چوونە پاڵ لەشکری والی بەوە لەشکری ناوبراو تەنکەی تێکەوت. کومەلێکی دیکەش لە سوارەی دەور و بەری بلاّویان کرد. وەکیل لەگەل تفەنگچی‌کانی هەورامی بەربەرەکانی بە قازانج نەزانی، پەنای بۆ چیای حەسەناوا برد کە پێشتر باسی کراوە. چیایەکی بیّ ئاوا، سانەوەی لەویّ دژوار بوو. نێزیکەی چوار سەعات شەریان کرد. پاشان هەورامیەکانیش پەروی شەرم و بەدناویان بەسەرشان دادا و بە جارێك لە کیو هاتنە خوار و چوونە خزمەت والی. کەمێك نەبی کەس لەکن وەکیلی نەمان. هەرچەند عبدوالحمید سولتان، کاربەدەستی ناوچەی بانە و ئەوانی تر هانیان دا کە بروا، لەبەر غیرەت و رەشیدی سەری دا نەنواند و خوّی بە ئەزا و قەدەر ئەسپارد. عبدالحمیدسولتانیش سواری ئەسپی خوّی بوو و تی‌ی تەقاند.

لەولاوە والی هیندی سەید و شیخ و مەلای بە قورعانەوە ناردە کن وەکیل و سوێندی بۆ خوارد کە بێجگە لە چاکە هیچ خەراپەی لەگەل نەکات. ئەوان چون و وەکیل‌یان دلنیا کرد و هێنایانە کن والی. لە پێشدا گەلێك ریّزی لیّ گرت. لە پەنا خوّی دانا. پاش دەمێك چونەوە شار. لە ریگادا میرزا فەتاحی کوری میرزا فەرەجولای وەزیر، سەرەرای حزمایەتی لەگەلّ وەکیل هاتە خزمەت خان و گوتی: ئەگەر ئەمانولا بەگ بەم کش و فشەوە بیتە نێو شاری سنە ئێتر واز لە نوکەری من بێنە. چونکە ئەگەر ئەوان سەرکەوتبان، ژنەکانمان هەر یەکەی لەدەستی سوارمیەکی ئەواندا دەبوو. والی توڕەیّ بێری کردەوە بەلاّم لە قسەی ئەو دەر نەچوو. ناچار ئەمری کرد شمشیری لیّ بکەنەوە و کلاّویشی لە سەر هەلگرن. دووبارە کەمێك بۆ نەشکاندنی ئەو کلاوەکەی لەسەر ناوە کور و برازا و خوارزاکانیشیان گرتن و هینایانن. لە پەنا شاری گەیشتنە نێزیك خانوبەرەی وەکیل، عەلی محمد بەگ کە پێشتر باسی کرا تی‌دا دادەنیشت. کور و برازا و کەس و کاری بە عەلی محمد بەگ ئەسپارد و ئەمانولاتبەگی بە پی‌یان وە پێش ئەسپدا. دوو سیّ سەعات لە شەو چووبوو گەیشتنە بارەگای حکومەتی. وەکیلی دە دیوێکی کرد و پاش هەژدە روژان لە نێوەشەودا بە دەستی دوو کەس لە بەردەستانی خوّی کوشتی. چەند روژێك مەیتەکەی هەر لەو شوێنە ماوە کە لی‌یان کوشتبوو. کەم کەم ون بوونی وەکیل کەوتە سەر زاران.

شەوێك حەمەمین بەگی کوری جەمشید بەگی کە ئەویش لە تایفەی وەکیلان بوو، بانگ کرد و دوو مەلای رەگەل خست، مەیتی وەکیلیان پاش شوشتن و تەلقین لە گورستانی شێخان بە خاك ئەسپارد.
کور و برازا و خوشکەزایان کە بەم زوانە باسیان دەکرێ، بردە بەندیخانە و کوت و زنجیریان دە لاق و مل کردن. خێزانی میرزا فەرەجولای خوا لێخوشبوو بەزەیی بە حالیان دا هات و لە لای والی تکای بۆ کردن و لە بەندیخان نەجاتی دان و بردنی بۆ مالی خوی و زوری چاکە لەگەلّ کردن. لەو کاتەدا ناوچەی ئەسفەندئاوا، لەلایەن بارەگای شاوە درا بە کەس و کاری رەزاقولیخانی. شازادە والیەش لە تارانەوە گەراوە بۆ کوردستان. وەك دەلێن هێندێ لە باوەرپێکراوانی والیە لەبارەی کوشتنی کوری وەکیلی نامەیان بۆ والی و بۆ میرزا جەعفەر نووسی. ئەو کارەی بە میرزا رەزای کوری میرزا هیدایەتولاّ کردوە. لەبەر ئەوە کە لەم جیهانەدا شت ون نابێ، ئەم باسەش لە نێو خەلکدا بلاو بووە.
باوکی نووسەر لە هەموو بارێکەوە دەچووە سەر تایفەی وەکیلی. تازەش کیژی ئەو بیوە دەزگیرانی کوری وەکیلی، لەم کارە نارەحەت بوو، لەگەل غیرەت و دەماری عەشیرەتی ئەدەمفاتەوە. نیوەشەو دوو سێ کەسی بۆ نەجاتی ئەوان نارد. خوشی لەگەل چل سوارەی پەرداخ و ئامادە لە پەنا بەندیخانە راوەستا کە ئەگەر هەرای لی ساز بوو، بە زوری رزگاریان بکا. ئەو دوو کەسە بە هاسانی دیواری لای چولیان بری و ئەوانیان هێنا دەری و بۆ ئەو شوێنەیان بردن کە باوکی نووسەر لە دەرەوەی شار دیاری کردبوو. لەگەلّ دە سوار ناردنی بۆ نێو عیلی جاف کە ئەودەم حەمەبەگ گەورەیان بوو. لە یازدە فەرسەخی شاری سنە لە کوێستانی بوو. دوای شەش روژ خوشی چوە لایان و لە ویوە چوونە کن حەمەسولتانی حاکمی سەلز.
لەوی تازیمانەی وەکیلی رەحمەتی گیرا و پاشان گەرانەوە بۆ نێو عێلی جاف پەنا دەریاچەی مەریوان. حەمەبەگ، عبدولرحمانی برای لەگەل سەد سواری بە کار رەگەل خست و بە شەو و روژێك سێ فەرسەخ رێگایان بری و گەیشتنە خاکی گەروس. لە وێشەوە بە سێ روژان گەیشتنە ئەسفەندئاوا. لە خزمەت شازادەخانمێ دیسان بۆ وەکیل تازیمانە گیرا.

پاش سێ مانگ ڕەزا قولیخان جارێکی دیکەش کراوە بە حاکمی کوردستان و بە سێ شەو و ڕۆژ گەیشتەوە کوردستان. ئەمانوڵاخان و شازادە والیە بە زەحمەت و دژوار، بە زستانی چونە سونقور. هێندێک لە لایەنگرانیان گیران. جەعفەرخان کە لە ئاموزاکانی والی و ئاتلی وەکیل بوو لەگەڵ چەند کەسی‌تری کە ئەومیان کردبوو کوژران.

ئەودەم تازیمانەی وەکیلیان نوێ کردەوە و بە گوێ ڕەی داب و ڕەسمی هی لایەتی والی و هەموو خەڵک جلی ڕەشیان لەبەر کرد سەریان دە قوڕ نا. پاش تەواو بوونی تازیمانە ئەسەدوڵا بەگی کوڕی ئەمانولابەگی وەکیلی لە جێی بابی دانا و خەلاتی کرد و دەسەلاتی وڵاتی دایە. ئەو دەم لەبەر ئەوەی تەمەنی لە ۱۸ ساڵ پتر نەبوو، بە کار و باری وڵاتی ڕانەدەگەیشت، حەمەسولتانی حاکمی سەقزی کە پیاوێکی بە ئەزموون و لە گەورەپیاوانی وڵات بو، تازەش کیژی وەکیلی لە حەمەعەلیخانی کوڕی مارە کردبوو، لە لایەن ئەسەدوڵا بەگی وەکیلەوە کرا بە بەرپرسی کار و باری کوردستان.

بە کورتی ڕەزا قولیخان ماوەی ساڵێک لەوپەری سەربەخوییدا ڕایبوارد. چونکە لەو ساڵانەدا بەهمەن‌میرزای حوکمرانی ئازەربایجانی برای شای ئێران حاجی میرزا ئاغاسی بە یاخی ئاوانبار کردبوو، ڕەزاقولیخانیشی بە هاودەستی ئەو ناسیبوو، لە کاتێکدا دەستی لەو خەیالەدا نەبوو، خسروخانی گورجی بە بیانووی نەزمی سنوورەکان بۆ ئەو مەلبەندە نارد. والی داوای چاوپێکەوتنی کرد و لە سایەتەلای سنووری هەوشار چوە کنی. پاش ڕۆژێک خسروخان گرتی و لەگەڵ عەباسقولیخانی گەرووس بۆ تارانی نارد. خۆشی بە بێ کۆسپ چوە سنە و دەستی بە حکومەت کرد.

هێندێ لە گەورەپیاوانی وڵات، وەک ئەسەدوڵابەگ و فەتحولابەگی وەزیر و براو ماڵ و منداڵی والی چونە وڵاتی بابان و پەنایان بۆ عەولاپاشای حاکمی بابان برد.

ناوبراو ئەوەی پیاوەتی بوو لەگەڵیانی کرد و ئاگاداری کردن. هەر چەند کاربەدەستانی دەوڵەتی ئەیان دەهێشت کەس و کاری والی ڕابگری و بیان پارێزێ قبولی نەکرد. تا بە قاسیدەکانی والی بەغدای گوت: نیشانی دەوڵەتی و پایەی حکومەتی وەلا دەنێم، بەڵام پەنابەرانی وڵاتی بابان وەلا نانێم.

له سنەش عەلی حەمەبەگی خالی وەکیل هێندی سەید و مەلا و شێخی هەلگرت و رای کردە تاران. داوایان لە شاھنشا کرد کە رمزاقولیخان بگەرێنەوە. هەرچەند حاجی میرزا ئاغاسی و کاربەدەستانی تری دەولەت ئامۆژکاریان کردن فایدەی نەبوو، ئاخرەکەی چەند کەس لە گەورەپیاوانی وەك عەلی حەمەبەگ و ئەسەدولابەگ و براکانی والی-یان بردە خزمەت پاشا. شا خۆی وەجواب هات و تاریفی خسرو خانی کرد. عەلی حەمەبەگ لە نێو ئەواندا وەدەنگ هات و عەرزی شای کردکە ٨٠٠ ساله ئێمە ئەمیر و حوکمرانی کوردستانین و بە گوێرەی یاسای عێلی رەفتار دەکەین. ئێستا رمزا قولیخانیش هەر بە شێوەی باب و باپیرانی رەفتاردەکا. ئەگەر زولمێکی کردبی لە خۆی کردوە، ئەگینا رەعیەت و خەلکی ولات لەوپەری ئاسودەییدا بوون.

قسەکانیان لەکن شا پەسەند نەکرا و لە چوونەوەیان و خزمەتی خسروخان پێی داگرت. عەلی حەمەبەگ حاشای کرد و گوتی: تا گیانمان لەبەردایە، بێجگە لە رمزاقولیخان سەر بۆکەس نەوی ناکەین.

ئاگری تورەیی پاشای عەجەم گری لێ هەستا و بە میرغەزەبی گوت دار و فەلاقە بێنن و عەلی حەمەبەگیان لە داری بەست و نێزیکەی جەوت هەزار داریان لێدا. ئاخرەکەی بە تکای سەدری ئەردەوێلی بەخشرا. پاش چەند رۆژ ناویراویان لەگەل جەعفەری قولیخانی ئەمیرالامرا بە بەندی ناردیانەوە بۆ کن خسروخان. بە نهێنی ئەسپاردیانن کە ئاگایان لیێ بێت.

کوردستانیەکانی تر کە وایان زانی، نێزیکەی ٨٠٠ کەس گەورەو بچوك لە مزگەوتی شا مانیان گرت. لە بارەگای شاوە فەرمان درا بە میرزا ئەبولقاسمی ئیمامی جومعەی تاران لە مزگەوتیان وەدەر بنێ. ئیمامی جومعە ئیحترامی مزگەوتی لەبەر چاو گرت، تکای بۆ کردن، قبول نەکرا. دوبارە فەرمانی وەدەرنانیان درا. هێندی لە شازادە و فەرماندەی لەشکری چوونە مزگەوت میرزا ئەبولقاسمیان دلخۆشی داوە و چەند رۆژێك فەرمانەکەیان وەدوا خست.

ئەو دەم شا لە کوێستانی شمیران نەخۆش بوو. حەکیم لە عیلاجی داما بوون شەوی شەشی مانگی شەوالی هەزار و دووسەت و شێست و چواری کۆچی وەبەر رەحمەتی خوا کەوت. ئەودەم رمزاقولیخان لە

گوندی تەجریشی شمیران دادە نیشت. هێندی توپچی کێشکیان لە دەور و بەری ماڵەکەی دەکیشا. کوردستانیەکان کە هێندی لە مزگەوتی شا و هێندی لە عەبدولعەزیم مانیانگرتبوو، کۆ بوونەوە و گشتیان چوونە تەجریش. توپچیەکانیان ترساند و رایان کرد. والیان هەلگرت و چوونە نێو قەوچی کەروس، ئەوانیان رەگەل خۆ خست و بە نیوەشەو بەرەو کوردستان کەوتنە رێ. روژی پێنج و شەش والی گەیشتەوە پەك فەرسەخی شاری سنە. خوسرەوخان فرە ترسا و پەشوکا. عەلی حەمەبەگی لە زیندان هێنا دەر و داوای لێ بووردنی لێ کرد. لەو لاشەوە خەبەری بۆ والی نارد کە هەتا خوسرەوخان لەو شارەیە، تۆ مەیە نێو شار و زیادتر شا لە خۆت توورە مەکە. خسرەوخان بارگە و بنەی تێك‌نا و لەگەڵ قەوچی هەمەدان رێگای زەنگانی گرتە بەر و بۆ پیشوازی شاهەنشای نوێ ناسرالدین شا کەوتە رێ.

رەزا قولیخان گەیشتە نێو شاری سنە. کار و باری ولاتی بە عەلی حەمە بەگ ئەسپارد و لەقەبی خاوەن دەسەلاتی پێ بەخشی. خۆشی وەك جاران دەستی کرد بە رابواردن و سەرمەرپەتی و بە جوریك کە خوی بیست ساڵ هیلاك کرد. ئەم روداوە بەم زوانە باس دەکرێ.

بە کورتی کاتێ ناسرالدین شا لە سەر تەخت دانیشت، میرزا تەقیخانی فەراهانی بوو بە ئەمیرلەشکر و وەزیری کشوەر. ئەمانولاخانی برا چکولەی والی ئەودەم لە تاران دەژیا، پەنای بردە بارەگای ئەمیر نیزام و لەوی مانی گرت. لەو لاشەوە ئەمیر و کاربەدەستانی تری دەولەت دەیانویست رەزاقولیخان سەبارەت بە سەربادانی سەزا بدەن. بەلام لە دەرفەت دەگەران کە بە هاسانی ناوبراو وەدەست بێنن. بە هەلکەوت میرزا ئالاقولیخان کە لە تایفەی وەزیرانی کوردستان بوو، لە لایەن رەزاقولیخانەوە بۆ عورزر خواستنەوە بە دیاری و پێشکێشەوە گەیشتە تاران. میرزا تەقیخانی ئەمیر بانگی کرد و لە بارەی رەفتاری والی و بار و دوخی خەڵك و وڵات پرسیاری لێ کرد. ناوبراو کە لە بنەوە لە رەزاقولیخان دلگیر بوو گوتی: کە والی یاخی بوە و خەریکە چیای هەورامان بکاتە پێگە و لەگەڵ دەولەتی عوسمانیش رێك کەوتوە. گەورەپیاوانی وڵات لەگەڵ ئەو هاودەنگ نین. ئەگەر وەدەنگیش نایەن لە ترسانە. ئێستا بە گوێرەی قسەکانم نوسراوەیەکم لە لایە، ئەگەر دەفەرموی سبەی دەیهێنم.

میرزا له قسەکانی فرە تورە بوو. گوتی دەبی ئەو نوسراوەیە بێنی. میرزا ئالاقولی دوو کاغەزی سپی مورکراوی والی لە بەر دەست بوو تا له کاتی پێویستدا چی بە باش زانی لیّیان بنووسی و بۆ کاربەدەستانی دەولەتیان بنێری. هاتە سەر ئەوەی کە ئەو فەقیرە بە گرتن بدا.

شەوی هەر وەك بە ئەمیری گوتبوو، دوو نامەی لە قەولی والی بۆ خوی نووسی و لە نامەکاندا نووسی کە لەکن ئەمیر زۆر خۆت بەکەم مەگرە. ئەگەر بەخۆشی خەلات و نشانی حکومەتیان بۆ من نارد ئەوە باشە، ئەگینا رابگەیینە کە چیای هەورامان ئەوەندە بەرزە کە جیرانی ئاسمانە. بەیانی چوە لای ئەمیر و نامە سازکراوەکانی دایە.

رۆژی دوایە میرزا تەقیخان نامەکانی بردە کن شا. فەرمانی لیٚخستن و گرتنی رەزاقولیخان دەرچوو. خەلات و نشانی حکومەتی کوردستانی دا بە ئەمانولاخان.

شەو ئالاویردیخان سەرهەنگی تۆپخانەی لەگەلْ سەد تۆپچی رەگەل خست و بە سێ شەو و رۆژان گەیشتە چوار فەرسەخی سنە. والی هێشتا لە عەیش و نۆشدا بوو کە خەبەری هاتنی ئەوانی بۆ هات. بە زەحمەت مال و مندالی بردە دەر و بەرەو کرماشان کەوتە رێ. لەولاشەوە ئەمیر نامەی بۆ گەورەپیاوانی ولات نووسی و پشتیوانی رەزاقولیخانی لیٚ قەدەغە کردن. بە تایبەت حوکمیکی دلدانەوە و میهرەبانی بۆ ئەسەدولابەگی وەکیل نووسی. لەگەل ئەوەش چونکە وەکیل تەواو لە ئەمانولاخان دەترسا، خوی پیٚ را نەگیرا و لەگەل والی تا سنوری کرماشان رویشت. رۆژی دوایە ئەمانولاخان هاتە نێو شار. گەورە و بچوکی ولاتی بانگ کرد و موحیبەتی نیشان دان. سەبارت بە کردەوەی رابردووی داوای لیٚبووردنی کرد. عەلی حەمە بەگ و باوکی نوسەری هێنا. لە بارەگای وەکیل و نەختێ قسەی بۆ کرد. سوێندی خوارد کە ئەگەر لەجیاتی خوێنی باوکی نەفسی خومیشی بوێ، دریغی ناکەم. دەمەوێ ئەو پەلە رەشە لە خۆم بشومەوە. ئەوەی گوت و نامەیەکی بە خەتی خوی بۆ ئەسەدولا بەگی نوسی و تەواوی بۆ رون کردەوە. میرزا ئەلا قولی وەزیر و مەحمود بەگی دیوان بەگی کە لە باوەر پێکراوانی بون، ناردینە کن وەکیلی. ئەو دوو کەسە بە پەلە وەرێ کەوتن و لە ئاخیری خاکی کوردستان گەیشتنە وەکیل. قسەکانی

والیان پێ ڕاگەیاند. ناوبراو دڵی بۆ کەرانەوە نەرم بوو، بۆ خزمەت ئەمانولا خان ڕێگای داگرت. والی بۆ چاو پێکەوتنی چوو. لە پەنا خۆی دانا. لە کردەوەکانی عوزری هێناوە و خەلاتی بەنرخی دایە.

بە گشتی ئەم جارە بە پێچەوانەی ڕابردوو، والی ئەوەندە لەگەل خەڵك باش و میهرەبان بوو کە لە ماوەیەکی کەمدا پێیان لە والیەکانی پێشوو باشتر بوو. گەورەو بچوك لەوبەری ڕاستیدا خزمەتیان دەکرد. لەولاشەوە ڕەزاقولیخان چوە کرماشان و پەنای بۆ فەیروز میرزای نایب السلطنەی حاکمی ئەو وڵاتە برد. شازادە چەند ڕۆژێك ڕای گرت. لەنەکاو لە بارەگای پاشاوە ئەمر دەرچوو کە ڕەزا قولیخانی بە حەبسی بۆ تاران بنێری. هەر ئەو ڕۆژە شازادە ناوبراوی لەگەل چەند کەسان بەرێ کرد. هاورێکانی هێندیکیان ڕایان کرد و هێندیکێش ئەمانیان خواست و ئەسپ و چەکیان لێ ئەستاندن و بەرەلایان کردن.

کاتێك والی گەیشتە نیزیك تاران نەیانهێشت بچێتە نێو شار، بەرێیان کرد بۆ تەوریزی و لە توپخانە بەندیان کرد و حەوت سال لە زینداندا مایەوە. پاشان هێنایانەوە تاران کە لە شوێنی خۆیدا باسی دەکرێ.

بە کورتی پاش ڕەزا قولیخان، ئەمانولا خانی ناسراو بە غولامشاخان باش بە سەر کار و باری خۆیدا زال بوو. لەگەل خەڵك ڕەفتاری باش بوو. یەك دوو سال عەلی حەمە بەگی کرد بە پێشکاری وڵات. ناوبراو لە ڕێك و پێك کردنی وڵات و ئاسایشی حالی خەڵکدا فرە شێلگیر بوو.

لە سالی سێیەمی پاشایەتی ناسرالدین شادا میرزا تەقیخانی ئەمیرکەبیر لە وەزارەت لابرا و میرزا ئاغا خانی ئیعتمادالدولە بوو بە سەدری ئەعزەم. کاتێ کە سەدری ئەعزەم بە حوکمی پاشای ڕەحمەتی لە کاشان دانرا بوو، شازادە والیە دایکی ئەمانولاخان لە تاران چاکەی لەگەل کەس و کاری ئەو کرد بوو. ئەم جارە کە بوو بە سەروکی گشتی وڵات، بە تولەی ئەو چاکەیە لەگەل ئەمانولاخان فرە میهرەبان و باش بوو. نوێنەرایەتی کار و باری وی بە میرزا کازم خانی نیزام الملکی کوری خۆی ئەسپارد.

سالی ١٢٦٧ ئەمانولاخان وەزارەتی کوردستانی دا بە میرزا محمد ڕەزای کوری میرزا عبدالکەریمی کە باسی ژیانی ئەو لە ژێر باسی

ئەمانولاخانی گەورەدا نووسرا.

ناوبراو پیاوێکی لیّهاتوو بوو. ئەو خەرجەی کە بریار درابوو بدری بە دیوان، بیّ کەم و زۆری دەیگەیاند و والی و کاربەدەستانی دەوڵەتی رازی دەکرد. وای لیّهات کە پلە و پایەی ئەو لە هەمو گەورەپیاوانی کوردستان هەورازتر چوو. کەس نەیدەتوانی یەك و دووی لەگەل بکات. قسەکانی لەلای والی وەها جیّیان گرتبوو کە بە بیّ ئیمزای ئەو هیچ کارێك بەرێوە نەدەچوو. لە کاری خۆیدا باش بەتوانا و بە ئاسودەیی کار و باری وڵاتی بە رێوە دەبرد.

عەلی حەمە بەگ ساڵی١٢٧٢ی کۆچی دوایی کرد. کابرایەکی ژیر و لیّهاتو و بە کار بوو. کاتی مانەوەی لە ئیسفەهان لە خزمەت شازادە سەیفالدولەدا، کاری گەورەی پیّ ئەسپێردرا. بە ئەدرایی بیست هەزار تمەنی لەو سەفەرەدا بۆ عیّل و کەس و کاری خەرج کرد. ماوەی هەشت ساڵ لەگەل والی راست و دلپاك بوو. تا ساڵی ١٢٧٤ سەدری ئەعزەم لیّکەوت و کار و باری والیش تووشی ئالۆزی هات.

پێشتر نووسرابوو کە ئەمانولاخان لە سەرەتای حکومەتیدا گەلێك پارێزکار و بەدین و لەگەل خەڵك باشبوو. وەدوای کاری ناحەز و سوك نە دەکەوت. هەر چەند لەو ساڵانەدا خودا تەخلالی باشی ئەوی وەرگێرا. دەستی بە کاری ناحەز کرد. لەپێشدا بە قسەی هێندی باوەرپێکراوی خۆی لە میرزا محمد رەزا وەشك کەوت و لە بنەوە خەریك بوو بیفەوتێنی. رۆژ بە رۆژ ساردییان کەوتە نێوان.

ساڵی ١٢٧٥ پاشا ڕێی کەوتە شاری سنە. ئەو دەم بەشی لەشکری پاشا ئازوقە وەگیر نەکەوت. ئەوەش نەهامەتێك بوو بە سەر کاری والیدا هات. هەر لەو ساڵەدا ئەسەدولا بەگی وەکیل سەبارەت بە موچە و بەراتێکی کە لە دیواندا هەیبوو ئیجازەی لە والی وەرگرت و چوە تاران. هێندی لە زانا و گەورەپیاوانی کوردستانیش لە بنەوە لە گەلّ نەجەفقولیخانی کوری حەمەحەسەنخانی کوری ئەمانولاخانی ئاموزای والی بوونە هاودەست و چەند نامەی سکالایان بۆ کاربەدەستانی دەوڵەت نووسی و لە دەست رەفتار و کردەوەکانی والی هاواریان هەستا.

هەر چەند وەزیر لەگەلّ ئەوان یەك نەبوو، بەلاّم نەیدەویست ولامیشیان نەداتەوە. لە لای دیکەوە ئەسەدولا بەگی وەکیلیش لە تاران

دەستی بە داد و فیغان کرد و لە داگیر کردنی ملك و پلە و پایەی خوّی شکایەتی کرد. میرزا یوسفی مستوفی الممالك رووی مەرحەمەتی تێکرد. موچە و براتی دایکیشی دایە و بردیە کن پاشا بە لەقەبی خان و خەلاّت و فەرمانی وەکیلی کوردستانیشی سەربەرزی کرد.

## وەزارەتی ئەبولقاسم

عەزیز خانی موکری سەرداری تەواوی ئەوج و لەشکری ئێران کە ئەو دەم پێشکاری ولاّتی ئازربایجان بوو، ئەویش دلی لە والی ئێشا. چونکە والی بە بیّ سووچ و تاوان حەمە عەلیخانی سەقزی کە یەکی لە نێزیکانی سەردار بوو حەبس کرد. بە کورتی خوّی لیّخستنی والی لە هەمو لاوە ئامادە بوو. لە پێشدا لە بارەگای پاشاوە میرزا ئەبولقاسمی مستوفی تەفرشی بوّ وەزارەتی کوردستان دەست نیشان کرا و ریّگای کوردستانی گرتە بەر. میرزا محمد رەزا گەرایەوە بوّ تاران. چەند روّژی پیّچوو فەرمانی لیّخستنی والیش دەرچوو. نەجەفقولیخانی ئاموزایان کرد بە حاکمی کوردستان. ئەمانولاّخان مالّ و منداڵ ودەست و پێوەندەکانی هەلگرت و بەرەو تاران کەوتە ریّ. لەولاشەوە میرزا ئەبوالقاسم لە تارانەوە و نەجەفقولیخان لە جوانروەوە گەیشتنە سنە. گەورەپیاوانی ولاّت وەك حەمە عەلیخانی سەقزی و میرزا عەلی دیوان بەگی و خەلگی تر چونە دیتنیان. پاش ماوەیەك ئەسەدولاخانی وەکیلیش گەرایەوە کوردستان و هەمو تێکرا خەریکی بە رێوە بردنی کار و باری ولاّت بوون و کەم و کوریان لە کاردا نەبوو. لەلای تریشەوە میرزا حەمە رەزا گەیشتە تاران و والیش بە دوای ئەودا.

میرزا حەمە رەزا بە باشی نەزانی لە تاران دابنیشی، چوە عبدوالعەزیم و خوّی بە عەرزی دادا. ماوەیەك لەم جێگا پیروزە تاق کەوتەوە. پاشان بە تکای مستوفی الممالك هاتە دەر و لە سەر ویستی سەرداری گشتی چوە ئازەربایجان. ماوەیەك لەوی مایەوە. وردە وردە دلّئێشی سەرداری لە والی چاك کردەوە و داوای کرد ئەمانولاخان بکرێتەوە بە حاکمی سنە.

نێزیك بهار سەردار بەرەو تاران کەوتە ریّ. هەر چەند نەجەفقولیخان لە شاری زەنگان خوّی گەیاندیّ و خزمەتکاری خوّی پیّ راگەیاند، بەلاّم میرزا حەمەرەزا وەها والی لە لای سەردار

خۆشەویست کردبوو کە خزمەتگوزاریەکەی نەجەفقولیخان کاریگەر نەبوو. بە رواڵەت دڵنیای کرد و ناردیەوە بۆ وڵات. والی هاتە خزمەتی و لە کردەوەی رابردوو داوای لێبووردنی کرد.

## باسی حکومەتی ئەمانوڵلاخان جاری دووهەم بەهۆی سەردارەوە.

پاش ئەوەی سەردار گەیشتەتاران چوە خزمەت شاهەنشا، داوای حکومەتی ئەمانوڵلاخانی کرد. چونکە ئەو دەم وڵاتی ئەردەڵان بەشێك بوو لە وڵاتی ئازەربایجان. کاربەدەستانی دەوڵەت داوای سەردارپان پەسند کرد و جارێکی دیکەش خەڵات و نیشانی کوردستان درا بە والی. میرزا حەمەرەزاش بووە بە وەزیر و بێجگە لەوە هاتە ریزی مستوفیيە گەورەکان(١) و نەجەفقولیخان بۆ خزمەتی شا بانگ کرایەوە و کرا بە سەر کێشکچی موزەفەرەالدین شای وەلیعەهد و دەگەڵ سەردار چوە ئازەربایجان. پاش هەشت مانگان لە تەوریزی کۆچی دوایی کرد. میرزا ئەبولقاسم-یش لە سنەوە بەرەو تاران کەوتە ریی و لە ریگادا فەرمانی وەزارەتی هەمەدانی پی‌گەیشت و لە وێ مایەوە.

ئەمانولاخان و میرزا حەمە رەزا هاتنەوە کوردستان و دەستیان کرد بە حکومەت. پێشتر باسکرا کە والی دەستی بە کاری دزێو و خراب کردبو. ئامۆژگاری دوستانی لە لا بێنرخ بوو. دەست درێژی بۆ ژن و منداڵی خەڵك دەکرد. پاش گەرانەوەشی دەیویست ئەوانەی لەگەڵ نەجەفقولیخان یەك بوون، سزایان بدات. بەلام لە سزادانی کاربەدەستانی دەوڵەت ترسا بوو لە دەرفەت دەگەرا. هەمیشەش لە میرزا عەلی دیوان بەگی لە بیانوو بوو، چونکە ئەوی بە تێکدەری بناخەی حکومەتی خۆی دەزانی. میرزا حەمە رەزاش کە ساڵەهای ساڵ پشتیوان و پارێزگاری بوو، دەستی لە پشتیوانی هەڵگرت و بۆ گرتن و بەند کردن لەگەڵ والی رێك کەوت.

ئەو میرزا رەزا عەلیە کە لە سەرەتاوە سەر بە میرزا حەمە رەزای وەزیر بوو، خۆشی کابرایەکی لی‌هاتوو و بەکار بوو لە ماوەیەکی کەمدا گەیشتە پلە و پایەی بەرز زۆر جار کار و باری وڵات بەو دەسپیردرا. لە دیوانی بەرز لەقەبی دیوان بەگی پێدرا. مووچەی بوو بە

سێ سەد تمەن. بەڵام والی بە دڵ لەگەڵی باش و پاك نەبوو. لە بەر خاتری وەزیر ماوەیەك رای دەبوارد لەم دواییەدا کە لێ کەوت و رەگەڵ نەجەفقولیخان کەوت، ئیتر وەزیر نەیتوانی پشتیوانی لێ بکا. بە پێچەوانەی رابردوو لە کردەوەکانی نارازی بوو. میرزا رەزا خۆی پێ را نەدەگیرا و لە مەجلیس و کۆبوونەوان قسەی ناحەزی بە وەزیر دەگوت. شەوێکیان والی بانگی کردە مەجلیسی تایبەتی خۆی و قسەی لەگەڵ کرد. توزێك باسی رابردووی کرد. پاشان عەلی ئەکبەر خانی ئاموزای تێکەیاند. یەخەی گرت و رایکیشا دەری و بردیە بەندیخانە. زنجیر لە مل و کۆتیان دە لاقی کرد. کور و کەس و کارەکانیشی گیران. لە ماوەی دوو سانگاندا بە تەرایی دوازدە هەزار تمەنیان لێ ئەستاند. پاشان بە تکای شێخ محەمەدی فەخر العلما لە بەندیخانە ئازاد کرا و لە مالی ئەوان دانیشت. پاش ماوەیەك بە جارێك عافو کرا و چووە مالی خۆی. لە دوایە رای کرد بۆ تەوریز و دەست بە داوێنی سەردار بوو.

لەو کاتەشدا ئەسانولاخان بۆ خواستنی کیژی پاشاخانی شجاع‌الملکی برازی سەرداری چوە تەوریز. هەر لەو سالەشدا شازادە والیە لە تاران مرد و تەرمەکەیان هێناوە کوردستان و لەویشەوە ناردیانە کەربەلا. بە کورتی والی لە تەوریز کیژی شجاع الملکی خواست و لەگەڵ سەردار پەیمانی نوێ کردەوە. هەروەها داوای کرد میرزا رەزا عەلی-ش بەرێتەوە. سەردار ناوبراوی دڵخۆشی داوە و لەگەڵ والی بەرێی کردەوە.

بە نهێنی هەرەشەی لە والی کرد کە لەگەڵ خەڵکی کوردستان رەفتاری باش بێ. پاشان لە سەعاتێکی باشدا بوکی هەلگرت و رێگای کوردستانی گرتە بەر. هەر لەو ساڵەشدا بۆ ئەهیشتنی دلێشی، والی گەوهەر سولتان خانمی کچی لە میرزا یوسفی کوری حەمە رەزا مارە کرد و بە جەیازی تەواو بوی نارد. بەم حالەش حاکم و وەزیر لەت نێوانیان خۆش نەبوو.

ساڵێك ئاوا تێپەری. والی چوە تاران و کار و باری خۆی رێك خست و گەرایەوە. ئەسەدولا خانی وەکیل لەگەڵ چەند پیاو ماقول لەکن مستوفی الممالك مانەوە. لەو لاشەوە میرزا رەزا عەلی لە سنە هێندی زانایانی کوردستانی وەك: مەلا فتح‌الله قازی و مەلا لوتف‌اللەی کوری و مەلا حەمەمین و مەلا سالح و برازایانی مەلا ئەحمەدی شێخ

الاسلام و هی تر کۆ کردەوە و یەکیان گرت و بە زستان رایان کرد بۆ تاران. سوێندیان خوارد هەتا والی لە سەر کار لا نەبەن بۆ کوردستان ناگەرێنەوە. ئەوەیان گوت و بە پەلە بەرەو تاران کەوتنە رێ. مەلاکان لە عەبدولعەزیم خۆیان بە عەرزی دادا. میرزا عەلیش پەنای بۆ تەویلەی پاشا برد. کاربەدەستانی دەولەت لەو کارە ئاگادار بوون. بە فەرمانی پاشا مستوفی الممالك دلنیای کردن و بانگی کردنە مەجلیسی خۆی و ئەحوال پرسی کردن. لەو رۆژەدا میرزا رەزا عەلی ئەوەندەی باسی کردەوە و رەفتاری دزێو و ناحەزی والی کرد کە دانیشتوانی مەجلیس والیان ورما. داوای بار سووکیەکی بۆ خەڵکی کوردستان کرد.

رۆژی دوایە مەلاکان هاتنە لای پاشاو کردەوەی والی‌یان بۆ شا باسکرد. میرزا رەزا عەلی و هی‌تریش راوستابوون و سکالای حالی خۆیان عەرزی شا کرد. لە لایەن پاشاوە تەواوی کار و باری ئەوان و کوردستان بە مستوفی الممالك ئەسپێردرا و پێی لەسەر نەهێشتنی زوڵم لە سەر ئەوان داگرت.

چونکە پتر لە دوو سێ مانگی بۆ ئەوروز نەمابوو، کاربەدەستانی دەولەت لێ‌خستنی والی‌یان بە مەسلەحەت نەزانی. میرزا زەکی مستوفی رەشتی-یان کردە وەزیری کوردستان و میرزا حەمە رەزایان بۆ تاران بانگ کردەوە. لەولاشەوە. والی عەلی ئەکبەر خانی ئاموزای ناردە تاران کە ئەم فیتنەیە بکوژێنێتەوە. بەلام تا ئەو گەیشتی، میرزا زەکی خەلاتی وەزارەتی دەبەر کردبوو. هێچی بۆ نەکرا.

بە مەلاکانی ناوبراویان گوت لەگەڵ وەزیر بگەرێنەوە و میرزا عەلی-ش لە تاران بمێنێتەوە، تا وەزیر دەگاتی و کار و باری ولات رێك و پێك دەخا و پاشان مەرەخەستی دەکەن. میرزا زەکی و مەلا کەوتنە رێ. میرزا حەمە رەزا لە رێگای دیکەوە هاتەوە تاران.

کاتی گەیشتنی وەزیر والی هێندی خەڵکی بە پیشوازەوە نارد. لەو پەری ناز و شکۆدا هێنایانە شار. خانویان بۆ دیار کرد. چەند رۆژ حەسایەوە. پاشان لەگەڵ والی دەستی بە باس کرد. فەرمانی پاشا و ئەمری مستوفی‌الممالکی پێ راگەیاند. ئاخرەکەی رێك کەوتن و پەیمانیان بەست. رۆژی دوایە والی هێندی پارە و شتی بە قیمەتی بۆ نارد. وردە وردە یەکێتی لەنێوان حاکم و وزیردا پەیدا بوو. چەند نامەی لە سەر پاکانەی والی لە قسەکانی میرزا رەزا عەلی بۆ

کاربەدەستانی دەوڵەت نووسی. لەبەر ئەوەی مستوفی الممالك بڕوای زۆری بە میرزا زەکی هەبو کاری والی برەوی پەیدا کرد. میرزای وەزیریش لە کاری خۆیدا سەربەخۆیی وەرگرت.

لە کاتی مانەوەی ئەو خەڵکی کوردستان توزی ئاسودە بوون. چونکە والی دەسەڵاتی پێشووی نەمابوو. داب و رەسم و یاسای کون جێگر بوەوە. میرزا حەمە رمزا لە تاران دانیشت. میرزا عەلی-ش ریگای گەرانەوەی پی‌نەدرا. ئەسەدولاخان چوە ولات و لە خزمەت والی‌دا بوو.

## مردنی ئەمانولاّخان

لە ساڵی دووەمی وەزارەتی میرزا زەکی‌دا، والی تووشی نەخۆشی بوو. چاوەکانی کەم بینا بوون. بۆ تیمار و عیلاج چووە تاران. میرزا زەکیش لەگەلی چوو. پاش ئەوەی چوە کن پاشا و چاوی بە مستوفی الممالك کەوت، چەند رۆژێك خەریکی داو و درمان بوو. کار و باری وڵاتیشی رێك خست و ئیجازەی لە بارەگای شا وەرگرت و گەڕایەوە بۆ کوردستان. پاش چەند رۆژ تووشی ئیفلیجی بوو، نیوەی لەشی لەکار کەوت. حەکیم چارەیان پیّ نەکرا. لە ئاخیری هاوینی ساڵی هەزار و دووسەد و هەشتا و چواری کۆچی‌دا بارگە و بنەی بۆ دونیای دیکە تێك نا.

لە گەڵ ئەوەش کە ئەمانولاخان ١٨ ساڵ لە کوردستان حاکمی دەسەڵاتدار بوو. ملك و ماڵێکی لە رادە بە دەری وەسەریەك نابوو، خودای جەببار وای تووله لیّ کردەوە کە دوای مردنی هەڵتا هەزار تمەن بە تاجران قەرزدار بوو.

جارێك ژووری تایبەتی ئەو لە خووە ئاگری گرت. شتی یەکجار زۆر لە قورعانی نایاب و کتیبی باش و پارچەی کشمیر و پەشمینە و فەرش و شمشیر و تفەنگ بەجارێك سووتان.

بە گشتی مرویەکی شیرن زمان و قسەپاراو بوو. بە سەر شعر و پەخشانی فارسی‌دا دەسەڵاتی هەبوو. لە سەرەتاوە هاونشینی سوفی و دەروێشانی پیّ خۆشبوو. پاشان لەوان دوور کەوتەوە و بوو بە هاومەسلەکی کومەلی شێخیە و لەگەل زانایانی ئەو دەستە هاونشین بوو.

هەمیشە ئەتەری دەنارد بۆ شاری کرمان بۆ کن حاجی محمد کەریم خانی قاجار، مەزنی ئەو دەستەیە. حوکمی ئایینی لەوان

وەردەگرت. هێندی چار مەلا عەبدولسەمەدی هەمەدانی خەلیفەی حاجی ناوبراوی بۆ سنە بانگ دەکرد. ئاخرەکەی بە بێز و باوەر و خەیاڵەوە کۆچی دوایی کرد.
نووسەری ئەم لاپەڕانە کەسێکی باوەر پێکراوی ئەوم لە تاران دیت. سوێندی دەخوارد کە دوو ساڵ پێش مردنی لە ڕێگای شێخ ئەحمەد-یش وەدەر کەوتبوو. (وەبال بە ئەستووی ئەو). تەواوی تەمەنی چل و پێنج ساڵ بوو.
لێرەدا باشە کورتایی حاڵ و کاری ڕەزاقولیخانی والی و خان ئەحمەد خانی برا-یشی بنووسین. کە لە باسی ڕەوشت و حاڵی ئەو تایفەیە هیچ بەجێ نەمێنێ. پێشتر باسمان کرد کە ڕەزاقولیخان ماوەیەك لە تەوریز حەبس بوو. پاشان بە تکای تویا خانمی خێزانی بانگ کرایەوە تاران. ماوەیەکێش وەك کێشکچی لە تاران دەژیا. سەدری ئەعزەم بەزەیی پێدا هات و ئازادی کرد. بەڵام ڕێگای بارەگای پاشای پێ نەدرا. پاش لێکەوتنی سەدری ئەعزەم بە تکای میرزا محمد خانی سوپا ساڵار و موحسین میرزای میر ئاخور چوە کن شا و هاتە ڕیزی نۆکەرانی بارەگا. چەند ڕۆژێکیش هەوای حکومەتی کوردستان لە سەری دا. چەند کەس لە کاربەدەستانی دەوڵەتی کردە واسیتە، بەڵام کەس زاتی نەکرد لە کن شا باسی بکات. جارێکێش لەگەڵ سوپا ساڵار بۆ شەری تورکمان چوە گورگان و دیسان فایدەی نەبوو، ئاخرەکەی ساڵی ١٢٨٢ لە تاران بە نەخۆشی سیل و جەم مرد.
پیاوێکی باش سروشت و بە ئەدەب و قسەزان بوو کاتی حوکمرانی کوردستان ئەت زوڵم و زۆری لە خەڵك نەکرد. بەڵام لە ڕادە بەدەر ئارەق‌خۆر و ژن‌باز بوو. هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە تەمەنی لە چل و چوار ساڵ تێ نەپەری.

وەفاتی خان ئەحمەد خان.

ئەحمەد خانی براچکولەیان، پاش مردنی رەزا قولیخان بە مەرگی موفاجا مرد ئەویش چل و دوساڵ ژیا. لاوێکی ئەخلاق باش بوو. لەگەڵ خەڵك بە شێوەی بەرابەری دەژیا. ئەو سێ برایە (ڕەزا قولیخان، ئەمانوڵاخان و خان ئەحمەد خان) لە سکی والیەوە لە پشتی خوسرەوخانی بوون. لە ماوەی بیست مانگدا هەرسێکیان چوونە دونیای

دیکە. خسروخان بێجگە لەوانە لە تەرمواشانیش چەند کوری هەبوون کە ئەوە ناویانە: سمایل خان، فەزلولاخان، تەیمورخان جەمشید خان. بێجگە لە تەیمورخان ئەوانیتر زیندون.

کورەگەورەی رەزا قولیخان ناوی خسروخانە. لاوێکی تا بلێی بە ئەخلاق و ئینسانە. لە تەمەنی بیست و حەوت سالەوە لە تاران دەژی. پاش ئەو حەمە عەلیخان سەرهەنگی فەوجی کوردستانە. سێ سال لە خزمەت شازادە فەرهاد میرزای خالی حوکمرانی کوردستاندا ژیان تی‌پەر دەکات. پاشان ئەبولحەسەنخانی ۱۲ سالەیە. ئەم سێیانە لە شازادە تویا خانمێکی شازادە عەبباس میرزای چەمەتین. لە تەرەواشانیش پاشاخان و یەحیاخان و یەك دووی دیکەش کە ناویان لە بیرم نیە.

کورەکانی ئەمانولآخانی گەورە: حەسەن‌قولیخان بە نازناوی خانی خانان، کوری دیکەی والی حەمەکەریمخان بە نازناوی حاجی خان ۱۲ سالە و ئەوی دیکەش حەمە کازم خانە. ئەو سێ کەسە لە ئافتاو خانی کیژی حوسین قولیخانی مامی خۆیەتی.

دوای مردنی ئەمانولآخان، چەند روژێك خەلك لە تازیەدا بوون. پاشان حوسین قولیخانی ناوبراو لە جێی ئەو دانیشت. میرزا زەکی هەروا لەسەر کار و باری خۆی مایەوە. بەلآم چونکە شاهەنشای ئێران هەمیشە مەبەستی رێك و پێکی کار و باری ئەم سنوور و ناوچەیە بوە و لە کردەوەی والیش دلی پیشا بوو. شازادە معتمد الدولە فەرهاد میرزای مامی کە لێ هاتوو بوو کردی بە حاکمی کوردستان. حوسین قولیخانی کوری والی و میرزا زەکی بانگ کرانەوە تاران و ئێستا لەوی دەژین.

# فەسڵی چوارەم

## باسی حکومەتی شازادە معتمد الدولە (١١)

لە پێنجی زیقەعدەی ساڵی هەزار و دوو سەت و هەشتا و چوار شازادە معتمد الدولە گەیشتە شاری سنە. گەورەپیاوانی وڵات هەر کەسە بە گوێرەی پلە و پایەی خۆی هاتنە خزمەتی و بیر و رای خۆیان پێڕاگەیاند. هەوەلی مانگی قوربان هەر لەو ساڵەدا بۆ ناوچەی مەریوان چوو کە ئاخرەکەی خاکی ئێران و سەرەتای دەوڵەتی عوسمانی‌یە. پتر لە دوو سەت کەس لە خەڵکی کوردستان و دار و دەستەی خۆی لەگەڵ نەبوو.

حەمە سەعید سولتانی هەورامی لهونی کە بەم زوانە باسی دەکری، کاتی وەرێکەوتنی شازادە لەگەڵ هێندی پیاو هات و پێشکێشی هێنا و خزمەتکاری خۆی راگەیاند. خەڵاتی وەر گرت و بۆ جێگای خۆی گەرایەوە. کاتێکی والی گەیشتە گوندی بێلك کە رێگای سەعاتێك لە خاکی بابان دوورە، حەسەن سولتانی هەورامی شامیانی کە هەموو تەمەنی بە رێگری و تالآن و کوشتنی خەڵك بردوتە سەر، لەگەڵ دوو هەزار تفەنگچی پیادە بە پێشوازیەوە هات و لافی سەربەخۆیشی لێ دەدا. ئەو کڕنوشەی نەبرد کە نۆکەران بۆ خاوەنەکانیانی دەبەن. ئەوە بۆ فێز و مەزنەتی بنەماڵەی پاشایەتی گەلێك ناخۆش بوو. لەم رەفتارە فرە تێك چوو. هەر لەوی فەرمانی کوشتنی دا و خنکاندیان. مستەفا بەگ و زوراب بەگی براشی گیران. پاشان ئەسری کرد پەتکیان لە لاقی کرد و دایان بە دەستی هاوری‌کانی. پیادەکان کە گەورەی خۆیان ئاوا دیت، سەری خۆیان هەلگرت و هەر یەك رویان کردە وڵاتێك. پاشان شازادە براکانی هێنا و لە سنە زیندانی کردن.

## سیفەتی چیای هەورامان

ئێستا وا باشە کە باسی چیای هەورامان و رەوشت و ژیانی خەڵکی ئەو مەڵبەندە بکەین. کە خوێنەران ئاگاداریان لە وەزعی ئەوێ هەبێ.

هەورامان چیایەکە لە بەرزاییدا جیرانی عاسمانە. لە دوورەوە وا دیتە بەرچاو کە لە پارچە بەردیکە. لایەکی بە شارەزوورەوە نووساوە. لای دیکەشی خاکی مەریوانە. بۆ سەر کەوتن و تێپەر بوون لە هەرتك لاوە تاقە یەك ڕێگا هەیە. لە لای جوانرۆشەوە کوێرە ڕێیکی باریك هەیە. چەمی سیروان بە نیوان ئەو ڕێگا و چیایەدا دەڕوا، بە ساییکی گەورە لەو چیا بەرز و بەسامە دیتە خوار. لە سەر چیا نێزیکەی چل پەنجا ئاوایی هەیە و خەلکەکەشی دەگاتە ١٥ هەزار کەس. ئەو لایەی کەوتوتە خاکی شارەزوور لهونی پێ ئێژن و لای سەروو کە بە مەریوانەوە نووساوە ناوی شامیانە.
مەزنی ئەوان دوو کەس بوون بە نازناوی سولتان. لەو کاتەدا حەسەن سولتانی کوری حەمە سولتان بە سەر شامیاندا حکومران بوو، حەمە سەعید سولتانی کوری عوسمان سولتانیش بە سەر لهوندا. خەلکی هەورامان بنەچەکەی خۆیان دەبەنەوە سەر بەهمەنی کوری ئەسفەندیاری. دەلێن لە زەمانی دەسەلاتی ئەسکەندەری کوری فەیلەقوسی بە سەر ئێراندا، ئەوەندی لە توانایدا هەبوو شازادە و دار و دەستەی سەر بە پاشاکانی کەیانی زەلیل و زەبون کرد و هێندیکی لەو چیایە حەبس دەکردن. بویە ئەم کیوە بە زینددانی ئەسکەندەر ناویانگی ڕویشتبوو.
لەگەل تێپەر بوونی زەمان زاوزێیان کرد و زۆر بوون و تەواوی چیایان داگرت. چەند سالی دوور و درێژ بە دژواری و برسیەتی دەژیان. زمانی ئەوان شیوەیەکە لە کوردی و وشەی فارسیشی تێدا وەگیر دەکەوی.
ئەو دەم حەسەن سولتان لە دزلی و سەعید سولتان لە نوسود دادەنیشتن. هیچ کشت و کالی لێ ناکری. خۆلیان بە کول هێناوە، لەسەر بەرد و لە بن ڕەوەزان باغات و داری بەریان لێ ڕواندوە. گەنم و جۆ و دانەوێلە لە مەریوان و شارەزوورەوە بە کول دەبەن. لە چیاکان دار بەرو زۆرە. زوربەی نانیان لە بەرو و هەرزنە. ئەو چیایە بویە ناوی لێنراوە هەورامان چونکە بە هەورامی بە برسی ئێژن "ئاررا"(*) لە بەر ئەوەی برسی بوون، ئەم ناویان لێ ناوە. بویەش بەو تایفە دەلین هەورامی کە برسی بوون و بە فەقیری ژیاون. گەورەپیاوانی کوردستان هەمیشە کچەکانی ئەوانیان بۆ کارکەری و خزمەت بردوتە مالی خۆیان.
لە سەرەتای حکومەتی غولام شاخان، دەستیان کرد بە تالان و دزی. دێهاتی دەور و بەریان تالان دەکرد و ئازاری خەلکیان دەدا. والی ئەوەندە بیری لە سزا دانیان نەدەکردەوە. لە ماوەی ١٥ سالدا ئەوەندە بەهێز بوون

کە بە سانایی بەردەست نەدەکران. هەر بۆیەش والی بە نەرمی لەگەڵیان رای دەبوارد. لە دەورووبەریشەوە خەڵك پەنای بۆ حەسەن سوڵتان دەهێنا. لەلای شارەزوور و جوانرۆش خەڵك لە حەمە سەعید سوڵتان کۆ دەبوونەوە. وردە وردە دەسەڵاتی تەواویان پەیدا کرد. لە ئەنگاوتن‌دا دەستێکی باڵایان هەبوو. کاتێ جاریان کێشابا دوو هەزار تفەنگچی ئامادە دەبوو. یەك دوو جار والی بۆ لێدانیان وەخۆ کەوت بەڵام هیچی پێ نەکرا. ئەو بە وەرگرتنی دیاری و پێشکێشی کەم وازی هێنا.

ئەو تایفەیە هەر یاخی بوون تا شازادە معتمد الدولە هات و وەك باسکرا بەسەر حەسەن سوڵتاندا زاڵ بوو، کوشتی. براکانی بردە بەندیخانە. کورەکانی حەسەن سوڵتان، روستەم و برزو هەرچەندی بۆ ئازاد کردنی مامەکانیان پارانەوە فایدەی نەبوو.

ساڵێکی‌تر معتمد الدولە لەگەڵ هێندێ کەس بۆ تەماشای ئەلای مەریوان چوە ئەو ناوچەیە لە پیاو ماقوڵانی کوردستان عەلی ئەکبەر خانی ئامۆزای والی و میرزا یوسفی کوڕی میرزا حەمە رەزا لەگەڵ میرزا عەلی لەو سەفەرەدا لەگەڵی بوون. لە گوندی ئەنجمنە خێوەتی هەڵدا. رۆژی دوایە لە کازێوەی بەیانی‌دا هەزار و پێنجسەت تفەنگچی هەورامی کە لە بۆسەدا بوون لە چیا هاتنەخوارێ و پێیان دادان. لە ماوەی نێو سەعاتدا دوو سێ هەزار گوللەیان بەسەر ئۆردووی شازادەدا باراند. هەرچەند شازادە ویستی خۆی رابگری بۆی نەکرا. پیاوکانی سواریان کرد و بە زەحمەت بە کوێرە رێ‌دا گەیاندیانەوە سنە. هەورامی بەسەر ئۆردوگایان دادا و هێندیکیان کوشتن و ئۆردویان تالان کرد. معتمد الدولە بە پەلە رێگای بیست سەعاتی بە شەو و رۆژێك بڕی و خۆی گەیاندەوە سنە. دەست بەجێ چۆنیەتی کارەساتی بۆ پاشا نووسی و تەتەری بۆ تاران خستە رێ. ئاگری قینی پاتشای ئێران داگیرسا. گورج حاجی سەعدالملکی قەمبەر عەلیخانی جەلیلوەند لەگەڵ تیپی خەمسە و سوارەی قەزوین و بیوك خانی سەرتیپ لەگەڵ تیپی هەوشاری ورمی، ئیعتماد السلطنە ستەفا قولیخانی قەرەگوزلو لەگەڵ تیپی هەمەدان و چوار توپ و خومپارە، کران بە مەعموری سەرکوت کردنی ئەو تایفەیە. کاتی نووسینی ئەم رووداوە کابرایەکی خەڵکی کوردستان گێرایەوە کە حاجی سەعدالملك وا حالی کرا بوو کە چیای هەورامان بە شەر ناگیرێ. ئەنجامی ئەو کارە پەشێو دەبێ پەشیمانی بە دواوە دەبێ. حاجی بە بیستنی ئەو قسانە ترسا و بەڵام بە ناچاری کەوتە رێ.

که گەیشتە خزمەت شازادە پێی گوت: من جارێکی دیکەش هاتومە ئەو وڵاتە. سەختیی ڕێگای هەورامان و قین و سەر سەختیی ئەو خەڵکەشم ناسیوە. نابی لەگەڵ ئەو خەڵکە جەنگەلی و وەحشی یە زۆر توندی بگری. ئەگەر ڕێگا بدەی ئەمن بە هێمنی و نەرمی دمیان دوێنم. بەڵکو بە نەرمی بێنە سەر ڕێگا. شازادە بەسەریدا گوڕاند و گوتی قسەی بێجێ دەکەی. ئێمە لەگەڵ کام ژن و پیاو تووشی کێشە بووین کە باسی هێمنی و ئاشتی لەگەڵیان بکەین. ئەگەر جارێکی تر قسەی وا بکەی ئەمر دەکەم شیرت لە قەدی بکەنەوە و لەنێو لەشکر وەدەرت بنێن. دەبی بە گوللە تۆپ چیای هەورامان بکەیە دەشت و وێرانی بکەی.

پێش ئەوەی لەشکر بگاتێ شازادە ئەسەدولاخانی وەکیل و مەلا حەمەمینی قازی و میرزا نادری وەکیل بۆ هێندی مەتلەب و پێ ڕاگەیاندن ناردە لهون. چونکە ئەودەم یاغی بوونی سەعید سوڵتان ئەوەندە دیار نەبوو. ئەسەدولاخان لە ڕێوە چوە گوندی نوسود و سەعید سوڵتانی لە خانەقای شێخ محمدی کوری شێخ عوسمان سەرۆکی نەقشبەندی دیتەوە. هێندی لە بارەی ڕەفتاری ناحەز وتا لەباری بە سەریدا هات و لە سیاست و تورەیی شاهەنشا ترساندی. سەعید سوڵتان پاکانەی دەکرد و خۆی بە بێتاوان دەزانی. هێندی لە ماڵی تالآن و پارەی نەغدی هێنا نیزیکەی دوو هەزار تمەنی دایەوە. ئەسەدولاخان پارە وشتەکانی هێناوە کن شازادە. بەڵام پاش گەرانەوەی ئاڵای سەربزێوی هەلکرد و چوە کن کورەکانی حەسەن سوڵتان و یاریدەی ئەوانی دا.

وەك باسکرا لەشکری تاران گەیشتێ بە کوێرەی فەرمانی والی سەعدالممالك لەگەڵ تیپی خەمسە و سوارەی قەزوین و تیپی کوردستان بە سەرهەنگی حەمە عەلیخانی کوری ڕەزا قولیخانی والی و میرزا عەلی بۆ ئامادە کردنی ئازوقەی لەشکر و خەڵکی بانەش بۆ سەرکوت کردنی کورانی حەسەن سوڵتان بەرەو شامیان کەوتنە ڕێ. ئیعتماد السلطنە و بیوك خانی سەرتیپ و عەلی ئەکبەر خانی سەرکاری جوانرو بۆ سەکوتکردنی سەعید سوڵتان ڕێگای لهون-یان گرتە بەر.

بە کورتی ئوردوی دەوڵەتی سێ مانگ لە بناری چیای هەورامان مایەوە. یاخیەکان جارێك لەگەڵ قەمبەر عەلیخان بەشەر هاتن. سەبارەت بە ڕژدی و دژواری چیا لەشکری ئێران شەری پێ نەدەکرا. ئاخرەکەی چەند کەس لە لەشکری زەنگان و سەربازانی کوردستانی وەبەر گوللەی هەوارمیەکان

کەوتن. بەڵام لەولای ئیعتمادالسلطنە و بیوك خان تەنگیان بە سەعیدسوڵتان هەڵچنی. نەیتوانی بەربەرەکانی بکا و رای کرد. کورانی حەسەن سوڵتان هێندی تفەنگچیان لە دەربەندی دزلی دانا و لەگەڵ حەوت سەت کەس بە هاواری سەعید سوڵتانی‌یەوە بۆ لهون رویشتن. جاسوس خەبەریان بۆ سعدالملك هێنا کە وا هەوراسان خالی‌یە و کەسی تێدا نەماوە. کورانی حەسەن سولتان چوونە لهون. ئەگەر چت پێدەکرێ بیکە. لە نێوە شەودا بە بێ تەپل و شەیپور یەك یەك لە چیا وەسەر کەوتن و بە جارێك بە سەریان دادان. کێشك‌چی لەخەو راپەرین و لە بەیانی‌یەوە تا رۆژئاوا شەر بوو. ئەزا و ئەدەر گوللەیەك وەسەری سەروکی هەورامیەکان کەوت و کوژرا. ئەوانی‌تر خۆیان نەگرت و هەڵاتن. لەو کاتەدا کورانی حەسەن سولتان لە لهون گەرانەوە. ماوەیەك بەرگریان کرد. لە ئاخردا خۆیان نەگرت و رایان کرد لەشکری سەرکەوتو وەدوایان کەوتن تا دە شارەزوریان کردن. پێشتر ژن و منداڵیان بردبوونە شارەزور. ئەم ناوچەیە بەجارێك کەوتە دەستی لەشکری ئێران. ئیعتماد السلطنە و بیوك خان چونە نوسود و سەعد الملك-یش لە دزلی دابەزی. خانووکانیان ئاگر تێ‌بەردا و داری میوەیان بری. تایفەی یاخی چونە سولەیمانی و پەنایان بۆ مەزهەر پاشای والی سولەیمانی برد. ناوبراو پەنای دان. هەر چەند معتمد الدولە داوای گێرانەوەی ئەوانی کرد جوابی نەداوە. روداوەکەی بۆ کاربەدەستانی دەولەت نوسی. بە تێلگراف داوایان لە ئەمیرەکانی عوسمانی کرد کە پەنابەرەکان بدەنەوە بە ئێران و یا لە سنووریان دوور خەنەوە. کاربەدەستانی دەڵەتی عوسمانی روستەم بەگی کوری حەسەن سوڵتانیان بە ماڵ و منداڵەوە ناردە دیاربەکر تا ئێستا لەوێ دەژی و موچەیەکی کەم لە دەولەت وەردەگرێ. لە کردەوەی خۆی پەشیمان و سەر لێشێواوە. برزو بەگ کوری دیکەی حەسەن سوڵتان و سەعید سوڵتان و هەورامیەکانی‌تر نەچونە دیاربەکر. گەرانەوە بۆ شارەزور و ماوەیەك بە سەر لێشێواوی لەو دەوروبەرە دەسوورانەوە. ئاخرەکەی هیچ عیلاجیان نەما کە پەنا بەرنەوە بەر شازادە. فیروزەخاتونی خیزانی ناردە لای شازادە و داوای لێخۆشبوونی کرد. بە تکای عەلی ئەکبەر خانی لە گوناحیان خۆشبوو. سەعید سوڵتانیان بانگ کردە شار. ناوبراو بە بێ ترس لەگەڵ منداڵەکانی‌بەپەنای بۆ ماڵی شازادە هێنا. شازادە لە تاوانەکانی خۆشبوو لە بابەت کردەوەی رابردووی هەر باسی لەگەڵ نەکرد. پاش ماوەیەك بە دەستە بەری عەلی ئەکبەرخان

کوری سەعید سوڵتانی کرد بە حاکمی لهون. ناوبراو خۆی ئیستا لە شاری سنە دادەنیشی.

لە پێشدا نووسرا کە براکانی حەسەن سولتان، مستەفا بەگ و بارام بەگ لە بەندیخانەی شازادەدا مانەوە. بارام بەگ لە بەندیخانەدا مرد. پاش مردنی ئەو مستەفا بەگ ئازاد کرا. ئێستا لە شار دادەنیشی و کاربەدەستانی والی بەخێوی دەکەن. بەڵام برزوبەگ هەروا لە چوڵی سەرگەردانیدا دەسوڕێتەوە پاش ڕووداوی هەورامان هەر وەك باسکرا، حەمە سەعید سولتانی لهونی بە تکای عەلی ئەکبەر خانی لە لین و سزای معتمد الدولە نەجاتی بوو. ماوەیەك لە شاری دانیشت. کورەکەشی لە لهون حاکم بوو. لە ئاخریدا هەر وەك عادەتی بێبەختانە کورەکەی لەگەڵ موسا خانی برای عەلی ئەکبەرخان لەو سنوورە دەستی بە خەراپە کرد. لە شاریش هەست بەوە دەکرا کە سەعید سولتان خەیاڵی کاری ناحەزی هەیە. کردەوەکانی دەکەونە بەر چاوی شازادە و زانی کە دەبێتە هۆی خەراپە لە وڵاتدا.

لەگەڵ عەلی ئەکبەرخانی ناردی بۆ جوانرو. بە بیانوی ئەوەی کە دووبارە دەیکاتەوە حاکمی لهون. کورەکەشی بانگ کردەوە کن خۆی. پاش دوو سێ ڕۆژان باب و کوری گرت و زنجیری کردن. دەست بەجێ ئەمری کرد سەعید سولتانیان لەگەڵ دوو کەس لە نۆکەرانی لەبەر چاوی خۆی بە شیر لەت و پەت کرد. ئاخری ئەو کورەکەشی کوشت ئاگری فیتنەی ئەو تایفەیە کوژایەوە. ڕاپورتی کوردستانی ئەردەڵان بە یاری خودای مەزن تەواو بوو. سنووری ئەردەڵان ئەژمارەی مزل و سەعاتی ئەم وڵاتە و خانو و گەرەکەکانی سنە و ژمارەی خەڵکی بە گوێرەی دانان لە بەشێکی سەربەخۆی ئەم کتێبەدا باس دەکەین.

# فەسڵی پێنجەم

ئێستا بە کورتی باسی کوردستانی بابان دەکەین تا خوێنەران لە حاڵ و بەسەرهاتی ئەوان ئاگادار بن. لە سەرەتای کتێب لە بارەی بابان و خەڵکی ئەو مەڵبەندە نووسرا. ئێستا باروودۆخی ئەوان بە تەواوی باسی دەکرێ.

ئەوە هەر ئەم وڵاتە پان و بەرینەیە کەی لە شاری سولەیمانیە وە کە ئێستا جێگە حکومەتی پاشاکانە تا سنووری خاکێکی دیکە رێگای ١٢ سەعاتە. خاکی بابان لەلای خوارەوە دەگاتە خاکی کەرکوك و لە سەرەوە لەگەڵ ئەردەڵان هاو سنوورە. رۆژهەڵاتی چەمی سیروانە رۆژئاواشی بەسەر دەشتی مرکریانەوە نووساوە. لەم ناوچەیەدا نیزیکەی هەزار گوند و شارێك هەیە. چونیەتی سنوورەکانی و دیاری کردنی مزل و حیسابی فەرسەخی لە بەشێکی جیاوازدا لە ئاخیری ئەم کتێبەدا دەنووسین.

لە سەرەتای سەربەخۆیی تا ئێستا شوێنی سەرۆکانی ئەم تایفەیە لە چوار جێگا بوو. یەکەم ناوچەی ماوەت کە ئێستاش هەر شوێنێکە لەم وڵاتە. دوەم لەلای بەکرئاوا کە ئێستا کاول و وێرانەیە. شوێنێکە لە سەحرای شارەزوور و باسی دەکەین کە چۆن لە بەکرئاواوە هاتوونە لەڵاتی لەلاچوالان. نیزیکەی سەد ساڵێش بارەگای حکومەتی ئەوان لەلاچوالان بوە. پاشان کە ساڵی هەزار و دووسەد و نۆی مانگی هاتوون گوندی مەلکەندیان لە سێ فەرسەخی ئەو شارە کردوە شوێنی دانیشتن و حکومەتیان. برایم پاشای بابان لەوێ شارێکی دروست کرد بە ناوی سولەیمان پاشای وەزیری بەغدا بە سولەیمانیە ناسرا و ناوبانگی کرد. هێندێکیش دەڵێن بە ناو سولەیمان پاشای کوری خۆی کردوە. هەر چۆنێك بێ تایفەی بابان خەڵکێکن لە رەشیدی و ئازایی‌دا بە سەر هەموو تایفە کوردەکانیان‌دا هەیە. لە ئەسپ سواری و داب ئەردا کەس ناتوانێ بەرامبەریان بکات. زۆربەی خەڵکی ئەم وڵاتە شەر دوست و نوێژکەرن. لە راوێژ و راپەڕاندنی کار و باری خۆیان تەواو ژیر و وریان. بەڵام هیچ بە تەنگ خانوبەرە و باغات و جل و خوراکەوە نین. لەگەڵ خەڵکی غەریب ئەوندە ئاشنایەتی ناکەن. بە پێچەوانەی خەڵکی ئەردەڵان کە لەگەڵ بێگانان سازگار و خۆش رەفتارن. بە کورتی لە بەشی رووداوەکانی ئەردەڵاندا بەگوێرەی کات باسی خەڵکی بابان کراوە. نووسیمان کە چۆن هاتونە سەر ئایینی ئیسلام. بە کورتی باسی وەزعی ئەوان دەکەین و نیشانی دەدەین کە بۆچی وەڵەی بابان بە سەریان‌دا

براوە. لە سەردەمی پاشایەتی کەیان و ئەشکانیاندا، بە تایبەت بەنی ساسان، ئەم تایفەیە لە نێو تایفەی کورداندا لە باری ئەژمار و ئامادەیی شەر و چەك و تفاق ناودار بوون. لە زۆربەی دیروکاندا باسکراوە کە کوردەکانی شارەزور هەمیشە دەست درێژییان بۆ وڵاتەکانی دوور و نیزیك کردوە و هەموو لایەکیان تاڵان کردوە و پەلامار داوە. بە جۆرێك لە زەمانی ئەردەشیری بابەکاندا تا دەور و بەری هەمەدان وکرماشانیان خستوتە ژێر دەسەڵاتی خۆ. هەمیشە وڵاتی ئێرانیان پەلامار داوە و تاڵانیان کردوە. رێگایان بە کاروان گرتوە و عێل و عاشیرەتی ئەو مەڵبەندەیان ئازار داوە. ئاخری خەڵك لە دەست زوڵم و زۆرداری ئەوان پەنایان بۆ بارەگای ئەردەشیر بردوە و لە ملهوری خەڵکی شارەزور شکاڵایان کردوە. پاشا لەوە تورە و دڵگیر بوە و هێندێ پاڵەوان و لەشکری بۆ سزا دانی ئەو تایفەیە وە رێ خستوە.

کوردەکان لە هاتنی لەشکری ئێران ئاگادار بوون. دەستەیەکی زۆر بە پێشوازی شەرەوە کەوتوونە رێ. لە سنووری هەمەدان گەیشتبوونە یەك. بە شیر و تیر تێك بەر بوون. لەشکری ئێران توانای شەری نەماوە و شکاوە و بە رێگای عیراقی عەجەمدا رەوییون. لەو کاتەدا ئەردەشیر لە عیراقی عەجەم خێوەت و بارەگای هەڵدداوە. هەڵاتوکان خۆیان گەیاندەوە سوپای پاشا. ئەردەشیر لەو خەبەرە فرە دڵگیر بوو. لەگەل چل هەزار سواری بەرەو وڵاتی کوردان کەوتە رێ. جاسوسی شارەزووری لە دوور و نیزیکەوە وریا بوون تایفەی خۆیان لە هاتنی لەشکری بێگانە ئاگادار کرد. لەشکری خۆیان ئامادە کرد و خۆیان بە چەك و چۆڵ بەرداخ کرد. لە پەنا دەشتی شارەزور لەشکر گەیشتنە یەك. شەرێکی توند قەوما. لەشکری پاشا لەبەر بارانی رمب و تیری کوردەکان خۆی نەگرت و هەریەك بە لایەکدا هەڵات و خۆی نەجاتدا. ئەردەشیر لەگەل هەشت هەزار کەس پاشماوەی لەشکر روی کردە چیایەکی رژد و سەخت کە ئەو دەم هێندێ لە تایفەی بەهمەنی کوری ئەسفەندیاری لێ دەژیان. ئەو تایفە شایان بەخێرهاتن کرد و میوانداریان کرد. شا هەشت رۆژ لەوێ مایەوە. بەدزی ئەتەر و جاسوسی بۆ شارەزور نارد. پەیامیان هێنا کە کوردەکان بێخەم و ئاسودە لە ماڵەکانیاندا خەریکی رابواردن و پاشایان هەر بە خەیاڵیشدا نایە.

ئەردەشیر لەگەل لەشکرەکەی بە شەو لە چیا هاتە خوار و بە سەری دادان. دەستی کرد بە کوشتار و تا بەیانی هەر کوشتار و تاڵان بوو. بەیانی کە خەڵك لە خەو هەستا، دیتیان کەس نەماوە. ترسیان رێ کەوت و هەرکەس بە لایەکدا رای‌کرد. ئەوانەی مابوونەوە پەنایان بۆ پاشای ئێران برد. لەشکری پاشا لە دەستی ئەوان ئەوەندەی تاڵی چیشتبوو، دەسەر ژن و منداڵیشەوە نەدەچوون. خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن.

ئاخرەکەی شا بەزەیی بە حالیاندا هات و فەرمانی دا کە دەست لە کوشتار و تالان هەلگرن. ئەم سەرکەوتنە لە هەموو لایەك دەنگی دایەوە، ئەوانەی هەلاتبوون لەم لاولا گەرانەوە و رەگەل نوردوو کەوتن. پاشاش چاکەی لەگەل کەس و کاریان کرد. هەلاتووەکان کە ئەو چاکەیان لە پاشا دیت سەر نوێ دەستیان کرد بە ئاوەدان کردنەوەی ئەو دەشتە

بەفەرمانی پاشا شارێکیان لەوی بناغە دانا و بورج و قەلا و دیواری تەواو بوون و لە هەمولاوە خەلکی لی کو بووە. پاشان پاشا ناوی نا شاری زور. یانی بە زوری دروست کراوە. پاشان یەکێکی لەو خەلکە کرد بە حاکم. داب و رەسمی بۆ دانان. شەش مانگ لەو مەلبەندە رای بوارد و پاشان بۆ شوێنی خوی گەرایەوە.

بە کورتی کوردەکانی شارەزور لە هەمو کاتێکدا پلە و پایەیان هەبوە. چونکە ناوی گەورەکانیان پێش ئیسلام ودوایەش تا سەردەمی پاشایەتی سەفەویەکان لەبەر چاونیە. ئەوەی لە دیروکاندا هەیە و بە ئاویانگە، بێجگە لەوەی لیرەدا نوسراوە، کەس ئەی نووسیوە بە کورتی سەرەتای حکومەت لە ولاتی بابان لە سولەیمان بەگی کوری مەلا ئەحمەد دەست پێکراوە. لێرەدا واباشە حکایەتی مەلا ئەحمەدی بگێرینەوە کە لە نێوان کوردەکانی شارەزوردا فرە بە ناویانگە. پاشان بچینەسەر مەتلەب.

**چیروکی "فەقێ" و پاشان مەلا ئەحمەدی باوکی سولەیمان پاشا سەرئالقەی ئەمیرەکانی بابان.**

لە کوردستانی بابان گوندێك هەیە مەرگەی پی دەلێن. لەوێ گوندێك بەناوی "دارەشمانە" تا ئێستاش هەر بەم ناوەیە. مەلا ئەحمەد کە باپیری ئەمیرەکانی بابانە خەلکی ئەو گوندە بوە. پیاوێکی لەرادە بەدەر زانا و بەدین زور بە فەقیری ژیاوە. بەلام لاوێکی ئازا و رەشید و جوامێر بوە.

ئەودەم وا هەلدەکەوی کە لە یەکی لە سنوورەکانی عوسمانیدا، لەگەل فەرەنگیان شەر ساز دەبی. مەلا ئەحمەدیش بۆ غەزا وەری دەکەوی. پاش ریگایەکی دوور دەگاتە لەشکری عوسمانی. لە شەردا چەند ئازایەتی دەنوێنی و لەشکری عوسمانی سەر دەکەوی. فەرەنگی دەشکین. موسلمان وەدوایان دەکەون دەچنە نێو ولات و جێگایان. دەست بە تالان و راو و رووت دەکەن. لەم ناوەدا مەلا ئەحمەد کیژێکی جوانی وەبەر دەکەوی. کیژەکە نێوانی لەگەل خوش دەبی و بە خوشی خوی رەگەلی دەکەوی و دێتە سەر دینی ئیسلام و دێتەوە دارەشمانە.

مەلا ئەحمەد مارەی دەکا و بەلام بە ڕێسمی کیژەکە گواستنەوەی سالێك وە دوا دەخەن. بەو مال و سامانەی کە کیژەکە هەی بوو وەزعی مەلا ئەحمەد گورانی بەسەردا هات. روژێك دایکی مەلا ئەحمەد بە گژ کیژەکەدا هات و قسەی ناخوشی پی گوت. کچەکە توورە بوو... دەست

بەجێ. چەکی لە خۆ شەتەکدا و سواری ئەسپی خۆی بوو بە خەسوی گوت: من دەگەڕێمەوە بۆ ولاتی خۆم بە کورەکەت بێژە وەدوام نەکەوێ. ئەگەر بێ بچەتێنی دەکوژرێ. ئەوەی گوت و کەوتە رێ. هەر چەند پیرێژن گریا و لەبەری پارایەوە فایدەی نەبوو.
کاتێ شەو کە مەلا ئەحمەد گەڕایەوە، دایکی بوی گێراوە. لە خۆ چوو، وە عەرزی کەوت. دەستی بە ئاه و نالە کرد. پاشان سوار بوو وەدوای کیژە کەوت. بە توندی رێگای دەبڕی و پاش دە رۆژان خۆی گەیاندە کچ و دەستی کرد بە پارانەوە کە بێوەفا چت کرد و بۆ وادەکەی، بگەڕێوە بەبێ تۆ ژیانی من دژوارە.
کیژەکە گوتی مەلا ئەحمەد، باشترە دەست لە من هەلگری و بگەرێیەوە. دەنا وەبە شیری من دەکەوی. هەر چەندی مەلا ئەحمەد پارایەوە و خوا و رەسولی هێنایە تکایە فایدەی نەبوو. ئاخرەکەی کیژەکە هەراسان بوو و شیریکی لە سەری مەلا ئەحمەدی دا و لە سەر ئەسپ بەری داوە. لە خۆ چوو. کیژەکە بەزەیی پێدا هات. دابەزی لەسەری دانیشت و بوی گریا. پاشان سەری توند پێچایەوە و ئەسپەکەی بەستەوە. کیسە زێرێکی لەبن سەری دانا و ملی رێگای گرت و بە جێی هێشت. مەلا ئەحمەد پاش رۆژێك چاوی هەلینا و دیتی کیژەکە رویشتوە و سەریشی برێنداره. کیسەیەکیشی لە بن سەری دیتەوە. بە زەحمەت توانی سوار بی و بەرەو مال کەوتە رێ پاش چەند رۆژ گەیشتەوە دارشمانە. ماوەیەك خەریکی دەرمانکردنی سەری بوو تا برینەکەی چاك بووە. پاشان کیسە زێرەکی هەلگرت و روی کردە ولاتی کیژەکە، پاش چوار مانگان گەیشتە شاری ئەوان و لە مالێك دابەزی. خاوەنی مالەکە پیرێژنێك بوو مەلا ئەحمەدیش هێندێ زێری دایە و گوتی دایە! ئەو زێرە خەرجکە و ئەگەر تەواو بوو دیسان پێم بلێ. پیرێژن کەیف خۆش بوو، وەك کوری خۆی خزمەتی دەکرد. رۆژێکی گوتی: دایە داخوا لەو دیلانەی کە موسلمانەکان لەگەل خۆیان بردبورن کەسیان گەراونەوە یان نا؟
پیرێژن لە ولامدا گوتی: دوو سی مانگە کیژی فلان کەس کە لە گەورە پیاوانی ئەم ولاتەیە گەراوەتەوە. هەمیشە خەمبار و ماتە. کەس نازانی بوچی وا خەفەتبارە.
مەلا ئەحمەد گوتی: دەمەوی قسێکت پێ بلێم. ئەگەر بەراستی بەیمان بدەی، رازی خۆمت پێ دەلێم. قازانجێکی زۆرێشت وەگیر دەکەوی و لەو هەزاریەش نەجاتت دەبێ.
پیرێژن سوێندی خوارد کە هەتا زیندوە رازی ئەو لای کەس باس نەکات. تۆ وەکو کوری من وای و رازی تۆ بلاو ناکەمەوە.
مەلا ئەحمەد ئەو دەم گوتی: دایە من سەرگەردانی ئەو کیژەم. بۆ ئەو خۆم دەو گێژاوە هاویشتوە پاشان تەواوی سەر گوزەشتی خۆی بۆ

گیراوە و گریا. پیرێژنیش گریا. پاشان گوتی: نیشانەیەکم بدەیە تا بچمە کن کیژەکە. ئەگەر زانیم دڵی بەلای تووەیە، دەری دەبرم و دەنا هیچ.
مەلا ئەحمەد ئەنگوستیلەیەکی دایە کە یادگاری کیژەکە بوو. گوتی ئەو نیشانەیەی بدەیە و چ دەزانی پێی بێژە. ڕۆژی دوایە پیرێژن چووە کن کچەکە. دیتی هەر وا کز و خەمگینە. تاوێك دانیشت و گوتی: کیژم تۆ لەبەر دووری ئەو لاوە موسڵمانە وا خەمباری چیم وەدەمیەی هەواڵێکی ئەوت پێ بڵێم.
کچەکە گوتی ئەی دایە وەرە بە مەسیحت سوێند دەدەم، ئەگەر هیچ دەزانی پێم بڵێ. هەر چی دەتەوێ دەتدەمێ.
پیرێژن ئەنگوستیلەکەی پێشان دا و باسەکەی بۆ گێڕاوە. کیژەکە گریا و گوتی ئەو فەقیرە لەبەر من دەمێ گیراوەی کەوتوە. ئێستا من و ئەو لە پەنا تۆ داین. ئەوەی گوت و چەنگە زێڕێکی دایە. کیسەیەکی دایە و گوتی: بە مەلا ئەحمەد بێژە خۆی بۆ سەفەر ئامادە بکا و ئەسپێکی باشیش بۆ من بکرێ. تا کاتی ڕۆیشتن دێت. تۆش دایە هەموو ڕۆژی سەرێکی من بدە. بچوو پێی بڵێ من لە کردەوەی خۆم بەشیمانم و داوای لێبووردن دەکەم لەوەی کە لە قسەی توو چوومە دەر و لە خوداش یاخی بووم.
پیرێژن چووە ماڵ و مەلا ئەحمەدی ئاگادار کرد. کیسە زێرەکەشی دایە. ناوبراو فرە کەیف خۆش بوو مزگێنی برد. بەیانی ئەسپێکی زۆر باشی کڕی و چاوەڕوانی فەرمان بوو.
پیرێژن هەمو ڕۆژی دە چۆ لای کیژەکە و خەبەری دەهێنایەوە. تا ڕۆژێك ئامۆزای کیژەکە هاتە ماڵێ و هەر وەها کز و داماوی دیت. بە توورەیی پێ گوت: ئەگەر موسڵمانەکانت خۆش دەویست بۆ چی هاتیەوە؟ واز لەم حاڵە بێنە دەنا وەبەر شیری تیژ دەکەوی.
کیژەکە لە بەیقی ئەو فرە توورە بوو. بەڵام دەنگی نەکرد. چەند ڕۆژی پێچوو، بوی هەڵکەوت هێندی پارەی باری هەڵگرت. بە پیرێژنی گوت: بە مەلا ئەحمەد بڵێ سبەی شەوی لە دەرەوەی شار لە فلان جێ چاوەڕوان بێ هەتا من دێم. پیرێژن چووە ماڵی و ناوبراوی ئاگادار کرد. شەو ئەسپەکانی زین کرد و پێویستی سەفەر و ڕێگای هەڵگرت و لەگەڵ پیرێژن چوە شوێنی دیاری کراو و چاوەڕوان بوون. کیژەکە لە نیوەشەودا بە چەك و پەرداخی هاتە لایان. مەلا لە خۆشیان دەگریا. سی‌سەت دیناری ئاڵتونی دا بە پیرێژن و لێی سوار بوون و کەوتنە ڕێ.
ئەو شەوە تا بەیانی کردیانە سەرڕەو تا گەیشتنە بناری چیایەك. لە سەر کانیەك دابەزین و تاوێك حەسانەوە و نانیان خوارد. لەپڕ لە دوورەوە تۆز و غوبار هەستا. کیژەکە گوتی: ئەوانە وەدوای ئێمە کەوتوون. مەترسی ئەمن ئینشەللە بەیان ڕادەگەم. تۆ ئەو هەگبەزێڕە هەڵگرە و بچو سەر چیا. ئەگەر نەکوژرام، ئەوە دێمە کن تۆ، دەنا چون

دەتوانی خۆت دەرباز کە.
مەلا ئەحمەد گوتی: خۆشەویستم، چۆن دێلم تۆ بە تەنیا وە نێو ئەم لەشکرە کەوی. من خۆم دەروستی ئەوان دێیم. کیژەکە سوێندی خوارد ئەگەر لە چیا بێ‌یە خواری خۆم دەکوژم. ئەوەی گوت و چوو لە سەر ریگا راوەستا. لەو لاوە ئاموزای لەگەڵ سەد سوار گەیشتنێ. خۆی پێ‌دادان و لە یەکەم پەلامار ئاموزاکەی کوشت و هێندێکی دیکەشی بە عەرزی دادا. پاشان کشاوە و هاواری کرد دەستم لێ هەڵگرن دەنا یەکتان بە زیندوویی ناهێلم. سوارەکانی‌تر ترسان و گەرانەوە.
کیژەکە بە سلامەتی چووە کن مەلا ئەحمەدی. ئەوێ رۆژێ هەر لەو سەر ئەو کانیە مانەوە و باش حەسانەوە. بەیانی ریگایان داگرت و بە چەند مەنزل گەیشتنەوە جێگای خۆیان.
دایکی مەلا ئەحمەد لە دیتنی کور و بوکی کەیف خۆش بوو. خەڵکی گوندی پێ‌یانەوە هاتن دوای چەند رۆژ شایی و زەماوەندیان کرد وخەڵکی گوندەکەیان ناندا و لەگەڵ بووک شوێن و جێگای خۆیان رێک‌خست.
دوای سالێک ژنەکە کورێکی جوانی بوو ناویان نا سولەیمان. جارێکی دیکەش کورێکی بوو ناویان نا عەبدولا. پاشان بە نازناوی بابامیر ناسرا و بوو بە ئەمیری مرگەیان. لە شوێنی خۆی باسی ئەویش دەکرێ.
بە کورتی سولەیمان بەگ لە ئامێزی دایک و باوکی داپەروەردە بوو. هەر لە منداڵیەوە نیشانەی گەورەیی لە ناوچاوانی‌دا دیار بوو. لە تەمەنی دەساڵیدا، لەگەڵ منالانی هاوتەمەنی دەچوە مەزرا و یاری دەکرد ئەگەر خواردەمەنی لەماڵەوە هێنابایە لەگەڵ هاوڵەکانی بەشی دەکرد و هەمیشە بەسەریاندا فەرمانی دەدا. لە تەمەنی ۱۸ ساڵی‌دا باوکی کۆچی دوایی کرد. دوای دوو ساڵ دایکیشی مرد. ماڵ و سامانی دایک و بابی بەسەر کردەوە، نیزیکەی دە هەزار ئالتونی سوور بە جێ‌مابوو. لە جێی بابی دانیشت. لە کاتێکی کەمدا بوو بە فەرمانڕەوای گوند و دەوروبەری. خەڵکی مەلبەند بێ ئیختیار لە دەوری کۆ بوونەوە. چەند سوارێک رەگەڵی کەوتن. هێندی جار وڵاتی دووریشی پەلامار دەدا. وردە وردە دەنگی دەسەلاتی لەو سنوورەدا بلاو بووە.
لەو کاتەدا جارێکی دیکەش لەشکری عوسمانی لەگەڵ ئەرمەنگیان تووشی شەر بوون. سولەیمان بەگ لەسەر داب و شوێنی باوکی بۆ خەزا خۆی ئامادە کرد. چل سواری لەگەڵ خۆی کردە هاوکار و بەرەو تورستەنتەنیە کەوتنە رێ و لەوێشەوە چوە نێو لەشکری عوسمانی. لە کاتی شەردا لەلایەکی راوەستا. بە هەڵکەوت لەو شەرەدا لەشکری عوسمانی تووشی کزی هات. لەبر سولەیمان بەگ لەگەڵ سوارەکانی پیاوانە کەوتە شەر. وای کرد کە لەشکری ئەرمەنگ پاشەکشەی کرد و لەشکری

عوسمانی شکاندیانن. سولەیمان بەگ لە بەنا مەیدانی شەر دابەزی. فەرماندەری رومیان کاتێ ئەو ئازایی و پیاوەتیەی لەو جەماعەتە دیت، زۆر کەیف خۆش بوو بانگی کرد.

سولەیمان بەگ لەگەل سوارەکانی چوە خزمەت سەرداری سوپای عوسمانی و زۆر باش بەخێر هاتن کرا. لە شوێن و رەگەز و تایفەی پرسی. گوتی ناوم سولەیمانە و خەلکی کوردستانم. فەرماندەری تورك لە خۆشەویستیان گوتی «بابام سولەیمان». «بابام سولەیمان» ئەم ناوەی بەسەردا برا و بە بابا سولەیمان ناوبانگی کرد. پاشانیش پشتا و پشت عەولادی ئەو بە بابان ناسران. ولاتەکەشیان هەر بەم ناوە ناو دەبرێ. هەر وەك بە ولاتی کوردستانیش دەلێن ئەردەلان و بە ناوی باپیرە گەورەیان خسروی ناشەوان کراوە. نووسەر ئەوەی لە سەرەتای کتێبدا نووسیوە.

بە گشتی سەرداری عوسمانی ئازایەتی شەری سولەیمان بەگی بۆ پاشای روم نووسی. لە بارەگای پاشاوە بانگ کرا. کەوتە بەر لوتف و رەحمەتی پاشا و فەرمانی حاکمەتی ئەو مەلبەند و ناوچەیەی درایە و بە سەرکەوتنەوە بۆ ولاتی خۆی گەرایەوە.

## باسی دەسەلاتی سولەیمان بەگ بە سەر ولاتی بابان و بلباسدا.

لە نێو تایفەکانی کورددا دەسەلاتیکی وای پەیدا کرد کە خەلکی ئەم ناوچانە هەموو ملیان بۆ راکێشا. لە ماوەیەکی کەمدا ولاتی بابانی گرت و بێجگە لەوە تایفەی بلباس و خاکی موکری-شی هێنا ژێر فەرمانی خۆی. لەقەبی بابا میری دا بە عبداللای برای و ناردیە موکریان.

بابامیر بە گوێرەی فەرمانی برای چوە ئەو ولاتە و لەوێ دانیشت و تا ئاخری ژیانی لەوێ مایەوە. تا ئێستاش کور و نەوەکانی ئەو بەسەر ئەم مەلبەندەدا حکومەت دەکەن و بنەچەکەی خۆیان دەبەنەوە سەر ئەو.

بە کورتی لە سالی نوسەت و حەفتا و نۆی کۆچیدا سولەیمان بەگ بەسەر ولاتی کوردستانی بابان و دەشتی شارەزور و موکری و بلباسدا ئەمیری فەرمانرەوا بوو. ناوەندی حکومەتەکەشی هەر «دارشمانە» بوو. لەگەل رەعیەت و دانیشتوانی ئەوێ وەك یەك دەژیا. چەند کوری لێ کەوتنەوە. هەژدە سال لەو پەری سەربەخۆییدا رایبوارد. پاشان کۆچی دوایی کرد. لەسەرە مەرگدا فەرهاد بەگی کوری کردە سەرۆك.

## باسی حکومەتی فەرهاد بەگی کوری سولەیمان بەگی بابان.

سالی نۆسەد و نەوەت و حەوت فەرهاد بەگ لە جێی بابی دانیشت و کار و باری رێك و پێك بوو. بە گوێرەی داب و دەستوری بابی لە

گەڵ خەڵك دژیا. خەڵكی بابان زۆر دەوڵەمەند بوون. نیزیكەی دوو هەزار سوار هەمیشە لە ژێر فەرمانی دا ئامادە بوون. ماوەی بیست ساڵی تەواو بە خۆشی رایبوارد. پاشان لەشكری ئەجەل پەلاماری دا. لە سەرەمەرگدا بەكر بەگی كوری كردە حاكم و كۆچی دوایی كرد.

## باسی حكومەتی بەكر بەگ.

بەكر بەگ لە ساڵی هەزار و حەفدەدا لە جێی بابی دانیشت. پیاوێكی بەرز و بەتین و بەخۆوە بوو. بە پێچەوانەی باب و باپیری خۆی دابی پاشایەتی گرتە بەر وەك ئەمیران رەفتاری دەكرد. بارەگای حكومەتی لە دارشەمانە گواستەوە بۆ ماوەت. پاش ماوەیەك لە دەشتی شارەزور لەلایەكی دروست كرد و بورج و قوللەی قایمی لێ ساز كرد. خەڵكێكی زۆر لەو حەسارە كۆ بونەوە و ناوی نرا بەكر ئاوا. لە وڵاتانی دیكەوە هێندی خەڵك هاتنە لای. جل و بەرگی جوانی دەبەر كردن و پلە و پایەی بەرزی پێ بەخشین. هێندی چەكمە و پێڵاوی ئاڵتونی دانێ. زەنگولەی زێری وێ خستن. بەو بونەوە ئەو خەڵكە بە چەكمەزێر ناوبانگیان دەركرد. هەمیشە قسەی سووكی بە خەڵكی بابان دەگوت و جنێوی پێدەدان. خەڵك لە كارەكانی ناڕەحەت و دڵگیر بوون. هەر یەكەی بۆ لایەك بڵاوەیان كرد. گەورەكانی رەواندز و كۆیە و هەریر و تایفەی بلباس یەكیان گرت و بە پێنج هەزار سوارەوە پەلاماریان دا و لە هەموو لاوە هەرایان لێ سازكرد. هەر چەندی بەكر بەگ خەڵكی بابانی بۆ بەربەرەكانی دەنگ دا جوابیان نەدایەوە. لە وڵامدا گوتیان داوای درمانی ئەو دمردە لە چەكمە زێرەكان بكە. بەكربەگ جەماعەتی ناوبراوی بانگ كرد و گوتی: خەڵكی بابان لەبەر ئێوە پشتیان دە من كرد. ماڵی باب و باپیرانی منیان لەبەر چاو نەگرت. ئێستا پێم بڵێن ئێوە لەگەڵ من چۆن دەبن. ئێكرا گوتیان تا گیانمان لە لەشدایە چاكەی تۆ دەدەینەوە. ئەوەندەی لە توانامانڈا هەبێ لە گەڵ دوژمنانی تۆ بەرابەری دەكەین. بەكر بەگ بە ئاخافتنی ئەوان ترزێ ئاسودە بوو. چەك و چول و ئامرازی شەری ئامادە كرد و بە پێشوازی شەرەوە چوو. لە دوو مزلی شارەزور گەیشتنە یەك. لە بەیانەوە تا رۆژئاوا هەرتك لەشكر لە یەكتریان دەكوشت. جەماعەتی چەكمەزێر ئازایی و پیاوەتیان نواند. ئەوەندە شەریان كرد تا هەموو كوژران. هەزار كەسیش لە دوژمن كوژرا. لەو رۆژە دا بەكر بەگ خۆی شەری دەكرد و زۆر كەس بە دەستی وی كوژران بەڵام لەبەر ئەوەی كە لەشكرەكەی لە نابوودیدا بوو، خۆی پێ نەگیرا و رای كرد. لەشكری دوژمن وە دوای كەوتن. هەرایەكی گەورەیان لە وڵاتی بابان ساز كرد. هێندی كوژران و كۆمەڵێك بە دیل گیران. گوندەكانیان تاڵان كرا و سووتێنران. بە سەركەوتنەوە بۆ وڵاتی خۆیان گەرانەوە.

لەولاشەوە بەکر بەگ لەترسی دوژمنان پەنای بۆ چیا رژد و بەرزەکان برد. تا ئەو کاتەی کە تایفەی ناوبراو بۆ شوێنی خۆیان گەڕانەوە. پاشان هاتەوە شارەزور و لەسەر شکان و کارەساتی وڵاتی بابان دەگریا. ئاڵایەکی ڕەشی هەڵکرد و بە گوند و ماڵەکانی خەڵکی باباندا دەگەڕا و بیری کوژراوەکانی دەکرد و خەڵکی بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە هان دەدا. گەورە پیاوانی بابان کە ئەمیری خۆیان ئاوا داماو دەبینی، خەمبار بوون و یەکیان گرت و لە دەوری ئەو کۆ بونەوە. گریان و هاواریان دەچوە ئاسمان. لە ماوەیەکی کەمدا سێ هەزار سوار لە ژێر ئاڵای بەکر بەگ کۆبووبوون. پاشان بە ئامادەیی و بەرداخی بۆ سەزا دانی تایفەی ناوبراو کەوتنە ڕێ. جەماعەتی ئەولاش کۆ بوونەوە، وەك پڵنگی ڕق هەستاو بۆ بەربەرەکانی ڕۆیشتن. لە پەنا ڕوباری «کرنیە» هەرتك لەشکر گەیشتنە یەك. لە هەرتك لا شیر و تیر بەکار هاتن. ئاگری شەر هەڵگیرسا. خەڵکێکی زۆر لە هەرتك لاوە کوژران. ئاخرەکەی بای سەرکەوتن بە سەر لەشکری بەکر بەگدا هات. لەشکری دوژمن شکا حەوت سەد کەس لە گەورەکانیان بە دیل گیران و ئەوانی دیکەش کوژران. لەشکری بابان گوند و وڵاتی ئەوانیان بەلامار دا. سێ شەو و ڕۆژان کوشتاریان لێ کردن. پاشان لەسەر چەمی «کرنیە» خێوەت و بارگایان هەڵدان. ئەمری کرد کە کومەڵێك درووبان کۆ کردەوە. دیلەکانیان بە دەست بەستراوی و پای پەتی بەسەر درووکاندا دەگێڕا. پیاوی لەسەر دانابون تا ئەگەر نەڕۆیشتن بەلیداڵ بیانڕۆێنن. وا مەشهورە کە کاتی زادەوەستان بە دار و بەرد لە سەر و چاویان دەدان. ئەوان هاواریان دەکرد لێمان مەدەن، کاری خۆمان دەزانین.

سێ ڕۆژ ئاوا بە زەلیلی ڕایانبوارد. پاشان بەکر بەگ لە پەنا چۆمی دانیشت و یەك یەك سەریان دەبەڕاندن و تەرمیان دە چۆمی داوێشتن. پاش ئەو کارە بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە. تاڵانێکی زۆریان بۆ شارەزور هێنا و خەریکی ڕابواردن و عەیش و نۆش بوو.

## ڕۆیشتنی بەکر بەگ بۆ بەغدا و کوشتنی ئەو.

بەکربەگ لەو بەری سەر بەخۆیی دا ڕایبوارد. پاشان مێشکی تێکچو و ئاقڵی نەما. ڕۆژێك لە مەجلیس دا گوتی: دەمەوی سەرێکی بەغدا بدەم و سەیرانێك بکەم. گەورەپیاوانی بابان گوتیان ئەوە کارێکی پەسند نیە. چونکە والی بەغدا لەگەڵ تۆ دوژمنە هیچ پێویست نیە ئەو سەفەرە بکەی. بەکر بەگ گوتی جلی خۆم دەگۆڕم، ڕیش و سمێڵ دەتاشم، خەڵك پێکەنین و بێدەنگ بوون. کەس توانای بەر پەرچ دانەوەی نەبوو. شەوێك بێ زەحمەت هێندی ئالتونی هەڵگرت و بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ. لە نیزیکی بەغدا ڕیش و سمێڵی تاشی. چوە نێو شار. چەند ڕۆژێك سووڕاوە. بە هەڵکەوت کابرایەك ناسی و بە خەڵکی ڕاگەیاند. والی بەغدا

بیستیەوە. ناردی بەکر بەگی گرت و هەر دەست بەجێ کوشتی. ئەو خەبەرە لە هەموو شوێن بڵاو بووە. خەڵکی بابانیش ئاگادار بوون تازیەیان گرت.

## دانیشتنی سولەیمان پاشای کوری بەکر بەگ لە جێگای بابی.

پاش تازیمانە ساڵی هەزار و بیست و نۆ سولەیمان پاشا کە کورە گەورەی بەکر بەگ بوو لە جێگای بابی دانیشت و خۆی بۆ قینەبەری ئامادە کرد. بە لەشکرێکی پەرداخەوە بەرەو بەغدا کەوتە رێ. والی عێراقیش لە بزوتنی ئەو ئاگادار بوو بە لەشکریکەوە بۆ شەر بزوت. لەو کاتەدا خان ئەحمەد خانی کوری هەڵۆخانی ئەردەڵان دەرفەتی هینا و هێندی خاکی بابانی پەلامار دا. بە زوری خەڵکێکی زۆری بۆ قەڵای حەسەناوا هێنا. خەڵکی ئەردەڵان ئەو قسەیان لەبیرە و بە شانازیەوە دەڵین: خان ئەحمەد خان گا و بێگاری لە ملکی بابانەوە هێناوە.

بە کورتی سولەیمان پاشای کوری بەکر بەگ لە هەموو شوێنی خاکی عێراقی پەلامار دا. والی بەغداش بە ئالوکە دەهات. پتر لە دوو منزل نەمابوو کە بگەنە یەك. بەڵام لە دوو لاوە تکاکار هاتنە نێوان و بە ئاشتی تەواو بوو.

پاشای بەغدا خۆی هاتە نێو لەشکری بابان و لە کردەوەی رابردووی پەشیوانی دەر بری خەڵات و دیاری دا بە سولەیمان پاشا. هەرتك لا بۆ جێگای خۆیان گەرانەوە. سولەیمان پاشا هەشت ساڵ حکومەتی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد. کاتی سەرەمەرگ مەحموود پاشای کوری لە جێی خۆی دانا.

## باسی حکومەتی مەحمود پاشا

ساڵی هەزار و سی و حەوت مەحمود پاشا لە سەر تەختی حوکمرانی دانیشت. پیاوێکی بە ئیرادە و قەوی و دووربین بوو چونکە هەوای شارەزووری پی خۆش نەبوو، بارەگای حکومەتی لە بەکراوا بۆ قەلا چوالان گواستەوە، کە جێگایەکی خۆش ئاو و هەوا بوو. بۆ ئاوەدانی وی زۆری هەول دا. فەرمانی دا بە گەورە گەورانی بابان کە هەر کەس بۆ خۆی لەوی خانویەك دروست بکا لە ماوەیەکی کەمدا تەواو بوو و خەڵك لەو قەلایەدا کۆ بوونەوە.

## ناز ناوی قەڵا چوالان

لە زمانی کوردی بابان بە یادامی کێوی کە هێشتا سەوزە و ئەگەرە دەڵین چوالە کە گرت کراوەی «مەقالەیە». کوێەکەی دەبێتە «چوالان» لەو شوێنە چوالە زۆر بوو. ناچار ئەو شارمیان ناونا «قەلا چوالان».

بە کورتی مەحمود پاشاش دەساڵ حوکمڕان بوو. پاشان ئەجەل یەقەی گرت و کوشتی. لە سەرە مەرگدا خالید پاشای لە جێی خۆ دانا. خەڵک تازیمانەیان بۆ گرت.

## باسی حکومەتی خالید پاشا.

ساڵی هەزار و چل و حەوتی کۆچی خەڵک پاڵیان وە خالیدپاشا دا. ساڵی هەوەڵی حکومەتی لە گەڵ سولەیمانخانی ئەردەڵان شەڕی کرد و سەر کەوت. هەر وەك لە باسی کوردستانی ئەردەڵاندا گوتراوە و لێرە دووپات ناکرێتەوە. هێندی خاکی ئەردەڵانی داگیر کرد.

بە کشتنی ناوبراو بۆ ئاسایشی خەڵك و ئاوەدانی وڵات تێکۆشا. مالیاتێکی دیاریکراوی لەسەر خەڵك دانا. گوند و مەزرای پەرە پێدان و هەریەك بارمیەکی لەسەر دانان. تا ئەو دەم قانونی ئەوتۆ لەوێ باو نەبوو. چونکە هەرکەس شتێکی وەچەنگ دەکەوت بۆ حاکمی دەبرد. بۆ ڕاڵی بەغداش خەرجێکی وە ئەستۆ گرت. هێندی جار سڵاوێکی لە پاشای ئێرانیش دەکرد. بیست ساڵی تەواو بەم جورە ڕایبوارد. پاشان ملکی دا بە محمد پاشای کوری و کۆچی دوایی کرد.

## حکومەتی محمد پاشا و یاخی بوونی ئەحمەد پاشای برای و ناکامی ئەوان.

ساڵی هەزار و شەست و حەوت محمد پاشا لە سەر کورسی حوکمڕانی دانیشت. پیاوێکی لە ڕادە بەدەر بە دین و ئەخلاق باشبوو. پاش دوو ساڵان ئەحمەد پاشای برا چکۆلەی لێی هەڵگەڕاوە. لە حکومەتی خست و حەبسی کرد. پاشان بە قسەی شەیتان و شوگاران کوێری کرد.

ئەم کارە لێی پیرۆز نەبوو. پاش چوار ساڵان نەخۆش کەوت و شەش مانگ دەجێدا بوو، مرد. محمد پاشای کوێر هەر زیندوو بوو. سەیر ئەوە بوو کە محمد پاشا لە سەردەمی حکومەتیدا ئەوەی چاکە بوو لەگەڵ ئەحمەد پاشای برای کردی. لە کاری حکومەتدا کردبوە شەریك. لە ئەشیای عەنتیکە و بە نرخ چی دەهاتە دست دەیدایە. تا ئەحەمد پاشا لە حکومەتی خست و دوای سێ ساڵانیش کوێری کرد. کاتێ خەبەری مردنی ئەحمد پاشای بیست، ئەسپاردی کە ئەگەر ببینی ئەحمد بۆ قەبرستان دەبەن، بە پێش ماڵی منیدا بێنن و ئاگادارم بکەن لەگەڵ تەرمی بێگیانی قسە دەکەم.

پاش شوشتن و کفن، گەورەپیاوانی بابان تابوتیان لەسەر شانی دانا و بۆ گورستانیان برد. کاتێ گەیشتنە ماڵی محمد پاشا خەبەریان دایە. لە ماڵی هاتە دەر و گوتی: تاوێك مەیتەکە لە عەرزی دابنێن. لەبن سەری دانیشت و رووی کردە تەرمی بێگیان و گوتی: ئەحمد من و تۆ

براین و له دایك و بابێك. كاتی باوكمان مرد حكومه‌تی دا به من. تۆم كرده شه‌ریكی خۆم. ئه‌ی ئه‌حمه‌د! له فلان رۆژدا ئه‌ومنده پاره‌م دایه‌ی. له حكومه‌ت هه‌ر ناوم له خۆم‌نا. تۆ له‌گه‌ل من وه‌فات به‌كار نه‌هێنا. مافی برایه‌تیت وه‌لا نا. چاوه‌كانی منت ده‌رهێنا، ئیستا كه سه‌فه‌ری ئه‌و دنیا ده‌كه‌ی رێگات ده‌ده‌می. ئه‌ی برا له هه‌موو مافێكی خۆم ئازادت ده‌كه‌م. خودای گه‌وره له تۆله‌ی من ئازارت نه‌دا. ئه‌وه‌ی گوت و چووه ژووری، هه‌تا ئه‌و رۆژه‌ی مرد ده‌رگای له ئاشنا و بێگانه نه‌كرده‌وه

## باسی حكومه‌تی سوله‌یمان پاشا

به كشتی پاش مردنی ئه‌حمه‌د پاشا، سوله‌یمان پاشای برازای بوو به فه‌رمانره‌وا. سالی ۱۰۷۷ ته‌واوی ولاتی بابانی هێنا ژێر فه‌رمانی خۆی. سوله‌یمان پاشا لاوێكی به‌سام و ئازا و ره‌شید بوو. پیاوێكی ژیر و به راوێژ و له كاری ولات غافل نه‌ده‌بوو. له سالی شه‌شه‌می حكومه‌تی ئه‌ودا، خان ئه‌حمه‌دخانی دوه‌م بوو به ئه‌میر و حوكمرانی ولاتی ئه‌رده‌لان. له‌گه‌ل سوله‌یمان پاشا بوو به هاوده‌نگ و یه‌ككرتوو. له سنووری مه‌ریوان چاویان به یه‌كتر كه‌وت. په‌یمانێكی توندیان به‌ست. له‌ولاشه‌وه شا سوله‌یمانی سه‌فه‌ویش ناهومێدیه‌كی هه‌بوو. پێشتر باسی ئه‌وه كراوه كه چۆن خان ئه‌حمه‌د خان په‌نای بۆ ده‌وله‌تی عوسمانی هێنا و له‌گه‌ل سوله‌یمان پاشا بوو به هاو په‌یمان. ماوه‌یه‌ك له‌گه‌ل شا سوله‌یمانی سه‌فه‌وی نێوانی نه‌بوو. تا كاربه‌ده‌ستانی ده‌وله‌ت خان ئه‌حمه‌د خانیان هێناوه سه‌ر كار و دلیان چا كرده‌وه.

سوله‌یمان پاشا له‌و كاره‌ی ئه‌وان ناره‌حه‌ت بوو، خاكی ئه‌رده‌لانی به‌لاماردا و هێندی خاكی ئه‌رده‌لانی ره‌گه‌ل بابان خست. ئه‌م رووداوه نووسراوه. سوله‌یمان پاشا به‌سه‌ر ولاته‌كانی ده‌وروبه‌ریدا زال بوو. ولاتی كۆیه و هه‌ریر و تایفه‌ی بلباس و تایفه‌ی موكری و زه‌هاوی هێنا ژێر فه‌رمانی خۆی. هه‌میشه بیست هه‌زار سواری له ژێر ده‌ستیدا هه‌بوو. زۆربه‌ی كوردستان كه‌وتبوو ژێر فه‌رمانی.

## باسی شه‌ری سوله‌یمانخان له‌گه‌ل رۆسته‌مخانی سوپاسالار.

له‌ولاوه پاش ئه‌وه‌ی كه شاسوله‌یمانی سه‌فه‌وی، خان ئه‌حمه‌دخانی له سوله‌یمان پاشا جیا كرده‌وه، كه‌وته بیری سزادان و نابووت كردنی. روسته‌مخانی سوپاسالاری به چل هه‌زار سواری به‌كار كرده مه‌عموری ئه‌وكاره و بۆ شاره‌زووری به‌ری كرد.

كاتێك ئه‌و هه‌واله گه‌یشته سوله‌یمان پاشا، فره تێكچوو. گورج فه‌رمانی دا له‌شكری كۆ بێته‌وه. له ماوه‌یێكی كه‌مدا نیزیكه‌ی بیست هه‌زار كه‌س كۆ بووه. پاشان له‌گه‌ل گه‌وره‌پیاوانی كورد ته‌گبیری كرد و گوتی: ئه‌گه‌ر ئێمه له جێگای خۆمان بمێنینه‌وه له‌شكری ئێران به بێ

بەرزین وڵاتی ئێمە وێران دەکات. وا باشترە بە ئامادەیی بە پێشوازیانەوە بچین. لە هەرچیێکی گەیشتنە یەك شەر دەست پێبکەین و پیاو و ناپیاو لێك جیا بنەوە.

گشتیان لەگەڵ ئەم پێشنیارە هاودەنگ بوون بەیانی تەپڵی بزوتن لێدرا و لە رێگای سیروان و جوانڕووەوە رێگایان بری، لە سنقر تێپەرین و لە دەشتی ئەسفەندئاوا سەریان وەدەرنا. خان ئەحمەدخانی ئەردەڵان لە رویشتنی ئەوان ئاگادار بوو، خۆی تێ ئەگەیاند چونکە سوپاسالاری عەجەمی لە بەرابەر ئەردەڵاندا دەدی و پاشای ئێرانیش دوژمنایەتی دەست پێ کردبوو. گوتی بۆچی خۆم تووشی زەحمەت و هیلاکی بکەم. ئەگەر لەم سەفەرەدا سەربکەوی، کاری باش دەبێ و لەگەڵ ئێمەش باشتر دەحاوێتەوە. ئەگەر لەبەر لەشکری پاشا بشکێ ئێمە بە مەبەستی خۆمان دەگەین. بە کورتی لەشکری ئێران لە چیای «ئالمە لولاغی» پێنج فەرسەخی هەمەدان لەگەڵ لەشکری سولەیمان پاشا پێك وەربوون. لە هەرتك لاوە پاڵەوانان هاتنە مەیدانی شەر و پیاومێیان نواند. لە بەیانەوە هەتا رۆژئاوا شەر درێژەی کێشا وخەڵکێکی زۆر کوژرا.

سولەیمان پاشا خۆی لەشکری قزلباشی پەلامار دەدا. رۆستەم خانی سوپاسالاریش خەڵکی بۆ شەر هان دەدا. لە بناری چیا خوێن وەك چۆمی جەیحون دەرویشت و سەر وەك گۆ خلور دەبوونەوە. لەو شەرەدا لەشکری قزلباش خۆڕاگرتر بوو. لەشکری کوردان روو لە کز بوون بوو. هەر چەندی سولەیمان پاشا لەشکری بۆ خۆ راگری هان دەدا فایدەی نەبوو. بە جارێك مەیدانیان بۆ بەجێ هێشت و رایان کرد. ناچار سولەیمان پاشاش وەدوای لەشکرە شکاوەکە کەوت. لەشکری قزلباش راویان نان هێندێکیان کوشتن. سولەیمان پاشا زۆر بە زەحمەت رێگای دەبری و خەمی ئەو کارەساتە گەورەی دەخوارد. لە رێگای سنقری کولیایی بە سەرەو بەرەو وڵاتی خۆی دەیکوتا. دوو شەو و رۆژ لە ئەسپی دانەبەزی و سەعاتێك نەحەساوە. لەو لاوە خان ئەحمەد خان دەیویست رێگای پێ بگرێ بەڵام گەورەپیاوانی وڵات لەو خەیالە پەشیمانیان کردەوە و گوتیان ئێستا کە سولەیمان پاشا تووشی ئەو بەڵایە بوە، لە دابی عەشیرەتیدا باش نیە کە تۆ رێی پێ بگری. لە بەر ئەوە وازی لەو خەیالە هێنا. ناوبراو بەزەحمەت خۆی گەیاندەوە شار و وڵاتی خۆی. لەو سەفەرەدا شەش هەزار کەس لە خەڵکی بابان و هاوڕێیانی پاشای ناوبراو کوژرابوون. وڵاتەکانی موکری و زەهاوی لە دەست چوونە دەر. ناوچەکانی ئەردەڵان درانەوە بە خان ئەحمەد خان. چونکە لەو سەفەرەدا منەتی لەسەر بوو.

بە گشتی سولەیمان پاشا دوای ئەم کارەساتە ماوەیەك حەسایەوە و خەریکی قەرەبوی ئەو شکانە بوو. لەوپەری پاکی و باشیدا دەژیا.

هەرچی وەگیری کەوتبا دەیدا بە خەڵکی بابان و بژیوی ماڵ و منداڵی خۆی لە ڕێگای حەڵاڵەوە ئامادە دەکرد. بیست و یەك ساڵ بەم جۆرە ژیانی بردە سەر و پاشان ساڵی ١٠٩٨ بە دەستی فەقێ برایمی کوژرا.

## چۆنیەتی کوژرانی سولەیمان پاشا بە دەستی فەقێ برایمی

ئەو فەقێ برایمە، فەقێیەك بوو لە مەدرەسەی قەڵاچوالان دەیخوێند. لە سەر مەزرا یان ئاشێك لەگەڵ خزمێکی خۆی کێشەی دەبێ. دێتە کن سولەیمان پاشا. پاش بیستنی قسەکانیان بە گوێرەی شەرع و یاسای حکومەت داواکاری خزمەکەی فەقێ برایم بە هەق دەزانی و ملکەکەی دەدا بەو. خەڵاتێکیش دەدا بە فەقێ برایم و بە ڕێی دەکا. بەڵام فەقێ برایم قینی پاشا لە دڵ دەگرێ و چاوەڕوانی دەرفەت دەبێ کە دەست لە پاشا بوەشێنێ. بە گوێرەی ئەو قسانەی کە پاش کوشتنی پاشا لە فەقێ برایمیان بیستوە گوتبووی: من قەد بیرم لە کوشتن پاشا نەکردبووە. تا دوای نیوە شەو کە دەرگای مەدرەسە داخرابوون، لەبەر چرا موتاڵام دەکرد. لە ناکاو پیاوێکی ڕەشپۆشی بە سام، کە بە دیتنی لەرزم لێهات و زمانم بەسترا، وەژوور کەوت. گوتی: ئەی فەقێ برایم مەترسێ، هەستە برو بەو خەنجەرەی لەبەر پشتت دایە سولەیمان پاشا بکوژە. گوتم لە دەوروبەری کۆشکی پاشا قەرەوڵ هەن، چۆن دەتوانم بەو شەوە بچمە ژووری و ئەم کارە بکەم؟

گوتی: تۆ نازانی دەتوانی بە سەربانیدا بچیە ژووری. خودا ویستوویە ئەو کارە بەدەستی تۆ بکرێ. هیچ کەس تۆ نابینێ چونکە ژیانی ئەو تەواو بوە.

فەقێ برایم بەو شەوە بۆ کوشتنی پاشا دەکەوێتە ڕێ. بە دەوری ماڵیدا دەگەڕێ و جێی سەرکەوتن دەبینێتەوە و دەچێتە سەربان. لەوێوە دەچێتە سەر دارێك و لە سەر دارەکەوە بە بێ ترس دەچێتە خوارێ. بێ ئەوەی کەس ببینێ دەگاتە ژووری پاشا، سەبروکە دەرگا دەکاتەوە و خەنجەرێکی لە سەر دڵی دەدا لە پشتەوە دێتەدەر. هەر بەو خەنجەرە پاشا دەمرێ.

فەقێ برایم هەر بەو ڕێگایەدا دەگەڕێتەوە هیچ کەس ئاگادار نابێ. سەری خۆی هەڵدەگرێ و هەڵدێ. بەڵام لەبەر ئەوەی خودای تەعالا خوێنی پیاوی گەورە ون ناکات، فەقێ لە هیچ کوێ ناحاوێتەوە و هەدا نادا. هەمیشە ئەم شار و ئەم شار دەکا و ڕازی ئەو ئاشکرا دەبێ لە هەموو لایەکەوە بۆ گرتنی ئەو وەخۆ کەوتن. تا لە میسر دیتیانەوە بە دەست بەستە هێنایانەوە بۆ قەڵاچوالان. خەڵکی بابان هەموو لەشیان بە خەنجەر لەت و پەت کرد. پاشان تازیانەیان گرت و سەلیم پاشای کوڕی سولەیمان پاشایان لە جێی بابی دانا و لە سەر کورسی حوکمڕانی دانیشت. کاری وڵات باش برەوی پەیدا کرد. سەلیم پاشا

لەگەڵ خان ئەحمەد خانی والی ئەردەڵانیش فرە نێوانی خۆش بوو.

## باسی حکومەتی سەلیم پاشا

سەلیم پاشا بە پێچەوانەی باوکی موخلیس و دوستی پاشای ئێران بوو. هەمیشە بە ناردنی دیاری شا سولەیمانی سەفەوی لە خۆی رازی دەکرد. پاش دە ساڵ حوکمرانی ئەو، شا سولەیمانی سەفەوی کۆچی دوایی کرد. شا سولتان حوسێن بوو بە پاشا. سەلیم پاشا بۆ دیتنی چوە ئیسفەهان. دەڵێن بە زێڕ و مەتاڵ و چەکەوە لە خزمەت پاشا راوەستابوو. خەڵك لە سام و هەیبەتی ئەو والیان ور مابوو. چونکە کەسی وەك ئەو بە سام و زەلام لەو مەجلیسەدا نەبوو.

بە هەلکەوت رۆژێك سولتان باری عام دەدا. سەلیم پاشا لەوی رادەوەستی. لەنەکاو بەندی زرێی شەلواری دەپسێ. ناوبراو بە دل لە خودا دەپاڕێتەوە و داوای داپۆشینی ئەو بەلایە دەکا. هەر ئەو دەم بێ ئەوەی کەس بزانێ بەندی شەرواڵی چاك دەبێتەوە تا ئەو دەمەی لە خزمەت پاشا دەگەڕێتەوە. هەر چەند ئەو حکایەتە سەیرە و لەگەڵ ئاقڵ رێك ناکەوێ، بەلام هیچ شتێك لە قودرەتی خوا بەدوور نیە. سەلیم پاشا ئیجازەی لە پاشا وەرگرت و بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە. تەمەنی بە خۆشی رادەبوارد. ساڵی هەزار و سەت و سێزدە مرد و محمد پاشای برازای بوو بە حوکمرانی ئەو مەلبەندە.

## باسی حاڵی محمد پاشا

محمد پاشا پیاوێکی سەخی و بە هیمەت بوو. بۆ نیشاندانی گەورەیی فرە هەوڵی دەدا. هەورو قاپ و قاچاغی سفرەی لە ئاڵتوون بوو. لە بەر ئەوە بە محمد پاشای سفرە زێڕین ناوبانگی کرد. چونکە لە وەزعی ئەو باش ئاگادار نیم، بەناچار قەڵەم لە نوسینی ئەو وازی هێنا. بە گشتی چوار ساڵ لەم جیهانەدا ژیا و پاشان مەحمود پاشا بوو بە حوکمران و ئەویش ماوەیەك لە جیهاندا ژیا.

## حکومەتی خانە پاشا.

ساڵی هەزار و سەد و بیست و دوخانە پاشا بوو بە حوکمران. کار و باری وڵاتی رێك و پێك کرد. هەر وەکو پێشتر نووسرا، لە بەر شپرزەیی وەزعی سەفەوی و دەسەڵاتی ئەفغانیەکان، خانە پاشا دەسەڵاتی پەیدا کرد. خاکی ئەردەڵانی بەلامار دا و گرتی. هەباسقولیخانی حاکمی ئەوێ خۆی پێ را نەگیرا و بۆ ئیسفەهان رای کرد. خانە پاش تا پێنج دەرسەخی هەمەدانی خستە ژێر دەسەلات. چوار ساڵی لەو مەلبەندەدا بەسەر برد. پاشان لە ترسی دەست درێژی ئەحمەد پاشای حاکمی بەغدا، بۆ بابان گەڕایەوە. هەلیخانی کوری خۆی

کرده حاکمی ئەردەڵان. کار و باری خەڵکێشی بە جوامێر ئاغای بابیره گەورەی نووسەر ئەسپارد. لەبەر ئەوەی مەبەست نووسینی رووداوەکانی بابانە، واز لە باسی دیکە دێنم. بە کشتی ساڵی هەزار و سەت و سێی کۆچی، خانە پاشا مرد و عەلیخان گەراوە بۆ بابان و بوو بە حاکمی ئەوی. پاش دە ساڵ حوکمرانی ئەویش کۆچی دوایی کرد.

## حکومەتی محمد پاشا

ساڵی هەزار و سەت و چل و چوار محمد پاشای برای کار و باری حکومەتی گرتە دەست. دوازدە ساڵ بە سەر ئەم وڵاتەدا حوکمرانی کرد. دەڵێن لە ئاخیری کاردا دەستی بە زوڵم و زۆری کرد و لەگەڵ خەڵك بە پێچەوانەی داد و ئینساف دەجووڵایەوە. بۆیە کەوتە بەر نووك و دوعای خەڵك و مقەستی ئەجەل رەگی ژیانی پەڕاند.

## حکومەتی مەحمود پاشا

ساڵی هەزار و سەت و پەنجا و شەش مەحمود پاشای برازای بوو بە حاکمی وڵات. پیاوێکی سەخی و فرە بە رەحم و بە دین بوو. لەگەڵ خەڵك بە باشی دەجوڵاوە. لە بەر نەبوونی سیاسەت کار و باری تووشی بەشێوی بوو. پاش هەژدە ساڵان برایم پاشای ئاموزای دژی رابوو. دوو ساڵ شەریان کرد، ئاخرەکەی مەحمود پاشا کوت و پر مرد.

## حکومەتی برایم پاشا

ساڵی هەزار و سەت و حەفتا و شەش، برایم پاشا بوو بە ئەمیر و ڕێبەری ئەوم. پیاوێکی بە فێز و توند خوو بوو، وەك پاشایان دەژیا و رەفتاری دەکرد. دەڵێن تا ئەو قسەی نەکردبایە، کەس نەیدەتوانی لەکن وی بپەیڤێ. داب و رەسمی لە وڵات دامەزراند. هێندی لە گەورە پیاوانی وڵاتی گرت و ماڵ و سامانی لێ زەوت کردن. بیست ساڵ بەم جۆرە رۆژگاری بردەسەر. کاتێ بۆ بەغدا دەچوو لە ڕێگا کۆچی دوایی کرد

## حکومەتی سولەیمان پاشا

ساڵی هەزار و سەت و نەوەد و شەش سولەیمان پاشا لە جێی بابی دانیشت. چوار ساڵ حوکمرانی کرد و پاشان عوسمان پاشای کوڕی مەحمود پاشا کە پیاوێکی رەشید و بەهێز بوو، هێندی گەورەپیاوانی وڵاتی لەگەڵ خۆی کردە هاودەست و لەبەر لە سولەیمان پاشا هەڵگەرایەوە و حوکمرانی داگرت. ناوبراو رایکرد و بە زەحمەت خۆی گەیاندە بەغدا.

## حکومەتی عوسمان پاشا

عوسمان پاشا سالی هەزار و دوو سەت لە سەر کورسی حوکمرانی دانیشت. دەستی کرد بە بەخشین و دیاری دان بە خەڵك. چوار ساڵ لە حکومەتی رابرد. لە سێ فەرسەخی ئەلاچوالان شارێکی دروست کرد و ناوی نا سولەیمانیە. سولەیمان پاشای کوژراو لە ئاخری ژیانیدا کەوتبووە خەیالی دروست کردنی ئەو شارە، بەلام مەرگ ئەمانی نەدا. ئاخرەکەی عوسمان پاشا ئاواتی ئەوی بە جێ گەیاند و ناوی سولەیمان پاشای لە سەر دانا. ماوەیەك بۆ ئەو کارە پارەی خەرج کرد و زەحمەتی کێشا. پاشان لە ئەلاچوالانەوە بۆ شاری سولەیمانیەی گواستەوە. و بەدوای ئەودا حاکمەکانی بابان هەر یەك شتێکیان لێ زیاد کرد. تا ئێستاش نیزیکەی پێنج هەزار ماڵ لەو شوێنە دەژین.

بەگشتی سولەیمان پاشای گوری براییم پاشا بەنای بۆ والی بەغدا برد. ناوبراو رێزێکی زۆری لێ گرت و لەشکرێکی زۆری خستە ژێر فەرمانی. سولەیمان پاشا بە هیوای شەر لەگەل عوسمان پاشا بە ئالوکە کەوتە رێ. عوسمان پاشاش لەو لاوە لە هاتنی لەشکری بێگانە ئاگادار بوو. فەرمانی کوبونەوەی لەشکری دا. لە ماوەیەکی کەمدا پێنج هەزار سوار لە دەوری کۆ بوونەوە و بۆ پێشوازی شەر کەوتنە رێ.

لە سێ مزلی سولەیمانیە دوو لەشکر گەیشتنە یەك. شەرێکی توند رووی‌دا. عوسمان پاشا خۆی لەو شەردا بەشدار بوو. لە جەنگەی شەردا سێ قامکی دەستی راستی بە شیر بەرین. لەگەل ئەوەش لە ئازایەتی ئەو کەم نەبووە. دەلێن عبدالرحمن پاشا براچکولەی ئەو کە سیفەتی رەشیدی ئەو لە شوێنی دیکە باسی دەکرێ، بریندار بوو. سەری قەلشا بوو لە مەیداندا لە ئەسپ کەوتبووە خوار. لەو کاتەدا عوسمان پاشا بە لایدا تێ دەپەری. پێ‌ی گوت: ئەوە چی‌یە عبدالرحمن، بو وا کەوتووی؟ هەستە و شەر بکە. گوتی: برینەکەم زۆرە. چەك و زرێم پێ هەل ناگیری. بە بێ یارمەتی کەسێك ناتوانم سوار بم.

عوسمان پاشا توڕێ سەر کونەی کرد. لە سەر زین داهاتەوە و هەر بە دەستە بریندارەکەی کە پتر لە دوو قامکی نەبوو، پشتێندی برای گرت و لە عەرزی هەلیگرت و لە سەر زینی دانا وگوتی: ئەگەر لیدەری خوت سزا نەدەی، دەتکوژم. بە هەلکەوت هەر ئەو کابرایە توشیان بوو. عبدالرحمن پاشا بەزمبرێك بە عەرزی دادا.

بە گوتنی هەر دو لەشکر حەشریان دەکرد. لە ئاخری رۆژدا لەشکری عوسمان پاشا سەرکەوتنی بە نسیب بوو. لەشکری بەغدا شکا و هەلات. کوردەکان کەوتنە دوایان و خەلکێکی زۆریان کوشت.

عوسمان پاشا بە تالانیکی زۆرەوە گەراوە بۆ ولاتەکەی خوی. سێ سالی دیکەش بە حوکمرانی مایەوە. پاشان کوچی دوایی کرد.

## حوکمرانی عبدالرحمن پاشا

سالّی هەزار و دوسەت و حەوت عبدالرحمن پاشا لە سەر کورسی حکومەت دانیشت. کار و باری ئەو هەریمەی رێك و پێك کرد. هەمیشە مەیل و سرنجی بە لای پاشای ئێران، ئاغا محمد شای قاجاردا بوو. بە ناردنی دیاری و بەخشین دلی وی لەخوی رازی دەکرد.

خالید پاشای کوری محمد پاشای ئامۆزای بۆ داوای سەروکایەتی راست بووە. لەشکری ساز کرد. نیوەی خەلکی بابان لەگەلی هاودەنگ بوون. بەلام لە ترسی عبدالرحمن پاشا رەگەلی نەکەوتن. پێنج سەت سواری بەکار لەگەل خالیدپاشا یەك بوون. سی هەزار سوار لە لایەن عبدالرحمن پاشاوە بۆ نەهێشتنی ئەو دەنگە دران. لە دوو مزلی سولەیمانیە گەیشتنە یەکتر. هاوریێانی خالید پاشا لە دیتنی ئەو لەشکرە دلیان دەلەرزی. چونکە پێنج سەت کەس لەگەل سی هەزار کەس چی پی دەکری؟ لەو کاتەدا خالید پاشالەگەل سوارەکانی لە سەر تەپرلکەیەك راوەستا بوو. دوژمن وەك ئالقە دەوریان گرتبوو.

خالید پاشا لە حوکمی چاردا لەشکری دەبینی. نووسەر لەم کتێبەدا ئەت شیعری نەنووسیوە. بەلام بۆ ئەو شیعرە چارە نیە. ناوبراو لە کاتی دامان و ناچاریدا کە ریگای ئەجاتی نەدەبینی و لە رەشیدی و ئازایەتیدا ئەسفەندیار و رۆستەمی پی هیچ نەبوو، نێزەی لە نێزەداری وەر دەگرت و ئەو شیعرەی خوێندەوە. لە جل و بەرگی پاشایەتی و دەرویشیدا ئاسودەیی نابینم. ئەگەر ئاسودەیی هەیە لە کفندا هەیە. ئەوەی گوت و لە سەررا خوی بە لەشکری دوژمن دادا. هەرچی دیتی وەبەر شیرانی دا. کەس خوی لەبەر را نەگرت. خودای تەعالا باش ئاهومیدی سەرکەوتنی بە نسیب کرد. ئەو لەشکرە گەورە شکا و هەلاتن. خالید پاشا وەدوایان گەوت. هێندێکی کوشت و هێندێکیشی بە دیل گرتن، تا شەش فەرسەخی سولەیمانیە راوی نان. هەلاتوانی لەشکر خویان گەیاندەوە عبدالرحمن پاشا. ناوبراو ناچار خوی بۆ مەیدان سوار بوو. دوو هەزار کەسی دیکەی رەگەل کەوت و بە پەلە کەوتە ری. بەیانیەك هەرتك لەشکر گەیشتنە یەك. شەر دەستی پیکرد. عبدالرحمن پاشا کە وەك پلنگ وا بوو، لە پێش هەمواندا پەلاماری دەبرد. ئەم جارە عبدالحمن پاشا سەر کەوت. خالید پاشا شکا و تا بەغدا را نەوەستا و پەنای بۆ والی برد. بەم زوانە گەرانەوە و حکومەتی ئەو باسی دەکری.

بە کشتنی پاشای ناوبراو بە سەرکەوتنەوە هاتەوە سولەیمانی. بەلام هێندی لە گەورەپیاوانی لی لالوت بوون. شەوێك دەرفەتیان هێنا و رایان کرد چونە بەغدا رەگەل خالید پاشا کەوتن. دوو سال لە نیشتمان ئاوارە بوون. پاشان والی بەغدا لەشکرێکی بۆ خالید پاشا ساز کرد و نیزیکەی دوو هەزار کەس خەلکی بابانیش لەدەوری کۆ بوونەوە. بەو لەشکرە ئامادە و پەرداخەوە بۆ شەری عبدالرحمن پاشا و گرتنی

بابان کەوتە ڕێ. لەو لاشەوە پاشا ئەو خەبەرەی زانی. بە لەشکرێکی گەورەوە بۆ لێدانی ئەو کەوتە ڕێ. ڕۆژی چوارەم دوو لەشکر پێك وەربوون. خالید پاشا بە توندی هەوڵی دەدا. لەشکری عبدالرحمن پاشا توانای شەڕی نەما و پشتی لە دوژمن کرد و هەڵات. پاشای شکاو لەگەڵ قەومی خۆی جەڵەوی وەرگێڕا و تا شاری بابان خۆی نەگرت. خالید پاشا بە دوای ئەودا گەیشتە شار. عبدالرحمن پاشا لە سولەیمانیەش خۆی پێ ڕانەگرا دەستی لە مڵك و ماڵی هەڵگرت و لە ڕێگای کرماشانەوە پەنای بۆ دەوڵەتی ئێران برد و بوو بە پەنابەری فتحعەلیشا.

خالید پاشا گەیشتە سولەیمانیە و لەسەر کورسی حکومەت دانیشت. ژن و مندالی عبدالرحمن پاشا کە هەموو کچە مام و خالی خالید پاشا بوون لە کۆشکی حکومەت دەرکران و ماڵ و سامانیان داگیر کرا.

ئاوبراو لە تاران چوە خزمەت شاهەنشای ئێران و بە خێر هاتن کرا. بڕیار درا کە دار و دەستە و کەس و کاری سالێك لە ناوچەی کوردستان و کرماشان بمێننەوە. تا ساڵی دادی لە بەهار خەریکی ئامادە کردنی ئامرازی شەڕ بن. ئاوبراو بە خەڵات و نشانەوە بۆ شوێنی دیاری کراو ڕویشت.

کە بەهار داهات، عبدالرحمن پاشا جارێکی دیکەش چووە بارەگای پاشا و فرەجولاخانی هەوشار تسقچی باشی سەرۆکی تیپ لەگەڵ دوو هەزار سوار بۆ خزمەتی ئەو دیاری کران. فەرمان درا بە ئەمانولاخانی والی کوردستان کە کومەکی بکا.

عبدالرحمن پاشا لە بارەگای شاوە گەڕایەوە. هەزار سواری بە کار و دلاوەری خۆی هەڵگرت و لەگەڵ فرەجولا خان چوە سنووری مەریوان کە هەوەلی خاکی بابان و ئاخری عەرزی ئەردەڵانە. ئەمانولا خانی والی-ش بە ڕسمی عێلی و بە فەرمانی شا کەوتە ڕێ. لەو لاشەوە خالید پاشا ئاگادار بوو و لە والی بەغدا داوای یارمەتی کرد. سولەیمان پاشای حاکمی بەغدا، عەولا پاشای کەیای خۆی کە لە عێراق وەزیر بوو لەگەڵ دە هەزار سواری عەرەب «مبطه و ینکی چری»۱ بە یارمەتی خالید پاشاوە نارد. لە وڵاتی بابانیش چوار هەزار سوار ئامادە بوو. بە هەموو لەشکرەوە بۆ سنووری ئاوبراو ڕویشت. لە بەنا دەریاچەی مەریوان کە سیفەتی ئەو لە جێگای خۆیدا باس دەکرێ هەرتك سوپا گەیشتنە یەك. عبدالرحمن پاشا سواری ئەسپە کوێتی ناو لەتحی ببوو، باسکی تا ئانیشکان هەڵکردبوو. لە پێش سەفی لەشکردا دەهات و دەچوو. کاتێکی تیپی ئەمانولاخانی والی و فرجولا خانی نسقچی باش نیزیك بوونەوە لە سەفی خۆیەوە بە تەنیا چوە کن والی و کوتی: ئەورو عەرەبی هاتووم. یانی وەك سەیدی عەرەبان کە لە کاتی تەنگانەدا پەنایان بۆ خێڵی یەکتر دەبرد.

ئەمانوڵاخان وڵامێکی شایانی داوە. عبدالرحمن پاشا بۆ جێگای خۆی گەڕایەوە. لەولاوە خالید پاشا و عەولا پاشای کیبیا لەشکری خۆیان ئامادە کرد و بە ئامادەیی راوەستان. لەرمولی لەشکری هەرتك لا خۆیان پێك دادا و شەر ساز بوو. بە هەلکەوت جوگەیەکی ئاوی سێ گەز بەرین کەوتبووە نێوانیان. سوارەی خالید پاشا لە بوارێك دەگەڕان کە عبدالرحمن پاشا رکێفی لێدا و لە جوگە پەڕیەوە هێندی لە ئازایان بە دوای ئەودا لە جوگە پەڕینەوە. سوارەی خالید پاشا کە لە بوار دەگەڕان، دوژمنیان لە پشت سەری خۆیانەوە دیت. تا ویستیان بگەڕێنەوە و دەست بە کار بن، عبدالرحمن پاشا بە سەریاندا گوراندی و شیری لێ هەلکیشان. ناچار هەلاتن و گەیشتنە سوپای خالید پاشا. بەلام عبدالرحمن پاشا بە بێ ترسی خۆی بە سوپای دوژمن دادا. دوو لەشکر بە نێو یەك وەر بوون گەلێك لە پالەوانان کوژران.

ئاخرەکەی لەشکری خالید لاقی ئیختیاریان لەرزی و پشتیان دە شەر کرد و هەلاتن. عبدالرحمن پاشا وەك پلنگی تورە سەری دە دوو نان. نسقچی باشی و ئەمانولاخانیش بە دوایدا. لەو شەرەدا لە عەرەب (چریکی نوێ) زۆر کوژران. هێندی لە ترسان خۆیان دە ئاوی هاویشت و لە دەریاچەدا نقوم بوون. عەولاپاشای کیباش بە دەستی یەکێك لە هاورێیانی عبدالرحمن پاشا بە دیل گیرا. خالید پاشا لەگەل دەستەیەکی کەم بە زەحمەت خۆی نەجات دا. بەلام لەو شەرەدا هێندی لە گەورەپیاوانی بابان کوژران و بریندار بوون. لەوانە سەلیم بەگی برای عبدالرحمن پاشا کە لاوێکی بە شەوکەت و بە سام بوو، بریندار بوو و لە رۆژی چوارەمدا مرد. خەلك بۆی تازیەدار بوون. ئەمانولاخان و فرجولا خان لە تازیمانەیدا لەگەل عبدالرحمن پاشا بەشداریان کرد. پاش تازیمانە عەولا پاشای کیبایان لەگەل پیاوانی خۆیان بۆ بارەگای پاشای ئێران نارد. ماوەیەك لەوێ حەبس بوو. پاشان ئازاد کرا و چووە بەغدا و لە دواییدا بوو بە والی ئەوی کە لە جێگای خۆیدا باسی دەکرێ. بە کشتی عبدالرحمن پاشا چووە بۆ حکومەتی بابان و ئەمانولاخان و نسقچی‌باشی هەر یەکەی چوونەوە شوێنی خۆیان. خالید پاشا ئیتر دەرفەتی حکومەتی بۆ هەل نەکەوت و لە خاکی عەرەبستان گۆچی دوایی کرد. دەستە و دایرەکەی هاتنەوە کن عبدالرحمن پاشا و عالو کران.

پاشان ناوبراو لە حوکمرانی خۆیدا فرە بەهێز بوو هەر دوو ساڵ جارێك دەچوە بارەگای شای ئێران و شا لوتفی لەگەل دەکرد. وێنەی ئەو لە باخی نیگارستان لە دەور و بەری تاران کیشراوە. تا ئیستا هەمیشە لەگەل ئەمانولاخانی ئەردەلان نێوانیان ناخۆش بوو بەلام لەت نەگەیشتە شەر و کوشتار.

کە دەساڵ لە سەربەخۆیی ئەو تێپەری فێز و فوز دەماخی لێ

پەیدا بوو. کەمێك لە خزمەتگوزاری ئێران کەمی کردەوە. لەگەڵ والی بەغداش دوژمنایەتی بوو. لە زەمانی حکومەتی ئەودا کار و باری بابان باش پەرەی گرت. پانایی وڵات زیادی کرد. کۆیە و هەریر و رەواندز و سەردەشتی هێنایە ژێر فەرمانی خۆی. هۆی داگیر کردنی کۆیە ئاوا بوو که پاش مردنی خالید پاشا، سولەیمان پاشای والی یەك دوو ساڵان لەگەڵ عبدالرحمن پاشا ناکرکی نەما. بە نامەی پڕ لە محبەت و بە قسەی دڵرفێن ناوبراوی هێنا ژێر دەسەڵاتی خۆی. کاتێ بانگی کردە بەغدا ئەوپەری رێزی لێگرت و پەیمانێکی توندو تۆکمەیان بەست و لە ئاخریشدا هەتا سەر نەبوو. هەر وەك بە درێژی باسی دەکرێ.

## کوشتنی محمد پاشا لە لایەن عبدالرحمن پاشاوە.

لەوکاتەدا محمد پاشای حاکمی کۆیە و هەریر-یش لەوی بوو. پاشا لەگەڵ ئەو محبەتێکی زۆری هەبوو. دەڵێن هەمیشە بە کوری خۆی بانگ دەکرد. ئەو پاشایە لە بنەماڵەکانی قەدیم و بابەلباب لەو وڵاتە خاوەن فەرمان بوون. کاتێ والی بەغدا عبدالرحمن پاشای بۆ مەجلیسی خۆی بانگ دەکرد، محمد پاشاشی خەبەر دەدا. ئەو کەسەی دەچو ئاگاداریان بکا دەیگوت: پاشایان بە ناوی خوا ئەمیر ئێوەی ویستوە. عبدالرحمن پاشا ئەوەی لە دڵ گران دەهات. چونکە خۆی لەوکەسانە بە زیادتر دەزانی. لە بنەوە قینی لە محمد پاشای کۆیە هەڵگرتبوو، لە دەرفەتێك دەگەرا زەبرێکی لێ بدا. بە هەڵکەوت سولەیمان پاشای ئەمیر هەردوکیانی بە رۆژێك ئێزن دان. کاتی بە رێکردنیان بە عبدالرحمان پاشای گوت کە محمد پاشا لە رێزی کورەکانی منە. وریا بە قەت بیری خەراپی لێ مەکەوە ئەگینا سزات دەدەم. بە کورتی هەردوکیان بەرەو وڵاتی خۆیان کەتنە رێ. کاتێ چوار منزل رویشتن عبدالرحمن پاشا لە دڵدا گوتی، ئێستا کاتی تۆڵە کردنەوەی ئەو قسانەیە. بەڵام محمد پاشا کە دووسەت کەسی لەگەڵ برو هەمیشە نێو فەرسەخ لەوان دوور دەرۆیشت. لە عبدالرحمن پاشا دەترسا. ناوبراویش بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەوا ن لە نێو بەرێ. رۆژێکی لە رێگادا گەیشتنە یەك، عبدالرحمن پاشا دەستی کرد بە مێهرەبانی و شیرین زمانی. کاتی گەیشتنە قوناخ، لەگەڵ دوو سێ کەسان لە مزلی محمد پاشا دابەزی. بە لەشکرەکەی گوت، من لە مزلی محمد پاشا تاوێك دەحەسیمەوە، ئێوە بچن لە ئۆردوی خۆتان دانیشن. محمد پاشا کە قەت خۆی وا نەدەدیت کە عبدالرحمن پاشا ئاوا لەگەڵی بە مەیل بێ، واقی ورمابوو. ئەوەی پێویست بوو لە دیاری و پێشکێش بۆی ئامادە کرد. ناوبراو دوای سەعاتێك چووە ئۆردوی خۆی.

رۆژی دوایە لەوێ باریان کرد بۆ مزلێکی دیکە. محمد پاشا ویستی سەری عبدالرحمن پاشا بداتەوە. پیاوێك لە باوەر پێکراوەکانی

که ناوی «ئاغا شینه» بوو، له نێو تایفەدا به زێر و عاقل ناسرابوو گوتی: محمد پاشا ئەو خەیالەی تۆ راست نیه. عبدالرحمن پاشا که خەسلەتی پلنگی هەیە، کەی وا باووه که له پێش تۆدا بێته سەردانت. ئەوه بیرێکی دیکەی هەیه.

محمد پاشا گوتی ئەو برچوونەی تۆ راست نیه. عبدالرحمن پاشا بەو داب و دەزگایەوه بۆ دیتنی من پێشدەستی کردوه، له دابی پیاوەتی دووره که من سەری نەدەمەوه.

هەر چەند ئاغا شینەویستی لەو فیکره پەشیمانی بکاتەوه فایدەی نەبوو. ئاخرەکەی گوتی: ئێستا که تۆ بەقسەم ناکەی منیش لەم ئوردویه بار دەکەم. ئەوەی گوت و دار و دەستەی خۆی هەلگرت و چوه سەر ئەپولکێکی بەرز و به نیگەرانیەوه چاوەری بوو کار به کوێ دەگا.

به کشتنی محمد پاشا لەگەل سێ چوار کەس چوه ئوردوی عبدالرحمن پاشا. ناوبراو چەند کەسی نارده پێشوازی. به رێز و حررمەتەوه هێنایانن. که گەیشتی و تاویك حەسایەوه، رووی تێکرد و گوتی: ئەی محمد بلوکی کوڕه جی‌یەك نیه بەسەر بلوکانی دیکەدا زیدەیی هەبی. بلێ بزانم تۆ ئەو پایەت له کوێ وەگیر کەوتوه لەکن والی بەغدایه خۆت بێنیه رێزی من و داوای بەرابەری بکەی. هەر چەند ئەو فەقیره پارایەوه و خودای هێنا تکایه، فایدەی نەبوو. ئەمری کرد بەتکیان دە ئەستووی کرد و لەت و پەتیان کرد. پاشان گوتی: کاری ئێمه لەگەل ئەمیری بەغدا تەواو بوو. دەبی بیبرینەوه. پێنج سەد سواری بۆ تالانی ئوردوی محمد پاشا دەنگ دا. سوار له جێی خۆ بزوتن ویستیان بیانو بێننەوه که ئاگایان لەو کاره نیه. پاشان هاواریان کرد که راوه بەرازه. واته وەدوای بەراز کەوتووین. ئاغا شینه له دوور نیگەران بوو. زانی که ئەو فەقیره کاری تەواوه. هاواری کرد گوتی: منیش زانیومه. ئەوەی گوت و رێگای خۆی گرتەبەر.

له ماوەی دوو سەعاتدا له ئەشیا و زەلام هیچ شتێك نەما. سەت کەسیك لەو هەرایەدا کوژران. هێندی به زەحمەت خۆیان قوتار دا. عبدالرحمن پاشا هەر لەوێ نامەیەکی بۆ دەفتەرداری بەغدا که وەکیلی بوو نووسی و له کوشتنی محمد پاشا ئاگاداری کرد که بەلکوو له خزمەت وەزیر عوزری بۆ بخوازێ.

ئاشکرایه له دەولەتی عوسمانی‌دا رەسم وایه که ئەو کەسانەی والی هەریمی گەورەن وەك عیراقی عەرەب و ئەناتولی و رومیلی، به وەزیر بانگ دەکرێن. ئەوانه پایەی وەزیری سولتانیان هەیه. که وابوو لەمەو دوا که باسی والی بەغدا بکەین، به وەزیری ناو دەبەین.

به کشتنی قاسیدی ناوبراو به نهێنی چوه بەغدا. نامەکەی دا به دەفتەردار. پاش خوێندنەوەی دووکەل له هەناسەی هەستا. چونکه هەمیشه پاکی و راستی عبدالرحمن پاشای گوتبوو. یەکجار زۆر ترسا

و بەشوکا. ناچار دەستی لە گیانی هەڵگرت و چوە کوشکی وەزیر و کاتی نوێژی وەڵوور کەوت. وەزیر هەستی کرد کە کارەساتێك قەوماوە. گوتی: ها چت پێیە. چما عبدالرحمن پاشا شتێکی لێ قەوماوە. کابرا وەلامی نەداوە و هەر وا راوەستا. وەزیر گوتی: لام وایە فێڵێکی لە محمد پاشای گوێیە کردوە. دەفتەردار بە ناچاری نامەکەی دایە. لە تەماشا کردنی وەها توورە بوو کە دەستی کرد بە گریان و بە سەری خۆی دادەدا. گورج هەڵێکێشا خەنجەر و دەفتەرداری کوشت. پاشان فەرمانی دا لەشکر ئامادە بێ. سێ هەزار سواری لەگەڵ برایم پاشای کوری سولەیمان پاشا خست و کردیە مەعموری بابان. ئەو لاشەوە عبدالرحمن پاشا گەیشتەوە وڵاتی خۆی و چەند رۆژێك حەسایەوە. لەبیر هەواڵی لەشکری بەغدای پێ گەیشت. دەست بەجێ لەگەڵ خەڵکێکی زۆر بۆ بەربەرەکانی دوژمن کەوتە رێ.

پاش پێنج رۆژ پێش کەرەولی لەشکری عێراق وەدەر کەوتن. عبدالرحمن پاشا وەك لافاو پەلاماری دان و شکاندنی. خەڵکێکی زۆر کوژرا. تالانێکی زۆر نسیبی لەشکری سەرکەوتوو بوو. ئەوانی مانەوە لەگەڵ سولەیمان پاشا هەتا چوونی بەغدا لە هیچ کوێ گیر نەبوون.

وەزیری بەغدا لە رادە بەدەر تێکچرو خۆی کەوتە بیری نابوت کردنی عبدالرحمن پاشا.

فەرمانی کۆ بوونەوەی لەشکری زۆری دا. نامەی بۆ عیل و عەشیرەتی عەرەب و وڵات و ئەولاولا نووسی. لە ماوەیەکی کەمدا لەشکرێکی زۆر لە ژێر ئاڵای وەزیر کۆ بوونەوە. لەولاشەوە عبدالرحمن پاشا لەگەڵ سەرۆك و گەورەپیاوانی بابان راوێژی کرد و گوتی: خەڵکی عێراق لەو سەرکەوتنەی ئێمە ترساون. ئەگەر دەستیان لێ هەڵگرین لەوانەیە وەزیری بەغدا لە هەموو لایەکەوە خۆ ئامادە بکا و پەلاماری وڵاتی ئێمە بدات. ئێستا وا باشە پێش ئەوەی ئەو نانی بەیانی بدا بە مە، ئێمە نانی شەو دەرخواردی ئەو بدەین. لە سایەی خوداوە لەشکرێکی ئامادەمان لە سوار و پیادە هەیە. باشترە عێراق پەلامار بدەین و بناغەی کاری دوژمن لەبەریەك هەڵتەکێنین.

سەرۆك و گەورە پیاوان گوتیان تۆ چی دڵتی وا دەکەین. بە دل و گیان چاومان لە فەرمانی تۆیە. پێشتر گوترا کە عەولا پاشای کۆیا لە شەری مەریوان گیرا و ناردرایە بارەگای شای ئێران. لە وێشەوە ئێزن درا و چووە بەغدا. بە قسەی شەیتان و شرخاران، سولەیمان پاشای وەزیر لێی وەشك کەوت و خەریك بوو بیکوژی. ناوبراو هەستی پێکرد. نیوەشەو لەگەڵ یەك دوو کەس هاورازی خۆی رای کرد و پەنای بۆ عبدالرحمن پاشا برد. لەوکاتەدا ئەویش لە ئوردوی ناوبراو بوو. عبدالرحمن پاشای بۆ چوونی بەغدا هان دا.

بە کورتی عبدالرحمن پاشا لەوێ خۆی سوکبار کرد. دەهەزار

سواری بەکاری هەلبژارد. هێندێکیشی لەگەڵ تالانی وەدەست کەوتوو گێراوە و ڕێگای بەغدای گرتە بەر. خەبەری هاتنی ئەو بە وەزیر گەیشت. هێندێکی دیاری کردن کە لە پشتەوەی عبدالرحمن پاشا هەموو پرد و بوار و جۆگەلان بروخێنن و تێک بدەن تا بەجارێک ڕێگای گەڕانەوەی لێ بگیرێ. ئەو ڕێگایەی لە سولەیمانیەوە بۆ بەغدا دەچێ چوم و جوگەی گەورەی تێدان. هێندی پردی لێ دروست کراون. بە شەوی تاریک خەلکی ناشارەزا زەحمەتە لەوێ تێپەڕن.

## شەڕی عبدالرحمن پاشا لەگەڵ وەزیری بەغدا و گرتنی ئەو شارە

بە گشتی عبدالرحمن پاشا کەوتە ڕێ و هەتا ئەراغ شاری بەغدا ڕانەوەستا. وەزیر لە هاتنی ئەو ئاگادار بوو. لەگەڵ لەشکرێکی گەورە لە بەغدا هاتە دەر، سێ تۆپیشی لەگەڵ خۆی هێنا. بەرەبەیانێکی زوو عبدالرحمن پاشا بەغدای لێ وەدەر کەوت. نوێژی سبینێی کرد. لە هاتنەدەرێ لەشکری وەزیر کە تیپ تیپ وەدەر دەکەوتن ئێگەران بوو. لە زۆری ئەو لەشکرە سەری سوڕما. لە ئەسپی هاتەخوار و سەرۆک و دلێرانی بە ناوبانگی کۆ کردنەوە و گوتی: ئەو شەو ئێمە دەسەعاتە ڕێ هاتووین، ئەسپەکانمان کەوتوون و خۆمان هیلاکین. ئەگەر دەتانەوێ شەڕ بخەینە سبەینێ. هێندێک گوتیان ڕاستە، ئەورۆ حەسانەوە پێویستە. سبەی ئێشەلا شەڕ دەست پێدەکەین. هێندێکی دیکە گوتیان ئەوە کارێکی باش نیە. چونکە ئەگەر ئەمڕو شەڕ بخەینە سبەی، وەزیری بەغدا پتر خۆ ئامادە دەکات. کە ئەمڕو ئەو ئامادەییە نیە. چونکە ئەمشەو خەلک نوستوون و هیچ بە خەیالی شەڕ نەبوون. ڕۆژێکی‌تر خەلک لە دەوری کۆ دەبنەوە و ئێمە توانای بەرامبەریمان نابێ.

عبدالرحمن پاشا ئەو قسەی پەسند کرد و گوتی هەر ئەمڕو ئەو کارە ببڕینەوە. پاشان گوتی: ئەی پالەوانانی بابان و لاوانی کوردستان! شەڕێکی توند و دژوارمان لە پێشە. هەر تایفە و عەشیرەتێک هاومەیدانی خۆتان دیاری بکەن تا کاری ئێوە باش دیار بێ.

لە پێشدا عبدالقادر بەگ و کەیخسرەو بەگی سەرۆکی جافی مرادی، کە لەو سەفەرەدا سێ هەزار کەسیان لەگەڵ بوو، گوتیان: ئێمە کارمان بە لەبیلەی عەرەبان هەیە، لەگەڵ ئەوان شەڕ دەکەین تا پیاو و ناپیاو دەرکەون.

هەزیز بەگی کوری خالید پاشا کە زاوای عبدالرحمن پاشا بوو، بە ئازا و ڕەشید ناسرابوو، خۆی بە ڕوستەم و ئەسفەندیار دەزانی، چوە پێش و گوتی: من لەو سەفەرە سەد کەسم لەگەڵە، گرتنی توپخانە بەمن بسپێرە. پاشا بەزەیی پێداهات و گوتی: ڕۆلە ئەگەر نەیان گوتبا بابان

ئەولادی خۆیان هەلداوێرن و شەریان پێ تاکەن، ئەت نیجازەم نەدەدا. چونکە ئەمرو تۆ نە باوکت هەیە و نە برا. بەلام مروڤ لە مەرگ نوتار نابی. هەمرو بۆ خاك دەگەرێنەوە. هەرچی خوا بیکا هەر ئەو دەبیّ.

پاشا گوتی: تیپی وەزیر کە هەمرو تازە چریك ن بە من بسپێرن. لەواریان ئاوا دا و قالبچەیان خوێند و هەریەك چونەوە سەلی خۆیان و ئامادەی شەر بوون. لەولاشەوە وەزیر لەشکری خۆی ریّك و پێك کرد و لەبەر هەرتك لەشکر پێك وەربوون و شەر دەست پیکرا. وەك باس کرا هەر تایفەی لەگەل حەریفی خۆی بەرەورو بوو.

بەر لە ئاوهەلات بە نیزە و خەنجەر پیێك وەربوون. وای لیهات کە لە ئەسپان دابەزین و بەرۆنکی یەکیان گرت. بە چەنگ و ددان تێك بەربوون. تا رۆژئاوا شەر درێژەی کێشا. شەو دەستیان لە شەر هەلگرت و هەریەك چوونەوە ئوردووی خۆیان. ئەوروژ هیچیان سەرنەکەوتن.

عبدالرحمن پاشا لەبن بەردێك دانیشت و لغاوی ئەسپی بە دەستەوە گرت و گوتی: کەس حەقی نیە لە کەس و خەلکی خۆی بکەری. هێندیّ لە گەورەپیاوانی بانگ کرد و گوتی: شەری ئەمرو فرە توند بوو. لە خەلکی ئێمە زۆر کوژراون. ئێستا بێژن خەیالتان چیە، بۆ بزووتن و راوەستان لەسەر چ بریار ئکن.

هەمو بە جارێك گوتیان، لە شەری ئەمرو زەبری قورسمان ویکەوتوە تولەی ئەو شکانەمان بۆ ناکرێتەوە. کەمێکمان ماوە. خودا دەزانی کە ئێوە گیانێك دەگەینەوە سنووری بابان یان نا. لەوەی زیاتر توانای شەرمان نیە.

عەبدالرحمن پاشا گوتی: ئێستا راوەستن تا شەو درەنگ دەبی، ئەودەم بەرەو ولاتی خۆمان دەگەرێنەوە. بریاری ئەوەیان داو هەریەك چوونە گوشەیەك. پاشای ناوبراو ئەحمەدبەگی هەلەبجەی بە سەد سوارەوە بۆ کێشك دانا. ئەوەك دوژمن بەشەو بەسەریان دادا، لەولاشەوە وەزیری بەغدا لە شەری ئەو روژە خەمبار و ترسا بوو. چونکە نیوەی لەشکری نەمابوو نەیدەتوانی خۆی رابگری. هەر ئەوشەوە لەگەل دەستەیەك بۆ نێو عەشیرەتی عەرەب هەلات. لەشکرەکەشی بلاوەی کرد و لەو ئوردووی گەورە کەس بەجێ نەما.

ئەحمەد بەگ کە بۆ قەرەولی دانرابوو، نیگەرانی ئوردووی وەزیر بوو، دەنگێکی نەدەبیست. کەمێك نیزیکتر بووە. نیوانی لەشکرەکان سەعاتێك بوو. ئەحمەدبەگ گەیشتە ئوردووی دوژمن و کەسی نەدیت. کەیفخۆش بوو، خۆی گەیاندە خیوەتی وەزیر ئەشیای وی کو کردەوە سەد هێستری هێنا و بە کەیفی خۆی باری کردن. سوارەکانیشی بەشی خۆیان هەلگرت. پاشان کەسێکی نارده کن پاشا و مزگێنی راکردنی وەزیری بۆ برد. عبدالرحمن پاشا بە شوکرانەی سوژدەی برد. ماوەیەك لە خودا پاراوە پاشان لەگەل لەشکری خۆی چوە ئوردووی وەزیر و لە

خیوەتی ئەو دابەزی. لەشکریش ئوردوویان تالان کرد.
بەیانی عبدالرحمن پاشا لە جێگای وەزیر دانیشت. کوژراوەکانیان بژارد، سێ هەزار کەس کوژرابوو. کەلاکی عەزیز بەگی کوری خالید پاشا کە گرتنی توپخانەی وە ئەستوی گرتبوو، دە لولەی توپی‌دا دوزرایەوە. چل کەسیش لە پیاوەکانی کوژرابوون. سەد و پەنجا کەسیش لە توپچییەکانی وەزیر بە شیری ئەوان کوژرابوون. نێزەی عەزیز بەگی لە سەر توپەکە چەقابوو. عبدالرحمن پاشا هەرچەند فرە دلرەق بوو بەلام بۆ عەزیز بەگ گریا و خەلکەکەش دەستیان بە گریان و هاوار کرد.
عبدالرحمن پاشا سێ روژان خەریکی کفن و دفنی کوژراوان بوو. لەو شەرەدا دەهەزار کەس کوژرابوون. پاشان بریاری گرتنی شاری بەغدای دا و لەشکری لە پشت قەلا و دیواری بەغدا کۆ کردەوە. لەولاشەوە خەزنەدار و مۆر هەلگری وەزیر کە هەردوکیان ئازا و بە کار بوون دیواری شاریان توکمە کرد و خەریکی قەلا و بەرژین بوون. لەشکری بابان یەکدوو جار هێرشی برد، بەلام سوودی نە بوو.
عبدالرحمن پاشا و لەشکرەکەی مانگێک لە دەشتی مانەوە. پاشان پەیامێکی توندی بۆ خەلکی بەغدا ناردو گوتی: ئەگەر دەروازەی شار نەکەنەوە و ئەو دوو کەسەش بە دەست بەستراوی نەهێننە کن من، بیتوو بە زوری شار بگرم، قەلاچوتان دەکەم و حەوت شەو و روژان فەرمانی کوشتار دەدەم.
کاتێک ئەو پەیامە گەیشتە خەلکی شار زور ترسان. زانیان کە عبدالرحمن پاشا قسەکانی بە راسی دەکات. هاودەست بوون و کوشکی ئەو دوو کەسەیان پەلاماردا و دەستی هەردوکانیان بەست.
هەر ئەو روژە دەروازەی شاریان کردەوە و رێگای پاشایان دا بۆ شار. لەشکری وی ویستیان تالان بکەن. پاشا ئەمری کرد جار بکێشن هەرکەس دەست لەمالی خەلک بدات، دەکوژری.
خەلک بە ئاسودەیی هەرکەس وەدوای کاروباری خوی کەوت و لە ئەمان‌دا بوون. پاش سێ روژان خەزنەدار و مورهەلگری هێنا و ملی هەردوکیانی پەراند. گەورە گەورانی بەغدا پول پول دەهاتن داوای بەزەییان دەکرد. ناوبراو بە گوێرەی شانی هەرکەس دلنیایی دەدایەوە. پاشان هێندی لە سەروکانی شاری بانگ کرد و بۆ دیاری کردنی وەزیر راوێژی پێکردن. ئێکرا گوتیان بە حکومەتی تۆ شادین و بێحگە لە تۆ کەسی‌ترمان بۆ سەروکایەتی عێراق ناوێ.
گەورەپیاوانی بابان گوتیان: پاشا دابی کوردی و رەسمی عەشیرەتی وەلا نانێ. دەست لە ولاتی خوی هەلناگری. چونکە ژیان لە عێراق دژوارە. ئەو چرایە ئەوەندە روناکی نیە. بە نان و دوی خومان دەسازێین و خەریکی کاری خەلکی‌تر نابین.

## هەڵبژاردنی عەبدوڵا پاشا بە والی بەغدا لە لایەن عبدالرحمن پاشاوە

بەیانی ڕۆژی هەینی عبدالرحمن پاشا چووە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی. عبدالله کەیای بانگ کرد و لە پێش هەموو گەورە پیاوانی بەغدا کردی بە والی عێراقی عەرەب.
هەوڵ گەسێکی پەیمانی لەگەڵ بەست، خودی عبدالرحمن پاشا بوو. لە نێو کۆبونەوەی گشتی هەستا و سڵاوی لێ کرد و دەستی ماچ کرد. پاشان دەستە دەستە هاتن و پەیمانیان بەست. ناوبراو بە سەربەخۆیی لە سەر تەختی دانیشت. عبدالرحمن پاشا هەموو ڕۆژی دەهاتە بارەگای ئەو و کار و باری خەڵکی جێبەجێ دەکرد.

## کوشتنی سولەیمان پاشا لە لایەن عەشیرەتێکی عەرەبەوە

لەولاشەوە سولەیمان پاشا چەند ڕۆژێك لە چوڵی سەرگەردان بوو. ئاخرەکەی پەنای بردە بەر عەشیرەتێکی عەرەب کە چەند ڕۆژ بحەسێنەوە و پاشان تەگبیرێك بۆ خۆی بکا. ئەو عەشیرەتە چوار ڕۆژ وە ئەستووی خۆیان گرت. شەوێکیان هێندی لە لاوانی ئەو عەشیرەتە ڕێك کەوتن و لێی وەژوور کەتن و کوشتیان. سەریان بڕی و هێندی لە سەروکەکانیان سەرەکەیان هەڵگرت و بردیانە لای عبدالرحمن پاشا و ڕوداوەکەیان بۆ گێڕاوە.
عبدالرحمن پاشا لەو کارەساتە فرە نارەحەت بوو. سەعاتێك گریا. پاشان گوتی: بۆچی دەستی بێ‌ڕوحمیتان هەڵێنا و ئەو فەقیرەتان کوشت. ئەمیری وەك سولەیمان پاشا لە هیچ دەور و زەمانێکدا نەبوە ئەوەی گوت و فەرمانیدا بیانکوژن. لەشکر دەستبەجێ هەموویان کوشتن. دەڵێن هەتا سولەیمان پاشا زیندو بوو، عبدالرحمن پاشا وەزیری تازەی دیاری نەکرد.

## شەڕی عبدالله پاشا لەگەڵ عبدالرحمن پاشا و شکان و هەڵاتنی بۆ ئێران

وەك گوتمان ناوبراو عیراقی بە تەواوی ڕێکوپێك کرد و شەش مانگان لە بەغدا مایەوە. کار و باری وڵات بە قامکی ئەو دەگەڕا. ئەو وەزعە بە دڵی عبدالله پاشا نەبوو. بەڵام لە ناچاریان ڕایدەبوارد. جارێك هێندی گەورەپیا و ماقولی بەغدای بانگ کرد و لە کردەوەی عبدالرحمن پاشا و هاوکاریکانی سکالای کرد و گوتی: مادام ئەو پیاوە

لەو وڵاتە بێ کەس نابێ لە گیان و ماڵی خۆی ئەمین بێ. فیکرێك بکەنەوە کە شەری ئەو لەسەرتان لابچێ.
گوتیان عبدالرحمن پاشا لەشکرێکی زۆری لەگەڵە. لەگەڵ ئەو توانای بەربەرەکانیمان نیە. چار ئەوەیە کە لەپێشدا بە فێڵ لەشکرەکەی بڵاو بکەین. ئەودەم لەبەین بردنی ئاسانە. قەرار و مەداریان دانا و هەرکەس بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە.
ڕۆژێکی‌تر وەزیر بە عبدالرحمن پاشای گوت: تۆ دەبێ ساڵێکی دیکەش لەم وڵاتە بی هەتا کاروباری وڵات ڕێکوپێك بێ. ئەگەر لەشکری تۆ لە مانەوەی زۆر خەمبارن، هێندێکیان ئیجازە بدە با بۆ وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە. عبدالرحمن پاشا هیچ بیری لە فرۆفێڵی ئەو نەکردەوە. سوارەی جاف و هێندی خەڵکی بابانی ئیزن دا بۆ وڵات بگەڕێنەوە. خۆشی لەگەڵ هەزار کەس لە لاوان و ئازایان لە بەغدا مایەوە. مانگێکی دیکەش تێپەری، وەزیر هەمیشە بۆ نەهێشتنی ئەو لە راوێژ و بیردا بوو. وردە وردە عبدالرحمن پاشا ئەوەی بیستەوە، تورە بوو. ئەمری کرد ئەو هەزار کەسەی لەگەڵی بوو بە چەکەوە لە بارەگا ئامادە بن. خۆشی شیری هەڵگرت و بۆ نەهێشتنی وەزیر ڕێگای داگرت. لەولاوە وەزیر لە بزوتنەوەی ئەو ئاگادار بوو، ترسا. چونکە توانای پێشگیری نەبوو. قازی و موفتی پاشای هێنا تکایە خۆشی پەنای بۆ بارەگای شێخ‌عبدالقادر برد و لەوێ مات بوو. قازی و موفتی هاتنە کن پاشا و ئەوەندەی توانیان پاکانەیان بۆ کرد. عبدالرحمن پاشا لەو تووڕەیی و قینە هاتەوە سەرخۆ. پاشان بردیانە بارەگای شێخ عبدالقادر و لەگەڵ میرزا ئاشتیان کردنەوە. بەڵام بەدوای ئەودا پاشا دڵنیا نەبوو. بە تاڵان و ساڵێکی زورەوە بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە. وڵاتی کۆیە و هەریرو ڕەواندزیش کەوتنە بەر دەسەڵاتی ئەو. لەگەڵ ئەوەش دەسەڵاتی لەسەر بەغدا کەم نەبووە. ئەگەر کەسێك مەبەست و کارێکی گەورەی هەبایە لە بەغدا دەهاتە سولەیمانیە و ئەنجامی کاری خۆی لە عبدالرحمن پاشا دەخواست.
وەزیر لەم وەزعە زۆر خەفەتبار بوو. دیسان لەگەڵ خەڵك بە هێدی و ئارامی دەیبردە سەر. زوڵمی لە خەڵکی نەدەکرد. لە ئاکامدا خەڵکی عێراق لەگەڵی بوونە یەك و لایەنگر و دوستی زۆر بوون. پاشان کۆبونەوەیەکی پێك هێنا و خەڵکی داوەت کرد. داوای دەلیری خۆی و خراپەکاری عبدالرحمن پاشای بۆ باسکردن و لە دەست درێژی ئەو سکاڵای کرد.

پیاو ماقولانی بەغدا و شێخی عەرەب بەزمییان پێدا هات. هەموو سوێندیان خوارد کە هەتا گیانیان لەبەردایە دەست لە دوژمنایەتی عبدالرحمن پاشا هەڵناگرین و لە زینی لێز و لوتبەرزی دەیبێنینە خوارێ. عبدالله پاشا لە قسەی ئەوان شاد بوو. لە ماوەیەکی کەمدا لەشکرێکی گەورەی کۆکردەوە. پاشان سەعاتی باشی دیاری کرد و بۆ گرتنی بابان کەوتەرێ. عبدالرحمن پاشا لەو روداوە ئاگادار بوو. فەرمانیدا لەشکر کۆ بێنەوە. جارێکیتر لێنەی نووستو وەخەبەرهات. بە شەش هەزار سوارەوە بۆ پیشوازی شەر چوو. لە پێنج منزلی بەغدا توشی لەشکری عێراق بوو. بێ راوەستان لەشکر پێك وەربوون و شەر دەست پێکرا. ئەوجارە لەشکری بەغدا و عەرەب خۆیان راگرت و ئەوەندەیان هەولدا کە لەشکری بابان شکا. وەدوایان کەوتن و سوار و ئەسپیان وەسەریەك گێران. پاشا خۆی پێ ڕانەگیرا و بە پەلە پەنای بۆ دەوڵەتی ئێران برد. لەو هەموو لەشکرە زۆرە سێزدە کەس لەگەڵی رویشتن. ئەوانیتر لە گەورە و پیاو ماقول و پالەوان لە خزمەت وەزیر سەریان دانواند و داوای لێبوردنیان کرد. ناوبراو لییان خۆشبوو، دەستی لێهەلگرتن. سولەیمان پاشای کوری پاشای کە پێشتر باسی کرا کردە حاکمی بابان و فەرمانی دا خەڵك سەری بۆ دابنوێنن. هەر لەویوە ناردی بۆ سولەیمانیە و خۆی چووە بەغدا.

سولەیمان پاشای ناوبراو بەرەو وڵاتی بابان و شارەزوور کەوتەرێ. لەولاشەوە عبدالرحمن پاشا تەواوی رێگای بە خێرایی بری و تا شاری کرماشان لە هیچ کوێ رانەوەستا. خەبەری هاتنی ئەو گەیشتە شازادە محمدعەلی میرزای کوری شاهەنشا و حوکمرانی ئەو مەڵبەندە. هێندێ گەورەپیاوی شاری ناردە پیشوازی. بە جا و جەلال هێنایانە نێو شار. لای شازادە رێزی لێگیرا و رێ و رەسمی جۆر بە جۆریان بۆ پێك هێنا. بەڵام ئەودەم عبدالرحمن پاشا لە دەزگای پاشادا لە پێش نەبوو، شای ئێران لە کردەوەکانی دڵگیر ببوو. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە پاش ئەوەی عێراقی گرت هێندێ لە رەسمی نوکەرایەتی کەم کردەوە لێز و لوتبەرزی زیادی دەکرد. چونکە خودا ئەخلاقی توند و تیژی پێ رەوا دیبوو. هەر بۆیە دەزگای دەوڵەتی لێی لالوت بوو. شازادە محمدعەلی میرزا لە کن شازادە داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد. باسی شکان و لێکەوماوی بۆ نووسی و ناردیە خزمەت پاشا. پاشا لەوەلامدا نووسی کە عبدالرحمن کوری ملجم رێگای دیداری ئێمەی نیە. بە گەیشتنی ئەم نامەیە سەری ببرە و بۆ ئێرەی بنێرە!

شازادە گەلێك پەریشان بوو بەڵام ئەو قسەی بە عبدالرحمن پاشا نەگوت. سەر لەنوێ تکای بۆ کرد دیسان قبول نەکرا. ناچار خوێ چوە تاران و بە شای گوت: هەتا نشانەی منت پێ نەگات نەیە تاران و ڕێگای داگرت و گەیشتە خزمەت پاشا. لەسەر لێخۆشبوونی عبدالرحمن پاشا پێداگرت، تا عافوو کرا. نامەیێکی بۆ نووسی و بانگی کردە بارەگای پاشا. دوای گەیشتنی نامەکە گورج چوە تاران و کەوتە بەر عافوی پاشایانە. کاروباری ئەو بە محمدعەلی میرزا ئەسپێردرا. ئەسپێك بە زینی ئالتون و قایش و خەنجەرێکی ناپابیان بە خەڵات دایە. بەڵام وایان دانا کە پاش چونەوەی وڵات و وەدەست هێنانی سەربەخۆیی، کوڕێکی عبدالرحمن پاشا وەك بارمتە لە تاران بمێنێتەوە. پاشان لەگەڵ شازادە گەڕایەوە بۆ کرماشان.

## گەڕانەوەی سەرلەنوێی عبدالرحمن پاشا بۆ حکومەتی بابان بە یارمەتی ئێران.

پاش ماوەیەکی کەم خەڵکێکی زۆری بابان لە دەوری کۆ بوونەوە. شازادەش یارمەتی‌دا و بەرەو بابان کەوتەرێ.

سولەیمان پاشا خەبەری بزووتنی وی پێگەیشت. توانای شەری لەخۆیدا نەدی، ڕای کرد. ناوبراو بەبێ گیر و گرفت هاتەوە سولەیمانیە و لەسەر کورسی حوکمرانی دانیشت. دیاری و پێشکێشی زۆری لەگەڵ عوسمان بەگی کوری بۆ بارەگای پاشا و خزمەتی محمدعەلی میرزا نارد. ئەودەم ئیتر بەرهەڵستیکی نەما. چونکە سولەیمان پاشای کوری برایم پاشاش مرد. هەر دوو ساڵ جارێك لە تاران یا لە لە چیمەنی سولتانیە دەچوّ خزمەت پاشا و دەگەڕایەوە. بیست و چوار ساڵ بەم شێوەیە ژیانی بردەسەر و پاشان کۆچی دوایی کرد. خەڵکی وڵات لە تازیەی ئەودا خەفەتبار بوون. بە داب و رەسمی عەشیرەتی تازیانەیان دانا. لە هەموو وڵاتی کوردان، بە تایبەت لە ئەردەڵانەوە هاتنە سەرەخۆشی. دوو مانگی تەواو تازیانەی بەردەوام بوو.

عبدالرحمن پاشا پیاوێکی بێباك بوو یەکجار رەشید و ئازا و بەسام. بە پاکی و عیبادەت مەشهوور بوو. یەکجار دلرەق و بێباك، خودا تورە و دلرەشی دروست کردبوو. لە هەموو شەرێکدا خوێ لەپێشەوەی لەشکر بوو. رەحمەتی خوای لێبێ، حەشریێ. . .

## باسی حکومەتی مەحمود پاشا

سالی سالی هەزار و دووسەت و سی و یەکی کۆچی مەحمودپاشا کورە گەورەی عبدالرحمن پاشا لەسەر کورسی حکومەت دانیشت. خەڵکی بابان پەیمانیان لەگەل بەست. بەگوێرەی یاسای باب و باپیرانی کاروباری وڵاتی بەباشی بەرێوە دەبرد. ئەوکەسانەی زۆر و خاوەنی عەقل و بیر و را بوون، لای ئەو رێزیان هەبوو. پلە و پایەی شایانی پێ دەبەخشین. هێندی خەڵکی وڵات ئێرەیی‌یان پێدەبرد. عبدالرحمن پاشای مامی مەحمود پاشایان بەهەوای حکومەت لێ هاندا. نیومشەو بۆ کرماشان هەڵاتن و چوونە کن محمدعەلی میرزا. شازادە گەلێك رێزی لە عبدالله پاشا گرت. پاش ماوەیەك هەزار سواری خولامی تایبەت و تیپێك سەربازی گورانی رەگەل خست، نیزیکەی هەزار کەسیشی خەڵکی بابان لەگەڵ بوو، بۆ گرتنی سولەیمانیە و لێدانی مەحمود پاشا کەوتنە رێ.

لەولاشەوە مەحمود پاشا لە هاتنی وان ئاگادار بووچەمێ هەزار سواری لە بابان و لە جاف هەلبژارد و بە پێشوازی شەرەوە چوو. لە جێگایەك بە ناوی «کرشکی ئەسپان» گەیشتنە یەکتر. مەحمود بەگی مامی نووسەر کە لە هەموو وڵاتی کوردان کەس وەك ئەو رەشید و جوامێر نەبوو، پیاوێك بوو لێ‌هاتوو و جوان‌چاك، کە باسی هێندی حالات و شەری ئەو لە جێی خوی دا دەنووسری، ئەودەم پێشقەرەولی لەشکر بوو، رووی دەمەرکەس دەکرد بەعەرزی دادەدا.

لە جەنگەی شەردا فەتاح بەگی براچکولەی ئەو کوژرا. ناوبراو خوی پێوە خەریك نەکرد هەرومما شەری درێژە پێدا. ئەوەندەی درێژە پێدا کە ئەو لەشکرە گەورە شکا. بیست و چوار برینی تی‌بوون. لەوانە گوللەیەکی وە ئەژنوی کەوتبوو. لەگەل ئەوەش کابرای لێدەری خوی لە سەر ئەسپ بەعەرزی دادا و لەژێر سمی ئەسپ پانی کردەوە. لەشکری کرماشان هەڵات و مەحمود پاشا سەرکەوت.

دوای هەڵاتنی ئەوان پاشا هەر لەوێ دابەزی، چوە سەر سەری مەحمود بەگ و گریا. ئەو رۆژەی حاجی بەگی مقرب کە خوشکی ژنی پاشا بوو، برینی زۆری لی‌بوون. لەوانە شیریکی وەسەری کەوتبوو کە پاش چل سال شوێنی بەقەد بەری دەستی هەر دیار بوو. مەحمود پاشا دەروژان لەو شوێنە مایەوە چونکە هەڵگرتنی ئەوان زەحمەت بوو. پاش دەروژان لەسەر دارمەیتیان دانان و بۆ سولەیمانیە گەرانەوە. نژداری ئەرمنگی لە ئازەربایجان هاتن و برینەکانیان چا کردنەوە.

به کورتی هەلاتوەکانی سوپای کرماشان چونەوە کن شازادە. محمد عەلی میرزا تورە بوو. هەر ئەودەم فەرمانی دا لەشکر کۆ بێتەوە. لە ماوەیەکی کەمدا پازدەهەزار کەس لەژێر ئالای ئەودا ئامادە بوون. خۆی رووی لە سولەیمانیە کرد. هەرچەندی مەحمود پاشا نامەی پارانەوەی بۆ نووسی، فایدەی نەبوو. ناچار بە پێنج هەزار سوارەوە بۆ شەر کەوتە رێ. لە شوێنێك بە ناوی "قەرە گوڵ" لەشکر گەیشتنە یەك. مەحمود پاشا شکا و گەراوە بۆ سولەیمانی. شازادە وەدوای کەوت و لەسولەیمانێشی دەرپەراند. چوە کۆیە و هەریرێ. محمد عەلی میرزا وەدوای کەوت. مەحمود پاش لە لەلای کۆیە گەمارو درا. یەك دوو مانگ لەدەوری قەلا دانیشتن. ئاخرەکەی تکاکار پەیدا بوون و پێشکێشیان دایە و شازادە گەراویەوە. عبدالله پاشای کردە حاکمی سولەیمانیّ و رێگای کرماشانی گرتە بەر. بەلام لەولاشەوە مەحمود پاشا بەجارێك رووی لە محمد عەلی میرزا وەرگێرا و چارەی لەوەدا دیت کە پەنا بۆ عباس میرزای حوکمرانی ئازەربایجان بەرێ. روستەم بەگی بابی نووسەر کە رێگای بۆ بارەگای نایب‌السلطنە هەبوو، لە ریزی نۆکەرانی شازادە حیساب دەکرا، بە قاسیدی هەلبژارد و رووداوی خۆی بۆ نووسی و لەگەل دیاریەکی باش ناردی. پاش گەیشتنی ناوبراو، نایب‌السلطنە مەحمود پاشای بۆ ئازەربایجان بانگ کرد و لەوی چاکەیەکی زۆری دەگەل کرد. پاش ماوەیەك خەلات و فەرمانی بابانی دایە و ناردیەوە سولەیمانی. عبدالله پاشا تواناى شەرى نەبوو، ولاتی بەجیّ هێشت و چووە کن محمد عەلی میرزا. پاش ماوەیەك لەوی کۆچی دوایی کرد. هاوریٚکانیشی هاتنەوە کن مەحمود پاشا. ئیتر مەحمود پاشا بەرهەلستێکی نەما و بە باشی دەسەلاتی بەسەر کارەکاندا پەیدا کرد. لەو کاتەدا وا هەلکەوت داود بەگی گورجی کە یێکێك لە خولامانی ئەسعەد پاشای والی بەغدا بوو بە تاوانێك تاوانبار کرا، لە خزمەت وەزیر رووی وەرگیرا و پەنای بۆ مەحمود پاشای بابان هێنا. هەرچەند ئەسعەد پاشا داوای کرد، نەیداوە، لە وەلامدا گوتی: ئەو کابرایە پەنای بۆ من هێناوە لەت نایدەمەوە بە تۆ، مەگەر بۆخۆی بخوازی بێتەوە ولات.

والی بەغدا لەو قسانە تورە بوو، قسەی ناحەزی بۆ مەحمود پاشا نووسی. پاش بیستنی ئەو قسانە ناوبراو قینی هەستا و دەستی کرد بە لەشکر کۆ کردنەوە و دوازدەهەزار سواری نامداری ئامادە کرد و بۆ گرتنی بەغدا ئامادە بوو. بەلام لەو سالەدا ولاتی بابان تووشی قاتی و

قەیەکی زۆر بوو. لە ئوردووی پاشا ومزع شپرزە بوو. لەناوچەی کرفری لەشکر گەرایەوە.
ئەو خەبەرە گەیشتە شازادە محمد حسین میرزا. نامەیەکی بۆ مەحمود پاشا نووسی کە تۆ لە بابی خۆت نەبوی، بەڵکی کچی عبدالرحمن پاشای. چونکە شەرەکانی ئەوت لەبیر چوتەوە. کور ئەگەر نیشانەی باوکی پێوە دیار نەبێ ، بە بێگانەی بزانە و بە کوری ناو مەبە.
بە ناوی خودا ئەگەر وەك باوکت بەغدا نەگری و بگەڕێیەوە بەلامارت دەدەم و رەگ و ریشەت دەردێنم. ئەگە لە ئوردودا ئازوخە و خواردەمەنی نیە، ئەوە بەلەدرایی پێویست ئازوخەت بۆ دەنێرم.
پاشان ئەمری کرد لە دەوروبەری زەهاو هەموو جۆرە خواردەمەنی و ئازوخە بۆ ئوردوی پاشا بارکەن.

## گرتنی بەغدا لەلایەن مەحمود پاشا و کوشتنی ئەسعەد پاشای والی ئەوی.

بە کشتی مەحمود پاشا تا پەتا بەغدا لە هیچ شوێنی رانەوەستا. ئەسعەد پاشا ئامادەی شەر نەبوو. ناچار بورج و قەلا و دیواری شاری تۆکمە کرد و خەریکی پاراستنی خۆی بوو. مەحمود پاشا هەموو رێگاکانی گرت و هاتووچۆی خەڵك یەکی گەوت. قاتی کەوتە نێو شار. خەڵکی بەغدا هاواریان لێ بەرز بوو. دەروازەیان کردەوە. مەحمود پاشایان هێنا نێو شار. لەشکر رویان کردە کۆشکی وەزیر و بە دەستبەستراوی هێنایانە خزمەت پاشا. هەر ئەودەم فەرمانی خنکاندنی دا. هەرچەند دایکی گریا و پاراوە و گوتی کوپەیەك ئالتونت دەدەمێ فایدەی نەبوو. ئەو فەلیرە کوژرا و مالیشی تاڵان کرا. بەڵام خەڵکی شار زیانی پێ نەگەیشت. پاشان داودبەگی ناوبراوی هێنا جلی والی کردەبەر و لەسەر کورسی ئەمارەتی دانا. بەگوێرەی دابورەسم دەمێشدا خۆی پەیمانی لەگەڵ بەست و قەرار و مەدار دانرا کە ناکۆکییان نەیەتە نێوان و بە تالان و مالێکی زۆرەوە بۆ ولاتی خۆی گەرایەوە و پێشکێشی باشی بۆ نایبالسلطنه محمد حسین میرزا نارد و بە ئاسودەیی خەریکی کاری حکومەتی بوو. ولاتی کۆیە و هەریری دا بە عوسمانبەگی برا چکۆلەی کە پیاوێکی ژیر و جوامێر بوو. کومەلێکیشی بۆ خزمەتی ئەو دیاری کرد. براکانی دیکەشی سولەیمان بەگ و حەسەنبەگ هەریەکەی ناوچەیەکی پێ ئەسپاردن.

عوسمان‌به‌گ ماوەی شەش ساڵ لە کۆیە بوو. پاشان بە نەخۆشی کوت‌وپڕ مرد. کوڕێکی لە پاش بەجێ ما بەناوی حەمەدەمین بەگ کە لە کاتی خوێندا دەنووسری. مەحمود پاشا لە مەرگی برای خەفەتبار بوو. زۆری پێ‌نەچوو حەمەن‌پاشاش مرد.

## گرتنی سولەیمانی لەلایەن سولەیمان‌بەگی برای مەحمود پاشا و هەڵاتنی مەحمود پاشا بۆ ئێران.

بە کشتنی مەحمود پاشا، شازدەساڵ بەبێ بەشداری کەسی تر بەسەر وڵاتی باباندا فەرمانرەوایی کرد. زۆربەی خەڵکی وڵات بوون بە خاوەنی دارایی و سامانێکی زۆر. ئەوکەسانەی لە نیعمەتی ئەو بەشیان پێ‌نەبرابوو، بە خەیاڵی نابوتی و تێکدانی کاری ئەو رۆژگاریان بەسەر دەبرد. لەوکاتەدا دەرفەتیان هێنا، سولەیمان‌بەگی برای پاشایان هەڵخەڵەتاند و هەوای حکومەتیان بردە دە سەری و رێگای سەرباداو و بەرهەڵستیان پیشاندا. ئەودەم پاشا لەگەڵ برای تۆزی ناکۆکی هەبوو.

ناحەزانیش ئاگری فیتنەیان خۆش کرد. هاندان و بەبەردا خوێندن کاری کردە سەر سولەیمان‌بەگ و کەوتە فیکری کار و راوێژ. لەبنەوە خەڵکێکی زۆر لەگەڵی بوونە هاودەست. لەو کاتەدا کە مەحمودپاشا دەیویست بۆ کۆیە بچی، سولەیمان بەگ رووی لە خزمەتی وەرگێرا و لەگەڵ داروودەستەی خۆی رووی لە بەغدا کرد. ئەوانی لە کوفری دامەزراندو بۆخۆی چوە کن داودپاشای وەزیر و شکایەتی لە کردوەکانی مەحمود پاشا کرد. وەئەستۆی خۆی گرت کە هەموو ساڵس پارەیەك لەوڵاتی بابان بدا بە داود پاشا. هێندی لە نیزیکانی وەزیریشی لەگەڵ خۆی کردە هاودەست.

ئاخرەکەی داود پاشا لەشکرێکی لەگەڵ خست و بۆ حکومەتی بابانی نارد. ناوبراو لە بەغداوە هاتەوە نێو داروودەستەی خۆی و لەویوە بۆ گرتنی سولەیمانی کەوتە رێ. لەولاشەوە مەحمود پاشا لەکاری ئەو ئاگادار بوو، بە لەشکرێکی پەرداخەوە رێگای پێ‌گرت. لە دوو منزلی سولەیمانی هەرتك لەشکر گەیشتنە یەك. لەو شەرەدا خەڵکێك کوژرا و سولەیمان بەگ سەرکەوت. مەحمود پاشا رایکرد وچوّوە خزمەت نایب السلطنەی ئێران لە ئازەربایجان. دوو هەزار سوار و ماڵ و منداڵ چوونە میاندوئاو کە کوندێکی ناسراوە.

سولەیمان بەگ لەسەر کورسی حکومەت دانیشت و لەقەبی پاشایی وەرگرت. خزمەتکارەکانی پێشوو هەرکەس بە ئەندازەی خۆی

پلە و پایەی پێ بەخشی. لە دارودەستەی مەحمود پاشا هەرکەسی وەبەر چنگ کەوت گرتی. مەحمود پاشا چوە کن نایب السلطنە و زۆریان رێز لی‌گرت. مزلی لە بارەگای شازادە درایە. دوو مانگ لەوێ بوو. پاشان هاتەوە کن دارودەستەی خوی. چوار مانگ لەوێ بوو. دیسان چووە تەورێز و سی هەزار تمەنی پێشکێش دا بە نایب‌السلطنە. فەرمان درا حبیب‌الله شا سەیوان دیرن و سولەیمانخانی گورجی کە لە پیادە نیزامدا دەرەجەی سەرهەنگی‌یان هەبوو، لەگەل دوو تیپ سەرباز و چوار توپ لەگەلّ مەحمود پاشا بۆ گرتنی سولەیمانی کەوتنە رێ و تا شارەزوور کوتایان. سولەیمان پاشا بە چوار هەزار سوارەوە بۆ پێشوازیان رۆیشت.

## گرتنەوەی سولەیمانی لەلایەن مەحمود پاشاوە و هەلاتنی سولەیمان پاشا و بریندار بوونی.

بەیانی هەر دوو لەشکر پێك وەربوون و شەرێکی توند رووی دا. ئاخرەکەی مەحمود پاشا سەرکەوت. سولەیمان پاشا هەلات و سوارەی سەرکەوتوو بیست فەرسەخ راویان نان. خەلکێکی زۆر کوژرا و بە دیل گیرا. مەحمود پاشا گەراوە بۆ سولەیمانی و لە جیگای خوی دانیشتەوە. سولەیمان پاشا لەگەلّ دارودەستەی خوی رووی کردەوە بەغدا. لە هەلاتن‌دا گوللەیەکی وە باسکی چەپەی کەوت و بریندار بوو.

لە زستانی ئەو سالەدا نایب‌السلطنە شازادە قارەمان میرزای کوری خوی ناردە سولەیمانی کە حەلیمە خاتوونی کیژی مەحمود پاشا مارە بکا. کیژی نایب‌السلطنەش ببیتە دەزگیرانی حەمەسالح بەگی کوری مەحمود پاشا. بەلام هیچ‌کامیان سەری نەگرت. بە گشتی قارەمان میرزا لە تەورێزەوە بەرەو سولەیمانی کەوتە رێ. پاشا لە هاتنی ئەو ئاگادار بوو. خوی و هەموو کاربەدەستانی ولات چونە پێشوازی. دوو مزلّ قوربانی لەپێش کرا. لەنێو شاردا ئەوەندەی لە توانای‌دا بوو دیاری بەنرخ و ئەسپی عەرەبی بە شازادە نیشان دان. لەولاشەوە جیازی بووك و باری جەواهێر و پارچەی نایاب و جلی گرانبها بۆ مالی پاشا ناردران. دەلێن لەو رۆژەدا بەقەد چوار هەزار تمەن بەو دەرکەوانانە دراوە کە ئەشیایان بردوتە حەرەمخانە.

## گرتنەوەی سولەیمانی بە دەستی سولەیمان پاشا بە یارمەتی

## لەشکری عوسمانی و سەرکەوتنەوەی مەحمود پاشا.

بەکورتی قارەمان میرزا چل ڕۆژ لە سولەیمانی بوو. پاشان چووە ئازەربایجان. کاتی ڕویشتنی مەحمود پاشا دیسان دەهەزار تمەنی بە دیاری دایە. ئەوانەی لەگەڵیشی بوون هەریەك بە ئەندازەی خۆی دیاری پێدرا. دیاری دا بە حەبیب الله خان و سولەیمانخانیش. پاش سێ مانگ سولەیمان پاشا دیسان بە لەشکری عوسمانی و خەڵکی بابان مەحمود پاشای پەلامار دا. ئەوی دەر کرد و خۆی لەجێگای دانیشت. مەحمود پاشا چووە کن نایبالسلطنە. جارێکیتر بە یارمەتی لەشکری ئێران بووە بە حاکمی وڵات. لە ماوەی چوار ساڵدا ئەم دوو برایە شەش جار بە نورە بەسەر وڵاتی باباندا زاڵ بوون و لە دەستدرێژی ئەوان وڵات تووشی وێرانی و چارەرەشی بوو.

## واز هێنانی مەحمود پاشا لە حکومەت و سەقامگرتوویی سولەیمان پاشا.

بە هەڵکەوت لەو ساڵەدا، واتە ساڵی هەزار و دووسەت و چل و نۆ، نایب السلطنە مرد. کاری مەحمود پاشا تووشی شپرزەیی بوو. خۆی ناچار وازی لە حکومەت هێنا و لە خانەقایەکی جێگای سەید و شێخی نەقشبەندی لی‌ی دانیشت. سولەیمان پاشا ئیتر بەرهەڵستێکی نەما. بە ئاسودەیی و بە ژیری کاری حکومەتی بەڕیوە دەبرد. هەموو بەیانیان دەچووە کن برای و چاك و چونی لەگەڵ دەکرد. چوار کەس لە خەڵکی بابان سەریان بۆ حکومەتی سولەیمان پاشا نەوی نەکرد. یەکەم حەمەمین بەگی کوری عوسمان بەگی برازای پاشا، دوەم ڕۆستەم بەگی بابی نووسەر، سێیەم حاجی بەگی متصرف خاڵی نووسەر کە خوشکی خێزانی مەحمود پاشا بوو. ئەو دوو کەسە لە زەمانی سەربەخۆیی مەحمود پاشاشدا بەرێز بوون و بۆ کاروباری وڵات راوێژیان پێ‌دەکرا. سەروەت و سامانێکیشیان وسەرپەك نابوو. کاتێك سولەیمان پاشا زاڵ بوو، ئەوان لەترسان هەڵاتن و نەهاتنەوە سولەیمانی لەگەڵ هێندی لە کەس و کاری خۆیان چوونە کەرکوك و لەوێ نشتەجێ بوون. سولەیمان پاشا کە چەند ساڵ بوو چاوەروانی لێدان و ئەوتاندنی ئەوانە بوو، دەیزانی بە زۆر دە روستیان نایە، کەوتە فروفێل. ئەحمد بەگی کورەگەورەی کە سیفەتی حکومەت و کاری ئەو لە جێ‌ی خۆی دەگوتری، لەگەڵ چەند کەس لە پیاوماقوڵانی وڵاتی نارد بۆ دڵدانەوەیان. نامەی مرحیبەت و خۆشەویستی بۆ نووسین، کەلام اللەی

بۆ مۆر کردن و سوێندی خوارد که هەتا زیندوە هیچ فێڵ و زولمێکیان لێ ناکات. هەروەك لەپێشدا لە زەمانی مەحمود پاشادا ژیاون هەر ئاوا دەبێ.

مەحمود بەگی مامی نووسەر کە سفەتی رەشیدی و پیاوەتی ئەو لەپێشدا باسکرا، ئەودەم لە خزمەت سولەیمان پاشادا دەسەڵاتی تەواوی وڵاتی هەبوو. نامەی بۆ برای نووسی کە بێتەوە خزمەت پاشا و هیچ زیانێکیان پێ ناکات.

بەکورتی ئەحمەد بەگ و ئەوانی تر چوونە کەرکوك. چاویان بەوان کەوت. عەهد و پەیمانی توندیان لەگەڵ بەستن. بەتایبەت ئەحمەدبەگ گوتی: ئەگەر بابم بیەوێ فێڵتان لێبکات، بە خوا سوێند لایەنی ئەو بەر دەدەم و بۆ کوێ ئێوە بخوازن دەچم.

بە قسەکانی ئەو دڵنیا بوون و رێگای سولەیمانی‌یان گرتەبەر و پاش پێنج رۆژ گەیشتنە خزمەت پاشا. چەند رۆژێك لە ماڵی خۆیان حەسانەوە. پاشان سولەیمان پاشا بە قسەی ناحەزان عەهد و پەیمانی شکاند. ناکۆکی دەست پێکرد. رۆژێك هەرتکی بانگ کردن. چەند قسەی پێ‌گوتن و لەدوایە فەرمانی گرتنی دان. هەر لە خانوبەرەی خۆی حەبسی کردن. هەریەکەی چوار قەراوڵی لەسەر دانان. بڕیاری دا کە هەریەکەی سەد هەزار تمەن بدەن تا لە حەبس نەجاتیان بێ.

مەحمود بەگ بەو کارە زۆر تێکچوو. رێگای چارپێکەوتنی پاشای بەست. حاجی بەگ لەماوەی دوو مانگدا حەفتا هەزار تمەنی دا بە پاشا. بابی نووسەریش پەنجا هەزار تمەنی دایە پاشان داوای زامنی لێکردن کە ئازادیان بکات و بۆ هیچ کوێ را نەکەن. چوار کەس لە بازرگانانی وڵات بوونە دەستەبەر، کە ئەگەر ئەو دوو کەسە لە فەرمانی پاشا بچنە دەرێ، ئەوان دەهەزار تمەن بدەن بە پاشا. بەو مەرجە نەجاتیان بوو و هاتنەوە ماڵی خۆیان، یەك دوو مانگ مانەوە پاشان چاویکیان بە مەحمود بەگ کەوت و گوتیان ئەو زیانە بوون و ماڵی ئێمەی نابووت کرد. تا زیندووین لە فیکری تۆڵە داین. ئەگەر ئەتۆش لەگەڵ ئێمە خەیاڵی هاوکارێت هەیە، کات دیاری بکە تا لەم وڵاتە برۆین. مەحمود بەگ گوتی: من خۆشم لەو فیکرە دام. ئێستا کار و باری خۆتان قایم بکەن تا من ئاگادارتان دەکەم. قەرار مەداریان دانا و چوونەوە ماڵی خۆیان. چەند رۆژ خەریکی خۆ ئامادە کردن بوون. پاشان لە نێوە شەوێکدا ماڵ و مناڵ و کەس و کاریان هەڵگرت و لەگەڵ دووسەت سواری نامدار لە شاری وەدەر کەوتن و رێگای کەرکوکیان گرتە بەر.

لە یەك لەرسەخی شار تووشی کابرایەك بوون. مەحمود بەگ کە بە پیاوێکی ئازاو جوامێر ناسرابوو، بەو کابرایەدا پەیامی بۆ سولەیمان پاشا نارد و گوتی: ئێمە لە ڕۆیشتن‌دا تاڵووکەمان نیە. ئەشیایەکی زۆرمان پێیە. لەو ڕەشید و پیاو مالولی دەوروبەرت بنێرە تا لە مەیداندا لێکی دەرکەین و واز لە قیشاڵ بێنین.

بەیانی کابرا چوە کن پاشا و قسەکانی مەحمود بەگی پێ‌گوت. ناوبراو باش نارەحەت بوو. دەست بەجێ هەزار سواری لەگەڵ ئەحمەد بەگی کوری وەدوای خستن. لە دوو منزڵی سولەیمانی خۆیان گەیاندنێ. کاتی بەهار بوو. ڕێژنەی باران چومیکی خستبوونە نێوانیان. مەحمود بەگ هاواری کرد ها پاڵەوانان! ئێستا ڕۆژی شەرە هەرکەس دەیەوی شەرمان لەگەڵ بکا، با بێتە پێش و تاوێك لە مەیدان خۆی بگرێ.

ئەوان لەو قسانە بوتی مەرگیان بۆ هات. ترس دایگرتن و لە بەرامبەری کشانەوە و گوتیان: ئێمە ناتوانین بەرەنگاری ئەو پیاوە بین. هەنگاوێك پتر ناچینە پێش. ئەومیان گوت و پەنایان بۆ گوندێك برد کە لە پەنای بوون.

مەحمود بەگ گوتی: هەرچەند ئەوان دەستیان لە شەری ئێمە هەلگرت، من دەست هەڵناگرم. وەدوایان دەکەوم ڕەگ و ڕیشەیان دەردێنم. بەڵام هیچ زیانێك بە کوری پاشا ناگەیێنم. باوکی نووسەر و حاجی بەکر متصرف کە زاوای بوو، لەبەری پارانەوە و بە تکا و ڕەجا بەشیوانیان کردەوە. پاشان بە کاوەخۆ بۆ کەرکوك ڕۆیشتن و لەوی نشتەجێ بوون. زۆری پێ‌نەچوو مەحمود پاشا جارێکی‌تر هەوای حکومەت لەسەری دا. لەو کاتەدا کە سولەیمان پاشا بۆ گرتنی ڕەواندز چوو بوو، ناوبراو لەگەڵ هێندێ لە بارمە پێکراوانی ڕای کرد وچوە کەرکوك.

هەلیرزا پاشای وەزیری بەغدا نامەیەکی بۆ نووسی و بە هیوای مزگێنی بانگی کردە لای خۆی. مەحمود پاشا لەگەڵ چەند کەس چوە بەغدا هێندی کەسی دیکەش لەخەڵکی بابان لەدەستی سولەیمان پاشامەراسان بوون هاتنە کەرکوك. ئەودەم مەشیرەتی "داودە" لە کن مەحمود بەگ بوون. ئەو عێلە تایفەیێکی کوردن سەر بە وڵاتی ئەردەلانن بەڵام جێگای دانیشتن و کشت و کاڵیان مەرزی کەرکوکە. هەمیشە لە پەنای مەحمود بەگدا ژیاون. ئەو کیژی یەکی لە کوێخاکانی ئەوانی هێنابوو. کورێکی لەم ژنە ببوو بەم بونەوە ئەو عێلە بە داود بەگی

ناونرا. لەو کاتەدا هەموویان لەکن مەحمود بەگ کۆ بیبوونەوە. سێ سەت سواری بەکار هەمیشە لەبەر دەستی ئەو بوون بۆ خەراپەی سولەیمان پاشا و تالان دەیناردنە خاکی بابان. عەلیرمزا پاشای وەزیری بەغدا بۆ لایەنگری سولەیمان پاشا، کەهیا حوسین پاشای بە چوار هەزار سوار و پێنج توپەوە بە بیانووی ئەزمی ڕێگا و بان، بۆ لێدانی مەحمود بەگ، ڕەوانەی کەرکوک کرد. ناوبراو لە دەرەوەی شار ئۆردوی خست. مەحمود بەگ لە فیکر و نەخشەی ئەو ئاگادار بوو. لەگەڵ هێندی لەپیاو ماقوڵانی بابان چوە دیداری کەهیا. ناوبراو لە سامی ئەو واقی وڕما. ئەو ڕۆژە بە مودارا و بە لاواندنەوە ڕایبوارد. لە کاتی گەڕانەوەیدا گوتی: سبەی بە وەخت وەرە لای من تا لە بارەی ئەزمی وڵاتەوە بپەیڤین. چونکە من پتر لە چوار ڕۆژیتر لێرە کارم نیە. ئەزمی ئەوخاکە بە گوێرەی فەرمانی وەزیر بە تۆ دەسپێرم. لەبەر ئەوەی ڕۆژگار چاوەڕوانی بیانوو بوو، تیری ئەجەلیش وە نیشانە دەکەوت، لە مەکر و فێلی ئەو بێ ئاگا بوو. بەیانی لەگەڵ چەند کەس چوە دیتنی حوسین پاشا. کاتێ وا بە تەنیا دیتی، فەرمانی دایگرن. دەورەیان دا و زنجیر لەمل بردیانە خێوەتێك و قەراولیان لەسەر دانا. نیوە شەو بیست و چوار کەس بەسەری وەر بوون و خنکاندیان. بەیانی مەیتەکەیان داوە بە داروودەستەکەی پاشان هەر ئەو ڕۆژە لەشکری دەنگ داو گەڕایەوە بۆ بەغدا.

باوکی نووسەر لەو کارەساتە فرە برینداڕ و خەمبار بوو. گەورە و بچووك هاواریان لێ هەستا. لەولاشەوە عەلیرمزا پاشای وەزیری بەغدا بە بیانووی گرتنی دیار بەکر و قەڵای ئامێدی مەحمود پاشای ناردە کن محمد پاشای متصرفی موصل. لە ڕێگا گەیشتە پاشا، محمد پاشا، مەحمود پاشای لەگەڵ چەند قەراول بۆ ئەستەمبول نارد.

داروودەستەی ئەو پەرێشان و ئاوارە بوون. ماوەی ساڵێك باوکی نووسەر سەرپەرشتی دەکردن. پاش تەواو بوونی کار هاتنەوە جێگای خۆیان. هێندێك لە سولەیمان پاشا داوای ئەمانیان کرد و هاتنەوە سولەیمانی. حاجی متصرف بۆ بەجێ هێنانی حەج و زیارەتی بەیتولا بەرەو مەککە ڕۆیشت. حەمەبەگی کوڕی عوسمان بەگ لە بەغدا نشتەجێ بوو.

باوکی نووسەر پاش کوشتنی برایەکەی دڵشکاو بوو، ئەو وڵاتەی بەجێ هێشت و ڕوی کردە ئێران. هەروەکی لە پێشدا باسمانکرد لەگەڵ عێلی سەعدون عەرەب هەتا دەوروبەری بەغدا چوو. لەوێشەوە لەگەڵ

زیارەتکەران بۆ لای کرماشان وەری کەوتن. لەولاشەوە سولەیمان پاشا دەستەی ئەحمەدوەندی بۆ کوشتار و تالانی نارد. لە خوارەوەی زەهاو گەیشتنە ئێمە. هەرچی هەمان بوو تالانیان کرد و گەرانەوە. چونکی ئەو بەشە نووسراوە دووپاتی ناکەمەوە بە کورتی باوکم لە شاری سنەی ئەردەلان بە ئاسودەیی دانیشت. هەموو سالی لە ئازەربایجان دەچوە کن محمد خانی ئەمیر نیزامی زەنگەنە و زستانان دەهاتەوە مالێ.

لەو سەردەمەدا عەلی پاشای کوری مەحمود پاشا لە تەوریز بوو. ئەمیر نیزام ولاتی سەردەشتی بە سی‌هەزار مالیات دا بە عەلی پاشا و باوکی نووسەر. ئەوان چونە جێگای خۆیان. ئەو خەبەرە گەیشتە خەلکی بابان. چەند کەس لەوان هاتنە سەردەشت. لەولاشەوە سولەیمان پاشا بی‌ترس خەریکی حکومەت بوو. سالی هەزار و دووسەت و پەنجا و دوو بە نەخۆشی سل و جەم مرد. چەند رۆژ تازیمانەی بۆ گیرا. پاشان ئەحمد بەگی کوری لە جێگای دانیشت و لەقەبی پاشایی وەرگرت.

## باسی حکومەتی ئەحمەد پاشا.

ئەو ئەحمەد پاشایە پیاوێکی ژیر و عاقل بوو. لە بەرێوەبەری ولاتدا فرە تێکوشەر بوو. ئەمنیەتی رێگا و بانانی دەویست. لە زەمانی حکومەتی ئەودا، دەستی دز و رێگر و پیاو خەراپ لە ولاتی بابان کورت کرا بوو. چوار سالان لەوپەری کامرانی‌دا بردیە سەر پاشان ئەمیر نیزام بە فەرمانی محمد شای رەحمەتی، قەبری پر بێ لە....، عەلی پاشای کوری مەحمود پاشای کرد بە حاکمی بابان و دەسەلاتی ولاتیشی بە باوکی نووسەر ئەسپارد.

حوسین پاشاخاتی سەرتیپی مەراغەی لەگەل دوو تیپ سەرباز و شەش توپ بۆ گرتنی سولەیمانی رەوانە کرد. فەرمانی دا بە میرزا فەرمجولای ئەردەلان و عەبداللەخانی حاکمی موکری کە یارمەتیان بدەن. لەو دوو ناوچەیەش هەزار سوار دەگەل لەشکری عەلی پاشا کەوت. هەموو تێکرا رێگای سولەیمانی‌یان داگرت. ئەحمەد پاشا خۆی بۆ شەر ئامادەکرد. بەلام وەك پێویست بوو دەرەتانی بەرابەری نەبوو. زۆربەی خەلکی بابان ئەحمەد پاشایان بەجێ هێشتبوو و چوبونە کن مەحمود پاشا کە لە بارەگای دەولەتی عوسمانی گەرابووە و گەیشتبوە دەوروبەری موسل. ئەحمەد پاشا لەگەل لە کاری خۆی داما بوو، لەو پەری پەرێشانی‌دا دەژیا. لەولاشەوە عەلی پاشا و حوسین خانی سەرتیپ بە لەشکر و داو و دەزگاوە هەتا پەنا سولەیمانی هاتن. ئەحمەد

پاشا چوە دیتنی سەرتیپی، بەڵام ناوبراو نەیهێشت بگەڕێتەوە. عەلی پاشا بوو بە حاکم. سولەیمان پاشای براگەورەی چوە شاری سولەیمانی. حەوتویەك لەویٚ بوو. پاشان ئەحمەد پاشا لە بنەوە پێنج هەزار تمەنی نەغد و چوار هێستر و سێ ئەسپی عەرەبی دا بە سەرتیپ و سەر لە نویٚ بووە بە حاکم. سولەیمان بەگ کە نایبی عەلیشا بوو گەڕایەوە نێو لەشکر. باوکی نووسەر لەو کارە عاجز بوو بە تالووکە عبدالقادر بەگی برا چکۆلەی خۆی ناردە تەوریز و چونیەتی کار و باری بۆ شازادە قارەمان میرزا و ئەمیر نیزام نووسی. فەرمانی لابردنی سەرتیپ و سەبەخۆیی عەلی پاشا دەرچوو. بڕیار درا کە شاباز خانی سەرهەنگ لەجێگای سەرتیپی حوکمران بێ. بەڵام لە قسە و راوێژی روستەم بەگ دەرنەچێ.

لەولاشەوە مەحمود پاشا لە کەرکوکەوە نامەیەکی بۆ باوکم نووسی باسی ساڵەکانی رابردووی بۆ کرد، ئەم شیعرەشی لەنێو پاکەتەکە نابوو:

«ز زابل به ایران ز ایران به تور     برای تو پیمودم این راه دور»

حەوت ساڵی تەواو گێو لە هەموو شوێنێ بە دوای کەیخسرودا گەڕا و بە مراد نەگەیشت تاخرەکەی خودا رێگای راستی پێ نیشان دا. ئیستاش تۆ حەوت ساڵە ئاوارەی و لە وڵاتی خۆت دووری. ئەوە مۆری حکومەتی بابانت بۆ دەنێرم. هیچ کەس لەگەڵ تۆ شەریك نیە. عەلیش لە خەیاڵی حکومەت لابدە. ناوچەی لەرەداخی بدەیە کە باشترین جێگای بابانە. لەشکری ئێران بۆ شوێنی خۆی بگێڕەوە! چونکە من ئێستا لە بارەگای دەوڵەتی عوسمانی گەڕاومەوە. لەشکری ئەوان لەگەڵ منە. بە رواڵەت رەگەڵ ئەوانە رێك کەوتووم. بەڵام تۆ دەزانی، خواش دەزانی کە من لە خزمەتکارانی دەوڵەتی ئێرانم و دەمەوێ بە شێوەیەك خۆم لەدەست ئەوانە دەرباز بکەم و هەروەك جاران وڵاتی بابان بخەمەوە ژێر دەسەڵاتی ئێران.»

لەو کاتەدا حوکمی قارەمان میرزا و ئەمیر نیزام گەیشت. باوکم سەرتیپی لەو رووداوە ئاگادار کرد. تکای کرد کە ئەو نووسراوەیە بە سەرۆکەکانی تیپ نیشان نەدا، تا بەیانی لەشکری دەنگ بدا و بکەوێتە رێ. لەولاشەوە مەحمود پاشا لەگەڵ خەڵکی بابان و لەشکری بەغدا گەیشتنەوە شاری سولەیمانی. باوکی نووسەر عەلی پاشای هەڵگرت و

بردیه خزمەت مەحمود پاشا. ناوبراو بە هاتنی ئەوان فرە شاد بوو. پاشان مەحمود پاشا لەسەر کورسی حکومەتی خۆی دانیشت.

## حکومەتی مەحمود پاشا دوای گەڕانەوەی لە ئەستەمبوڵ.

ئەحمەد پاشا چوە نێو عیلی جاف و لەوێش ئوقرەی نەگرت و ناچار لەگەڵ دەستەیەکی خۆی چوە بەغدا و پەنای بۆ عەلیرەزا پاشا برد. مەحمود پاشا لەشکری بەغدای ناردەوە و خۆی خەریکی کاری حکومەتی بوو. بەڵام ناوچەی قەرەداغی نەدا بە عەلی پاشا وەك بەڵێنی دابوو. بەڵکو بە کوڕەکەی دیکەی خۆی، حەمە سالح بەگی سپارد. چونکە عەلی پاشا لە دایکەوە بێگانە بوو. دایکی حەمە سالح بەگی ئامۆزای پاشا و ئاغای وڵات و بەرێز و فەرمانڕەوا بوو. پاشا لە قسەی وی نەدەچوە دەر. دایك برای حاجی بەگی متصرف بوو کە پێشتر باسی کرا. خوشکێشی دایکی نووسەری ئەم کتێبە بوو. ئەوانە گشتیان داروودەستەی یەك بوون. بەڵام دایکی عەلی پاشا کیژی کەلبعەلیخانی ئەیلی حاکمی لورستان بوو. فەتحعەلیشای قاجار دابووی بە مەحمود پاشا. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە کەلبعەلیخان سەردەمێك سەربزێوی کردبوو. هەرچەند ژن و منداڵی لە تاران بە بارمتە گیرابوون. فەتعەلیشا لە سەربزێوی ناوبراو تووڕە ببوو، سوێندی خواردبوو کیژەکەی کە عەلی‌ئەلاهی‌یە، بدات بە پیاوێکی عومەری. ئەودەمیش مەحمود پاشا لە بارەگای پاشا دەژیا. ناچار کیژی کەلبعەلیخانی بە جەیاز و داب و دەزگا بۆ مەحمود پاشا نارد. عەلی پاشا لەو ژنە بوو. ئێستا بچینەوە سەر باسەکە. مەحمود پاشا بلوکی سورداشی دا بە عەلی پاشا. ناوبراو خۆی رانەگرت و بۆ بەغدا هەڵات. لەوێشەوە چوە تاران و تا مرد هەر لەوێ بوو.

مەحمود پاشا ساڵێك لە وڵاتی بابان حوکمڕان بوو. دوایە عەلی رەزا پاشا دووبارە ئەحمەد پاشای بۆ حکومەت ناردەوە سولەیمانی. مەحمود پاشا بە جارێك لە هاووڵاتیەکەری عوسمانی رووی وەرگێڕا و لەگەڵ دوو هەزار ماڵ رووی کردە ئێران و لە کوردستانی ئەردەڵان نشتەجێ بوو پاشان هێندی لە گەورەپیاوانی بابانی لەگەڵ خۆی بردە تاران. شاهەنشای ئێران محمد شای رەحمەتی باش بەخێرهاتن کرد. فەرمانی دا بە رەزا قولیخانی والی ئەردەڵان کە یارمەتی بدا و دووبارە بیکاتەوە حاکمی وڵاتی خۆی. مەحمود پاشا بە خەڵات و نیشانەوە گەڕایەوە کوردستان.

ڕەزا قولیخان ئەمری کرد کە لەشکر کۆ بێتەوە. لە ماوەیەکی کەمدا نیزیکەی دەهەزار سوار لە دەرگای والی ئامادە بوون. بە چەك و چۆڵ و دەزگا و دەبدەبەوە تا سنووری مەریوان هات. مەحموود پاشاش سوارەی خۆی هەلگرت و لەگەڵ والی کەوتە ڕێ.

ئەودەم ئەحمەد پاشا لە بەغدا بوو، ڕێگای نەدەدرا بگەڕێتەوە. چونکە عەلی‌ڕەزا پاشا لێ‌کەوتبوو. محمد نەجیب پاشا کرا بە والی عێراقی عەرەب. ئەویش لەگەڵ ئەحمەد پاشا نێوانی نەبوو، نەیدەهێشت بچێتەوە سولەیمانی. بەڵام چونکە لە بەرامبەر ئەو داواکارێکی دیکەی نەبوو، مەحموود پاشاش پەنای بۆ ئێران بردبوو، بۆیە لەکار خستنی ئەوی بە ڕەوا نەدەزانی.

عەبدالله بەگی برای ئەحمەد پاشا کە لەو نیزیکانە باسی حکومەتی دەکری، لە لایەن ئەحمد پاشاوە لە سولەیمانیە کاربەدەست بوو کاتێك هەبەری هاتنی مەحموود پاشا و ڕەزاقولیخانی بیست، داما و گەورەپیاوانی بابانی کۆ کردەوە و گوتی: ئەحمەد پاشا لە بەغدا ڕاگیراوە. ناهێڵن بگەڕێتەوە. ڕەزاقولیخانی والی لەگەڵ مەحموود پاشا بۆ گرتنی ئەم وڵاتە وەخۆ کەوتوون. ئێمەش توانای بەربەرەکانیمان نیە. بێژن لەم بارەوە تەگبیر چیە؟

گوتیان: ئێستا کە ئەحمەد پاشا لێرە نیە، چار هەر ئەوەیە کە بەبێ شەر و کێشە ئەم کارە کوتایی پێ بێنین. مەحموود پاشا مامی تۆیە، عەیب نیە ئەگەر سەری بۆ دانوێنی. ولایەتی خۆشت وێران ناکەی. باشترە تا سەر سنوور بە پێشوازیەوە بچین و بیهێنینە سولەیمانی. بریاری ئەوەیان دا و شەو چونەوە ماڵی خۆیان. بەڵام لەولاوە هەر وەك نووسرا میرزا هیدایەتوڵای وەزیر کە پێشکار و خاوەنی ڕا و ڕاوێژی ئەردەڵان بوو، لە بنەوە لەگەڵ والی نێوانی خۆش نەبوو، هەمیشە لە خوی دەترسا. بیری لەوە کردەوە کە ئەگەر والی لەو سەفەرە بە سەرکەوتوویی بگەڕێتەوە، دەماری لە خۆم و لە عەشیرەتم دەردێنێ. ئێستا دەبێ نەخشەکەی لێ تێك دەم و ڕەگ و ریشەی دەربێنم.

ڕۆژی دوایە چوە کن والی و گوتی: ماوەیەکە لەم دەشتە ماوینەوە، ئەگەر قەرارە مەحموود پاشا بنێرینە وڵات، ئیتر هوی ڕاوەستانمان چیە؟ والی گوتی: بێژە! تەگبیر چیە؟ وەزیر گوتی بەیانی ئەمانوڵابەگ کە لە نێو سوپای ئێمەدا بۆ ڕەشیدی تای نیە، بە هەزار سوارەوە دەگەڵ مەحموود پاشا بۆ شارەزووری بەرێ‌کە، خۆشمان لە ڕێگای دیکەوە یەك دوو مزڵ دەچینە پێش.

والی که سەرخۆش و لوت بەرز و هەمیشە لە کەیف و رابواردندا بوو، بێ‌خەبەر لە حیلە و فێڵی وەزیری گوتی: بەیانی ئەو کارە بکە.

رۆژی دوایە والی ئەمانوڵا بەگی بانگ کرد و گوتی: هەزار سوار هەڵگرە و دە خزمەت پاشادا وەرێ کەوە هەتا سولەیمانیش گیر مەبە. ئێمەش بە دواتاندا دێین.

ئەمانوڵا بەگ هەزار سواری لەنێو سوپادا هەڵبژارد و بەرەو شارەزوور کەوتە رێ. ئەوانەی لەگەڵ والی مابوونەوە لە فیکری شەر و شوردا نەبوون و بێجگە لە کەیف و رابواردن کاریان بە هیچ نەبوو. مەگەر ئەو هەزار سوارەی کە لەگەڵ ئەمانوڵابەگ رویشتبوون، سوارەی عێلات بوون و هەمیشە لەشەر و مەیدانداریدا رایانبواردبوو.

میرزا هیدایەتوڵای وەزیر نامەیەکی بۆ عەبدولابەگی نایبی سولەیمانیێ نووسی کە ئوردووی والی لە باڵەوانان چوڵ بوە. ئێوە بەبێ ترس ئەو لەشکرە پەلامار بدەن. منیش لەگەڵ عێل و عەشیرەتی خۆم ریگایەك دەگرمە پێش. ئەگەر والی نەما، کاری مەحمود پاشا ئاسانە. لەگەرانەوەدا ئەویش وەدەر بنێن.

عەبدولابەگ نامەی وەزیری پێگەیشت، لە رادەبەدەر شاد بوو. گەورەپیاوانی بابانی لەم رازە ئاگادار کرد. پاشان هەشتسەد سوار و حەوتسەد سەربازی بە دوو توپەوە هەڵگرت و بە تاڵوکە وەك با بۆ سنووری مەریوان کەوتە رێ. بەیانی لە نیو فەرسەخی لەشکری والیدا توپی سلاوی گرمەی هات. خەڵکی ئەردەلان لە شەر غافل و لە خەو و ئیسراحەتدا بوون. بە بیستنی دەنگی توپ لە خەو راپەرین و بیریان کردەوە چون چارەی خۆیان بکەن. هێندێك لە سوارەکان خۆیان گەیاندە سەر گردێك و لەشکر بەرەنگاری یەك بوون. عبداللەبەگ فەرمانی دا و سەربازان بە جارێك پەنجا تۆپیان پێوە نان. والی پاشەکشەی کرد. لەو کاتەدا سوارەی بابان تێکرا هێرشیان برد. لەشکری ئەردەلان خۆی پێ‌رانەگیرا و رای کرد. لەشکری بابان دەستی کرد بە کوشتار و تاڵان. والی خۆشی توانای شەری نەما و بەدوای لەشکردا رەوی. خەڵکێکی زۆر لە گەورەپیاوان کوژران.

لەنیو ئەو دەهەزار کەسەدا دووکەس وەشەر کەوتن. یەکیان شێخ عەلی بەگی کوری نەزەر عەلی بەگ لە تایفەی وەکیلان کە زۆر ئازا بوو، ئەوی دیکەش میرزا فضل اللەی مۆردا لە تایفەی وەزیرانی کوردستان ئەویش پیرە پیاویکی لە رادە بەدەر ئازا بوو. ئەم دوو کەسە بە راکردن ئابرووی خۆیان نەبرد و تا کوژران شەریان کرد. بە کورتی

لەشکری بابان نیزیکەی شەش فەرسەخ وەدوای راکردوەکان کەوتن. هەرچی گەیشتنێ کوشتیان. والی بە زەحمەت خۆی قوتار دا. عەبدوڵلابەگ لە کوشکی والی دابەزی. لەم سەفەرەدا خەڵکی بابان نیزیکەی سەد هەزار تمەنیان وەگیر کەوت. بە سەرکەوتوویی گەرانەوە لەولاشەوە مەحمود پاشا لەگەڵ ئەمانوڵابەگ تا پەناشاری سولەیمانی هاتن. لەبر هەواڵی شکانی والی گەیشت. مەحمود پاشا شێوا. هەر لەوی گەرانەوە. لە ریگا تروشی پیش قەراولانی لەشکری عبالله‌بەگی بوون. هەرچەند عبدالله‌بەگ پاشای بۆ شەر هان دا، فایدەی نەبوو، بە کوێرە رێیاندا بۆ مەریوان گەرایەوە و لەگەڵ سوارەکانی خۆی بۆ شاری سنە چووە.

مەحمود پاشا ماوەیەك لە دەشتی مایەوە تا لە بارەگای پاشاوە بانگ کرا. چوە تاران. کەس‌وکار و دار و دەستەی لە دیهاتی سنە نشتەجیٚ بوون. هەشت هەزار تمەنی موچە و بەرات بۆ برایەوە، کە هەمو سالی لە مالیاتی کوردستان دەیاندایە. پێنج ساڵان لەو وڵاتە مایەوە. تا سالی ۱۲۶۴ محەمەد شای پاشای ئیٚران کۆچی دوایی کرد.

مەحمود پاشا حەمەمین بەگی کوری عوسمان پاشای برازای ناردە تەوریٚز تا لە خزمەت ناصرالدین شاهەنشای نویٚ رەسمی خزمەت رابگەیێنی و تەکلیفی خۆشی دیاری بکات. ناوبراو لە چیمەن ئوجان گەیشتە خزمەت پاشا. بریار درا کە مەحمود پاشا لەگەڵ داروودەستەی خۆی لە سەردەشتی موکری نشتەجیٚ بیٚ. حەمەمین بەگ گەرایەوە و بە پاشای راگەیاند. داروودەستەی مەحمود پاشا نەیانویست بچنە سەردەشت. بە پاشایان گوت ئێمە ناتوانین کە لە خاکی ئیٚران دانیشین. هەر لیرەوە بۆ وڵاتی خۆمان دەگەرێینەوە. مەحمود پاشا خەمبار بوو. لە نێو خەڵکەکەی بێجگە لە باوکی نووسەر کەس بۆ مانەوە لە ئیٚران ملی رانەکێشا. بە گشتی داروودەستەی پاشا زۆربەیان رایان کرد. مەحمود پاشا بە ناچاری بە شارەزووردا بیٚ ئەوەی بچیتە سولەیمانی، روی لە بەغدا کرد. هەرچەند عەبدالله پاشا کە ئەودەم حاکمی سولەیمانی بوو، پارایەو کە بیتە سولەیمانی و چەند رۆژان بحەسێتەوە نەی‌سەلماند. بەلام ژن و مندالی ناردە سولەیمانی، خۆی لەگەڵ عبدالرحمن بەگ و حەمەسالح بەگ و عەولا بەگی کوری چوە بەغدا.

نەجیب پاشا پاریدەری خۆی بۆ پێشوازی نارد. بە رێزەوە هێنایان. هەمو مانگیٚ سەد تمەنیان دەدایە، تا پاش شەش مانگ لە بارەگای دەولەتی عوسمانی‌یەوە بانگیان کردە ئەستەمبول. ناوبراو خۆی

و سێ کور و دوو نۆکەری چوونە ئەستەمبوڵ. هەتا خۆی و دوو کوری مردن لەوێ مانەوە. عەبدالرحمن بەگی کوری دیکەی گەڕاپەوە بەغدا و لەوێ بە موچەیەکی کەم دەژیا. خێزان و کیژی مردن و بە گشتی لە بەین چوون.

## حکومەتی ئەحمەد پاشا

ئێستا بگەڕێینەوە سەر چیروکی بابان و حکومرانی ئەحمەد پاشا و عبداللە پاشای برای. بە کورتی پاش ئەوەی عبداللە بەگ ئەو سەرکەوتنەی وەدەست هێنا، ئەو خەبەرە لە بەغدا بڵاو بووە. نەجیب پاشای وەزیر جارێکی‌تر ئەحمەد پاشای خەڵات کرد و ناردیەوە. ئەحمەد پاشا هاتەوە سولەیمانی و خەڵک بە هاتنەوەی شاد بوون. وڵاتی کۆیە و هەریریش خرانە سەر سولەیمانی. لەوکاتەدا لە کار و باری خۆی لەرادە بەدەر سەربەخۆ بوو. کاری سیاسەتی ئەوەندە توند گرت کە هیچ کەس لە ماڵی خۆی توانای دەربرینی بەیفی نەبوو. رۆژگاری بە رێکخستنی لەشکر و کاری نیزامی رادەبوارد. لەو خاکە کەمەی بابان چوار هەزار سەربازی بۆ داب و رەسمی نیزامی راگرتبوو. هەر لە شاری سولەیمانی ۲۸ توپی دارشت. هەزار سواریش لە خەڵکی بابان و جاف و هی‌دیکە لە ژێر فەرمانی ئەودا بوون.

هەروەک نووسرا ساڵی ۱۲۵۲ لەجێی بابی دانیشت و چوار ساڵ حکومەتی کرد. پاشان مەحمود پاشا هات وساڵێک حکومەتی کرد. ساڵی ۱۲۵۶ بەبی کێشە و هەرا لە سەر کورسی میرنشین دانیشت. چوار ساڵی لەوبەری دەسەڵاتدا بەسەر برد. ساڵی ۱۲۵۹ عەولابەگی برای هەوای حکومەتی لەسەردا. شەوێک رای کرد و چوە بەغدا و پەنای بۆ نەجیب پاشا برد. لەو کاتەدا نەجیب پاشا لەبەر هێندی کردەوە لە ئەحمد پاشا لالوت بوو. بەڵام دە روستی نەدەهات. ویستی وڵاتی هەریر و کۆیە لە سولەیمانی بکاتەوە. ئەحمد پاشا ملی بۆ ئەوە رانەکێشا. ناچار نەجیب پاشا بە سێ‌هەزار کەسەوە بەرەو کۆیە بزوت. لەولاشەوە ئەحمد پاشا لەشکری خۆی دەنگ دا. بە چوار تیپ سەرباز و دەهەزار سوارەوە بەرەو کۆیە کەوتە رێ. هەردوو لەشکر لە لە دەوروبەری کۆیە گەیشتنە یەك. نیو فەرسەخ نێوانیان بوو، کاتێ وەزیری بەغدا تواناو لەشکری ئەحمەد پاشای دیت، ترسا. زانی کە ناتوانی بەربەرەکانی بکا. ناچار کەوتە بیری ئاشت بوونەوە. مەلاعەلی نارد دڵخۆشی بداتەوە. گوتی بە ئەحمد پاشا بلی واز لەو فیکرە بینی. ئیمە وڵاتی کۆیە هەر

دەدمین بە ئەو، خەلات و نشانی تازەشی دەدەمێتی.
مەلا عەلی چوە خزمەت پاشا و راسپاردەکانی وەزیری راگەیاند.
لە وڵامدا گوتی: هەر چەندی من سەرم بۆ وەزیر دانواند ئەو قبوڵی
لەمن کرد و لە دەسەلات و وەزنی منی کەم کردەوە. عەبدالله کە
خزمەتکاری منە، ئەو پەنای داوە. ئێستا کار گەیوەتە ئەو جێیە کە
گەرانەوە مەحاڵە. مەگەر وڵاتی کەرکوکیش بەمن بسپێری و رێگا
داگری بەرەو بەغدا بگەڕێتەوە. ئەگینا سبەی بۆ مەیدان ئامادە بێ. بەو
لەشکرە داری بەسەر بەردێوە ناهێڵم. ئەوەی گوت و مەلاعەلی بردە
سەیری لەشکر. چوار هەزار سەرباز و دەهەزار سوار هەرکەسە لە
جێی خۆی وەستاوە و چاویان لە فەرمانی پاشایە ئەحمەد پاشا خۆی
سواری ماینی کوێت بوە و بۆ شەر خۆی ئامادە کردوە. مەلاعەلی لە
سام و هەیبەتی ئەو لەشکرە سەرسام ما. داوای ئەمانی لە پاشا کرد و
گوتی: من یەکی لە نۆکەرانی تۆم. ئەگەر خوا نەکا لەگەڵ وەزیر
تووشی شەر بی ئالای تایبەتی من سپی‌یە، تکا دەکەم ئەوانەی لەژێر
ئەو ئالایەدا بن، لەبەر دەستی لەشکری تۆ بپارێزرێن. ئەحمەد پاشا
بەو قسەیە رازی بوو پەیمانی دایە.
مەلاعەلی گەرایەوە کن وەزیر و باسی زۆری لەشکر و سام و لینی
ئەحمەد پاشای بۆ گێراوە و ویستەکانی پێراگەیاند. نەجیب پاشا زۆر
ترسا و ناچار گوتی: بەیانی خەلات و نشانی وڵاتی کەرکوکی بۆ
دەنێرم خۆم لەو بەلایە دەرباز دەکەم.
نەجیب پاشا ئەو رۆژەی بە پەریشانی گەیاندە شەو. لەولاشەوە
ئەحمەد پاشا چاوەروانی وڵامی بوو کە خەبەرێك نەبوو تورە بوو و
گوتی: بەیانی رەگ و ریشەی ئەو پیر خەرفاوە لەبن دەردێنم.
بەڵام ئەزا و قەدەری خودا جۆرێکی دیکە بوو. لە کاتی نوێژی
شێوان هەلیکردە سەرما و با و گێژەلوکەیەك بە سەر لەشکردا،
دەتگوت ئەوسی عاد و سەمون وەبەر تووك و دوعای صالح و هود
کەوتوون لە هیچ دەور و زەمانێکدا کەس کارەساتی ئاوای نەدیبوو.
سێ سەعاتی تەواو عەرز کەوتبوو بەر شریقەی هەور و تەواوی مەتەرێز
و پەناگای ئەو لەشکرەی لەبەریەك هەڵتەکاند. بەبێ فەرمانی ئەحمەد
پاشا قەت تفەنگێك نەداویژرا. بە هەلکەوت چاتمەی تفەنگی کێشکچیان
کەوتە عەرز و تفەنگێك دەرچوو. شەوێکی فرە تاریك بوو و چاو،
چاوی نەدەدیت. دەسەتەیەکی کە لە پەنا ئەو قەرەولانە بوون و گوێیان
لە تەقەی تفەنگ بوو، گوتیان کارەساتێك روی داوە هەرکەس دەستی دا

تفەنگ و کردی بە تەقە. سەروکانی لەشکر کە گوێیان لەو تەقەیە بێ‌وەختە بوو لایان وابوو دوژمن شەو بەسەری داداون. بێ‌پرس و روون‌کردنەوە هەرکەس فەرمانی تەقەی دا بە دەستەی خۆی. بە چاری چوار هەزار سەرباز تەقەی دەکرد. تۆپچی لەسەر تۆپە کانیان لە ماوەیەکی کەمدا سێ سەت تۆپیان تەقاند. سوارەی جاف و خەڵکی بابان پەشۆکان و هەرکەس سواری ئەسپی خۆی بوو ئامادەی شەر وەستا.

## هەڵاتنی ئەحمەد پاشا بۆ کوردستانی ئەردەڵان و دانانی عەولا بەگ لەجێی ئەو.

ئەحمەد پاشا کە لە هەموو شت بێ‌خەبەر بوو، لە خێوەتی هاتە دەر و تەماشای کرد دەشت هەموی هەر ئاگرە. هەرچەند هاواری کرد کەس هاواری وی نەبیست. ئەو لەشکرە زۆرە هەروا خەریکی تەقە بوو. خزمەتکارەکانی بە زەحمەت ئەسپیان بۆ هێنا، سوار بوو، سەرباز و سوارەش بە دوای ئەودا ملی رێگایان گرت. و لە ماوەیەکی کەمدا ئوردوگا کەسی تێدا نەما.

ئەحمەد پاشا لەگەڵ هەزار سوار بە ناچاری بە تاریکە شەو بە کوێرە رێیاندا بەرەو سولەیمانی کوتای لەولاشەوە وەزیر وای زانی کە ئەحمەد پاشا بەسەری داداوە. چونکە توانای شەری نەبوو لە خێوەتی خۆی قورئانی لەسەر دەستی داتابوو، بۆ ئەوەی ئەحمەد پاشا لەبەر خاتری قورئان بەزەیی پێدا بێ و نەیکوژی بەڵام سەعاتێک پێچوو کەس دیار نەبوو. زانی کە موجیزەیەکی غەیبی رووی داوە. تاوێک هاتەوە سەرخۆ، لەپر مزگێنی راکردنی ئەحمەد پاشایان بۆ هێنا. ئەسرینی شادی بەسەر ریشیدا هاتە خوار و سوژدەی برد و ماوەیەک سەری لەسەر سوژدە هەڵنەگرت.

پاش سوپاس و شوکرانە، عەولا بەگی کردە حاکمی بابان و لەلەبی پاشایی دایە و ئەمری کرد کە وە دوای ئەحمەد پاشا بکەوی و بەچاری وەدەری بنێ. دوو هەزار سواری رەگەڵ خست و ناوبراو سەری دەدووی ئەحمەد پاشا نا. لەولاشەوە ئەحمەد پاشا ئەو شەوە رێگای بیست فەرسەخی بری و تا بەیانی گەیشتە بەنا شاری سولەیمانی. ماوەیەک وەستا تا بحەسێتەوە. کەس و کار و ژن و منداڵی لە شاری هێنا دەر و لەگەڵ پاشا رێگایان داگرت. هەزار ماڵ لە گەورەپیاوانی بابان و کاربەدەستانی حکومەت بەرەو مەریوان کەوتنە رێ. باقی خەڵکی بابان

چونە پێشوازی عەولا پاشا و بوون بە داروودەستەی ئەو. عەولا پاشا بە لەشکرەوە سەری دەدووی ئەحمەد پاشا نا و لە مەریوانیشی تێپەراند. پاشان بۆ سولەیمانی گەڕایەوە و لەسەر کورسی حکومەت دانیشت.

ئەحمەد پاشا بە کوردستانی ئەردەڵاندا تێپەری و لە دوو فەرسەخی شاری سنە راوەستا. وەك باسکرا ئەودەم رەزا قولیخان والی ئەردەڵان بوو. ئەمانولابەگیش پێشکار و بەرپرسی کاروباری وڵات بوو. ئەوان لە هاتنی پاشا ئاگاردار بوون، پێکەوە چوونە دیتنی پاشا و هێنایانە شاری سنە. ئەویش لەگەڵ هێندی لە گەورە پیاوانی وڵاتی خۆی هاتە شار. لە رادە بەدەر رێزیان گرت و میوانداری‌یان کرد.

وەکیل کە مروڤێکی جوامێر بوو. ئەوەی لە توانای‌دا بوو لەگەڵ پاشا کردی. دوازدە رۆژ لەوپەری خۆشیدا رابوارد و پاشان بۆ نێر لەشکر و خەڵکی خۆی گەڕایەوەئەحمەد پاشا عبدالحمن بەگی خەزنەداری خۆی بۆ بارەگای پاشای ئێران نارد، بەڵکو یارمەتی بدا. پاش ئەوەی گەیشتە تاران فەرمانێك هات کە ئەمساڵ ئەحمەد پاشا و داروودەستەکەی لە وڵات نشتەجێ بکەن، تا بزانین ساڵێکی‌تر چوون دەبێ.

ئەمانولا بەگی وەکیل ئەحمەد پاشای بە داروودەستەوە بردە ناوچەی رەوانسەر کە ملکی خۆی بوو. لە خانووبەرەی خۆی دایناو داروودەستەکەشی لە قەراخی چەمی لەرمسو نشتەجێ کرد. ئازۆخەی سێ مانگی پاشاو داروودەستەکەی هاویشتە ئەستووی خۆی. پاش ماوەیەك والیش لەگەڵ خەڵکێکی زۆر بۆ دیتنی ئەحمەد پاشاو و بۆ راو چوە رەوانسەر. ئەو چەند رۆژانەی لەوێ بوو رۆژێکیان مەجلیسی بەزم و خواردنەوەیان ساز کرد. ئەو کەسانەی شایانی مەجلیسی وا بوون بەشداریان کرد. پاش ئەوەی سەریان گەرم داهات بە گوێرەی خەسلەتی کەسانی ریاباز و جامەلوسکە بە والیان گوت ئێستا ئەحمەد پاشا بە ژن و منداڵەوە لەو دەشتە سەرگەردانە وا باشە تۆڵەی شەری مەریوان لە خەڵکی بابان بکەینەوە.

ئەوەندەیان لەم بابەتە بە گوێدا خوێند، هەڵمی فێڵ و لوت بەرزی مێشکی داگرت و لەگەڵ راوێژی ئەوان بوو بە هاودەنگ. دەستبەجێ فەرمانی دا بە مەحمود خانی مامی و زابتی ناوچەی شادیاوا لەدوو فرسەخی رەوانسەر کە هەر ئەمشەو هەرچەندی بتوانی لە سوار و پیادە لە دەوروبەری ئوردووی پاشا کۆ بکەنەوە. ئامادە بن بەیانی کە فەرمانی من هات بە سەریان دادەن. هەر ئەودەم ئەو فەرمانەی بۆ نەجەفقولیخانی حاکمی جوانروش نارد کە بەیانی وەك مەحمود خان دەلێ لە

کوشەیەك ئامادە بن.
ئەو فەقیرە لەوە غافل بوو کە ئەحمەد پاشا ئەوەندەی ئامادەیی شەری هەبوو کە لە سەفەری مەریوان نەیبوو. پێنجسەد سەربازی پرچەك و هەزار سواری بەکاری لەگەڵ بوو سەعات چواری شەو ئەو خەبەرە گەیشتە ئەحمەد پاشا. لە پێشدا باوەری نەکرد. چونکە ئەوە کارێکی بێ‌عاقلانە بوو. بەڵام خەبەرەکە دووبارە بووە. بزەیەکی هاتێ و گوتی: خودا هەڵتەکاندنی ئەو تایفەی بەدەستی من ئەسپارد. هیچ وەسەر خۆی نەهێنا، گوتی: لام وایە ئەمانوڵابەگی وەکیل لەو خەیاڵە خاوە ئاگادار نیە. بە یەکێکی گوت هەر ئێستا بچوو لەم رووداوە ئاگاداری بکە.
بە کورتی ئەو کەسە چوە خێوەتی وەکیل و باسەکەی بۆ گێرایەوە. وەکیل بە پەشۆکاوی لە جێ هاتە دەر و گوتی: سوبحانەلا تووشی چ بەلایەك بووم. خوا مێشکی والی لە ئاقڵ خالی کردوە. ئەگەر واز لە پشتیوانی ئەحمەد پاشا بێنم لە نێو کورداندا بەدناو دەبم. ئەگەر بە قسەی والی رازی بم، ئەوە کارێکی دوور لە ئاقڵە. بەڵام ئینساف لەدەست نادەم و کاری زاڵمانە ناکەم. بۆ نمونە ئەگەر بزانم والی لەرێگای راست لادەدا، سوێند بە خوا هەتا توانام لەبەردایە دەست لە یارمەتی پاشا و خەڵکی بابان کە هەموو خزمی خۆمن هەڵناگرم.
ئەوەی گوت و ئەسەدولا بەگی کوری کە لە راپورتی ئەردەڵاندا باسی کرا، بانگ کرد و گوتی: هەر ئەمشەو لەم سنوور و ناوچەیە چەند سوار و پیاوی شەرکەرمان هەیە ئامادەیان بکە بەڵام کەس لەم هەواڵە ئاگادار مەکە. بەڵکو بە جۆرێك ئەم خەیاڵە لە سەری والی بێنمە دەری. ئەسەدولا بەگ لەسەر فەرمانی باوکی رێی داگرت و وەکیل بێ‌وەستان چوە کن پاشا. ئەوکاتە نۆ سەعات لە شەو رویشتبوو. پاشا هیچ باسی ئەو قسەی نەکرد. لەگەڵ وەکیل بە خۆشی دەدوا. لەم ناوە یەکێك خەیاڵی والی بە وەکیل راگەیاند. ئەحمەد پاشا هەرەشەی لێکرد، بەڵام وەکیل گوتی بەیانی دەچمە کن والی و لەو کارە تێئەگەم. ئەوەیان گوت و بڵاوەیان کرد.
وەکیل بەیانی چوە کن رەزاقولیخانی، لە پێشدا رێگای نەدرا. پاشان لەدەرکەوان توورە بوو. چوە کن والی. مەجلیسی بەزم و شادی دیت. پر لە نیعمەت و خەڵکێکی سەرخۆش. والی لە دیتنی ئەو چرژا. وەکیل گوتی پێم بیژە بە چ تونایەك خەیاڵی بەسەرداهاتنی ئەحمەد پاشات هەیە؟ زۆری پێ‌تاجی بە هەزار و پێنجسەت سوارەوە بە سەرت

دادەدا و شکانی مەریوان لەبیر خۆت مەبەوە. والی لە وەڵامدا دەستی کرد بە شێر و ڕێوی هێنانەوە و گوتی: من لەو خەیاڵەدا نەبووم هێندی لەو کەسانە ئەو قسەیان کردوە. چۆن دەبێ ئێمە میوانی خۆمان تووشی زەرەر و زیان بکەین؟ هەر ئێستا خۆم دەچمە دیتنی پاشا و دڵخۆشی دەدەمەوە. وەکیل پاش ئەوەی والی هێنایەوە سەر ڕێگای ڕاست، بە نهێنی خەبەری دا بە ئەحمەد پاشا. لەولاشەوە والی لەگەڵ چەند کەسێك چونە ماڵی ئەحمەد پاشا و لەوپەڕی موحیبەت و دۆستایەتیدا یەکتریان بینی. دوای سەعاتێك لەگەڵ هاوڕێیانی چوە جوانڕۆ. ماوەیەك لەو ناوچەیە مایەوە و پاشان چووە سنە.

بە کورتی ئەحمەد پاشا مانگێکی دیکەش لە ڕوانسەر ڕایبوارد. لە لایەن گەورەپیاوانی بابانەوە چەند نامەی پێگەیشت، لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی خۆی تەگبیری کرد. تێکرا لەسەر پەلاماردانی سولەیمانی و هەڵکەندنی عەولاپاشا هاودەنگ بوون. پاشان لە ڕوانسەرەوە باریان کرد و تا نیزیکە چەمی سیروان نەوەستان. لەولاشەوە عەولاپاشا لە هاتنی ئەوان ئاگاردار بوو. بە دووهەزار سەرباز و سێهەزار سوارەوە بەرەو پێشی چوو. لە ئاوی سیروان پەڕیوە و لە هەوەڵی خاکی زەهاو لەشکر گەیشتنە یەك.

**ڕۆیشتنی ئەحمەد پاشا بۆ ئەستەمبول و پاریس و گەڕانەوەی بۆ ئەستەمبول و ناکامی کاری.**

ئەحمەد پاشا چاوەڕوانی پشتیوانی گەورەپیاوانی بابان بوو کە نامەیان بوو نوسیبوو بەڵام درۆیان لەگەڵ کرد. عەولاپاشا لەو شەڕەدا خۆی ڕاگرت. لەشکری ئەحمەد پاشا کە لە یارمەتی گەورەپیاوانی بابان ناهومێد بوو، پشتیان دا و ڕایان کرد. ئەحمەد پاشا لەگەڵ پەنجا سوار مەیدانی شەڕی چۆڵ کرد و بێ بارگە و بنە و ئازوقە بەرەو کرماشان کوتای و لەویشەوە بۆ سنووری کوردستان. لە گەڕوس و هەوشار و سایقەلا تێپەری وڵاتی موکریانی بەجێ هێشت و گەیشتە وڵاتی شەمزین کە هەوەڵی خاکی سەلماسە. لە تەکیەی شێخەکانی مامۆستای تەریقەی نەقشبەندی دانیشت و پێنج مانگان لەوێ بوو. پاش ئەوەی لە هیچ کوێ ڕێگای نەجات و ڕووناکی نەدیت، وای بە باش زانی دیسان پەنا بەرێتەوە بەر دەوڵەتی عوسمانی. ئەودەم لەگەڵ ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون بەرەو موسڵ کەوتنە ڕێ.

ناهیر پاشای حاکمی موسڵ کە لە پێشدا لەگەڵی یەك بوو، لە

هاتنی ئاگادار بوو. خەڵکێکی بە پێشوازێوە نارد. بە هەلکەوت ئەورۆژەی ئەو دەگەیشتە موسل، تاهیر پاشا کوت و پڕ مرد. بالوێزی ئینگلیز بەخێرهاتنی کرد و چونیەتی وەزعی بۆ دەوڵەت نووسی. لەویوە ئەمری چوونی دەرچوو. خەلکەکەی لەگەڵی بوون ناردنیەوە و بوخۆی لەگەڵ دوو کەس بۆ ئەستەمبول رویشت.

ساڵێك لیی لالوت بوون. مانگی سەت تمەنیان دەدایە. پاشان ئیجازەی وەرگرت و بۆ گەران چوە پاریس. دوو ساڵ و نیو لە پاریس مایەوە کاربەدەستانی دەولەتی فەرانسە لە بزوتنەوەی رازی بوون و ژیری و تیگەیشتنی ئەویان دە روژنامەدا نووسی و ناردیانە ئەستەمبول. کاربەدەستانی دەولەتی روم ئەومیان بەدڵ بوو، بانگیان کردەوە. ناوبراو داب و رەسمی نیزامی تەواو کرد و گەرایەوە. دەست بەجێ کرایە والی حیجاز و بەرەو حیجاز کەوتە رێ. لەپێشدا چوە مەککە. هێندی سەرسەری کە دەستیان بە دزی کردبوو، حورمەتی خانەی خودایان لە ژێر پێ نابوو، وەبەر توپ و خومپارەی دان. بە هەلکەوت هەر ئەو روژە لەتحولابەگی کورە گەورەی مرد. هەرچەند ئەو کارەی بە شەرافەتی بەیتولا دەژمیردرا، بەلام ئەحمەد پاشا وەسەر خۆی نەهێنا و خەریکی رێك و پێك کردنی ولات بوو. لەویوە چوە سەر یەمەن و یاخی‌یەکانی تەمبی کرد. چاردەساڵی تەواو لەوێ حاکم بوو. پاشان بانگیان کردەوە ئەستەمبول. شەش مانگ لەوی بوو، لە دوایە کردیانە حاکمی وان، ساڵێك لەوی مایەوە. ساڵی ١٢٨٣ دووبارە ناردیانەوە یەمەن و ساڵیکیش لەوێ بوو. لەبەر بەساڵا چوویی و گەرمای زو ر داوای لە کاربەدەستانی دەول ەت کرد و هی نایانەوە و ئەستەمبول. ساڵی ١٢٨٤ کە دەبیتە دوو ساڵ پێش نووسینی ئەم کتیبە کردیانە حاکمی ئەرزروم. دەیان گوت لەقەبی موشیری پێدراوە. کە پایەی وەزیرە. بەلام راستی بۆ نووسەر دەرنەکەوت. تا ئیستا لە حالی ئەو بێ خەبەرم.

## حوکمرانی عەولا پاشا لەسەر ولاتی بابان.

ئێستا بابگەرینەوە سەر چیروکی عەولا پاشا کە دوا کەسی ئەو بنەماڵەیە. ساڵی ١٢٦٠ بە تاقەکەس بوو بە حاکمی بابان. سەربەخوێی تەواوی هەبوو. چەند کەسی لە داروەستەی ئەحمەد پاشای بە تاوانی سەرپێچی کردن لەسەر کار لابرد و هەریەکەی بۆ ناوچەیەك نارد و لەوێ حەبسی کردن. چوار ساڵی تەواو بەکەیفی خوی رایبوارد. ئەجیب پاشای وەزیری بەغدا زوری لەگەڵ پاشبوو.

# فەسڵی شەشەم

**سەرەتای فەوتانی ئەمارەتی بابان لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە.**

ساڵی ١٢٦٥ دەوڵەتی عوسمانی عبدالکریم پاشای کردە والی عێراقی عەرەب. نەجیب پاشایان بردەوە ئەستەمبوڵ. لەبەر ئەوەی یاسا و رەسمی ڕێکخراوی دەوڵەتی ئەوە بوو کە لە هەر وڵاتە، بنەماڵە قەدیمییەکان لابەرن، مانەوەی حاکمەکانی بابانیشیان بە پێچەوانەی داب و یاسا دەزانی، لە بنەوە بە عبدالکریم پاشایان ئەسپارد کە ئەگەر بتوانی عەولا پاشا لابەری و یەکی‌تر بکاتە حاکمی بابان.

**ڕاپەڕینی عەزیز بەگ بۆ ئەستاندنەوەی حکومەتی بابان و سەرنەکەوتنی.**

شەش مانگ پێش ئەو ڕووداوە، حەمەبەگی برا چکۆڵەی عەولا پاشا بە خەیاڵی حکومەت لە براکەی تۆرابوو و چووبوە بەغدا. پاش هاتنی عبدالکریم پاشا محمد، نامیق پاشا بوو بە موشیری عەسکەری عێراق و حیجاز.

عەولا پاشایان بانگ کردەوە بەغدا. سمایل پاشای میریانی بۆ حکومەتی سولەیمانی نارد. ناوبراو لەگەڵ دووهەزار سەرباز چوە سولەیمانی و ئاڵای حکومەتی هەڵکرد. گەورەپیاوانی بابان سەریان بۆ دانواند. بێجگە لە عەزیز بەگی مامی پاشا کە نەچوە ژێر باری و لەگەڵ حوسێن‌بەگی برای و حەمەمین بەگی کوڕی عوسمان بەگی برازای لێی هەڵگەڕانەوە و یاخی بوون. کەمێك لە خەڵکی بابان و پێنج سەت سواری تایفەی هەمەوەند و تایفەی دیکە لەدەوری کۆ بوونەوە و لە سمایل پاشا وەخۆ کەوتن. لەو سەروبەندەدا عبدالکریم پاشا لە عێراق وەلانرا و نامیق کرا بە سەرداری عەسکەر و کاروباری وڵات. عەزیزبەگ لەگەڵ سوارەی خۆی، هەموو ڕۆژێ عەسکەری عوسمانی و دەوروبەری سولەیمانی پەلاماردەدا و تەنگی پێ هەڵچنیبوون. سمایل پاشا بە تالووکە هاواری لێقەوماوی خۆی بۆ نامیق پاشا نارد. موشیر بە چوار هەزار سەرباز و چەند توپەوە بۆ سولەیمانی هات. عەزیز بەگ هەروەها وڵاتی هەراسان کردبوو. نامیق پاشا چەند ڕۆژ پێش وەڕێ کەوتنی بۆ سولەیمانی حەمەبەگی براچکۆلەی

عەولاپاشای بۆ ئەستەمبول نارد. پاش چەند رۆژ عەولاپاشاشی بە دوایدا نارد بۆ ئەستەمبول.
بە گشتی رۆژێکی عەزیز بەگ لەگەڵ چەند کەس لە ئازایانی بابان بۆ گرتنی سولەیمانی وەخۆ کەوتن. کەس لە وزەیدا نەبوو بەربەرەکانی بکات. لەشکری عوسمانی لەترسی ئەو ئاراسی لیٚ هەلگیرابوو. عەزیز بەگ تا بەنا سولەیمانی رانەوەستا. بۆ خۆی بە سواری لەسەر بەرزایەك راوەستا و حەمەمین بەگی کوری عوسمان بەگ و قادر بەگ و حەمەن بەگی برای ئەحمەد پاشای لەگەڵ هێندی لە تایفەی بابانی بۆ گرتنی سولەیمانی نارد هەسوویان هێرشیان برد. لەولاوە سمایل پاشا تۆپەکانی لە سەربانی دامەزراندو فەرمانی تەقەی دا. بە جارێ دوو هەزار گوللە دەباری، لە نێو کوڵانان سەرباز رێیانپێ گرتن و بوو بە شەڕێکی توند. سوارەکان لە بەر گوللەی زۆر شپرزە و بڵاو بوون . حەمەمین بەگی کوری عوسمان بەگ برینداز بوو، بەزحمەت خۆی دەرباز کرد. قادر بەگ وحەسەن بەگ، براکانی ئەحمەدپاشا و سولەیمان بەگی هەلەبجە بەدیل گیران، خەڵکێکی زۆر کوژران. ئەوانی‌تر چونەوە کن عەزیز بەگ و رایان کرد. هەر ئەو رۆژە گیراوەکانیان بە حەبس بۆ ئەستەمبول نارد. حەمەمین بەگ بە برینداری ئەو رۆژە دوازدە فرسەخ رێگای بری و بەلام لەبر برینی زۆر لەگوندی تریێلك پاش سێ رۆژ کوچی دوایی کرد. ناوبراو مرۆیێکی ژیرو رەشید وجوامێر بوو. بەلام رۆژگار تەتلەگەلی نەسازا.
لەو کاتەوە دولەتی حاکمەکانی بابان لە سولیمانی بە جارێك هەلوەشا. عەزیز بەگ ماوەیەك بە سەرگەردانی لە خاکی ئێران وعوسمانی دەژیا. پاش ئەوەی لە هیچ لایەکەوە رووناکایی نەدیت، دیسان پەنای بۆ دەولەتی عوسمانی بردەوە. بە تەنیا رێگای قوستەنتەنیەی گرتە بەر. کار بەدەستانی دەولەت پاش ئەوەی لە هاتنی ئاگادار بوون، لە شارێك دایان نا و مانگی سەت تمەن سووچەیان بۆ بریەوە. تا ئێستا لەوشوێنەیە و پتر ئاگاداری ژیانی نیم.
پاشی دوو سێ سالان جارێکی دی عەولا پاشا کرایەوە فەرماندەی بەغدا، خەڵکی بابان بەو خەیالە کە دەیکەنەوە حاکمی ئەوێندەرێ، لە رێگا چوونە خزمەتی، بەلام خەیالێکی خاو بوو. چوونکە خەیالی دەولەتی عوسمانیان لە بارەی لەریشە دەرهێنانی بنەمالەکانی قەدیمی نەدەزانی. بەگشتی دوو سێ سال لە هێرالی هەرمب رابرارد وپاشان گەرایەوە ئەستەمبول. هەمیشە حکومەتی بچوکیان پێ دەسپارد. دوو سێ سال پێش ئەم نوسراوەیە کردیان بەحاکمی وان.

حەمەبەگی براشی لەگەل عومەر پاشای سەرداری ئەکرەم کە ئەودەم کرابوو بە والی عێراق و حیجاز گەرایەوە تا ئێستا هەر لەوێیە. لەقەبی پاشایی وەرگرتوە. هێندی جار دەبێتە حاکمی کەربەلا. بە کورتی تا ئێستا هەر دوو سال جارێك لەلایەن دەولەتی رومەوە حاکمێك بەسەر ولاتی باباندا حکومەت دەکا.

*(راپورتی کوردستانی بابان ئەرلو بوو)*

# فـەسـلی حـەوتـەم

## کوردستانی موکری و بلباس

ئێستا چیرۆکی کوردستانی موکری و تایفەی بلباس دەنووسین. خاکی موکری درێژایی و پانایی دە فەرسەخ لە هەشت فەرسەخدایە. لەو خاکەدا نیزیکەی ٦٠٠ گوند و شارۆچکە هەیە. خەڵکی ئەو وڵاتە لە رادە بەدەر توند و تیژن. کەمتر لەگەڵ بێگانە دەسازین. بە ئازایی و بە دەست بڵاوی بە ناوبانگن، هەمیشە لەو تایفە پیاوی گەورە هەلکەوتوە. هەروەك بە کورتی باسیان دەکرێ.

بنەچەکەیان دەچێتەوە سەر پاشا گەلی بابان. لە راپورتی کوردستانی باباندا، باسمان کرد کە سولەیمان بەبەی کوری مەلا ئەحمەدی، عەولای برای بۆ گرتنی خاکی موکری نارد و لەقەبی "بابامیری" دایە. بابامیر بە گوێرەی فەرمانی سولەیمان بەگی بابان ئەم وڵاتەی پەلامار دا و سەربزێوەکانی ئەوێی تەمبی کرد و لە ماوەیەکی کەمدا بوو بە ئەمیر و فەرمانرەوای ئەو وڵاتە.

تورمەی زۆری لێ پاشەکەوت بوون و پشتاوپشت حکومەتی ئەو هەریمەیان بە دەست بوو. هەمیشەش سەر بە دەوڵەتی عەجەم بوون. ئەمیری گەورەیان لێ هەلکەوتوە لەوانە عەزیزخانە کە ئێستا لە زەمانی ناسرالدین شای شاهەنشای ئێراندا سەروکی تەوای سوپای ئێران و لەقەبی سەرداری تەواوی عەسکەری نیزام و سوارەی پێدراوە. پیاوێکە ئەوپەری دەسەلات و سام و مەزنەتی هەیە. چەند سالێك بەرپرسیاری کاروباری ئازربایجان و بەریوەبەری کاری خەڵکی ئەو هەرێمە بوو. پاشان بردیانە تاران و چوە خزمەتی عەسکەری. چونکە نووسەر بە تەواوی ئاگاداری حالی حاکم و گەورەپیاوانی موکری نیە، مێژووی حال و رەوشتی ئەوانیشم نەدیوە، چونکە لەو وڵاتە کەس خۆ بە نووسینی دەنگ و باس و شوێنەوارەوە ماندوو ناکات.

بە کورتی لە پەنجا ساڵ پێشەوە تائێستا بیرەوەری ئەو تایفەیە لە "بداخ خان"ەوە دەست پێدەکا. کە حاکمی ئەوێیە. ئەویش لە وڵاتی موکری وەك ئەمانوڵاخان لە کوردستانی ئەردەلان و عبدالرحمن پاشا لە ملکی بابان بە دەسەلات و بە ناوبانگ بوە. چونکە لەو سەردەمە شێخ و پیرەپیاوانی ئەوان کارەکانی ئەو یاد دەکەنەوە. لەدوای ئەو عەولاخان و کەریمخانی کوری و مەجید خان و ذولفەقارخانی ئەولادی ئەوان بوون.

حکومەتی عەولاخان پێش سی ساڵ بوو. ئەوەدەم نووسەری کتێب لە تەمەنی ٧-٨ ساڵیدا بوو لە تایفەی ئەو کە گویا بنەچەکەی ئەوان لە بابامیری جیایە، هەباساغا لە سەردەمی حکومەتی عەولاخاندا سەروکی تایفە بوە و لە ولاتی موکریش فرە بە هێز و دەسەلات بوە. بە جۆرێ کە بە بێ ئیمزای ئەو کەس توانای هیچ کارێکی نەبوە. ناوبراو لەگەڵ باوکی نووسەری ئەم کتێبە ناوەیەکی زۆر دوست بوە.

## کوشتنی هەباساغا بە فەرمانی عەولاخان.

بە کورتی لە ساڵی ١٢٥٦دا بە قسەی شەیتان و دووزمانان عەولاخان و هەباساغا نێوانیان تێکچوو. عەولاخان لە بنەوە خەریکی کوشتنی هەباساغا بوو. پاش ماوەیەك هەباساغا دەیەوێ بۆ دیتنی شازادە قارەمان میرزای حوکمڕانی ئازەربایجان و محمد خانی ئەمیر نیزام بچێتە تەورێز. رۆژی وەرێ کەوتنی دەچێتە دیتنی عەولاخان و دەڵی بۆ مەسلەحەتی ولات دەچمە تەورێز. ئەگەر خان کارێکی هەبێ؟

عەولاخان دایدەنێ و دەقسانی دەکرێ. پاشان ئەوانەی بۆ گرتنی ئەو راپگرتبوون، دەنگیان دەدا و سواری سەری دەبن و بە پەتێك دەیخنکێنن. پیاوەکانی لە دەرەوەی بارەگا ئاگادار دەبن و دەیانەوی ئەجاتی بدەن. لەپڕ دەبینن پەتێکیان دە لاقی خستوە و بە دەوری خانودا دەیگێڕن. کاتێك وا دەبینن، هەر یەك بە لایەکدا بلاوەی دەکەن. قادرئاغای کوری هەباساغا دوای رۆژێك لە کوشتنی بابی ئاگادار دەبێ. بە دووهەزار سوار و تفەنگچی شاری سابلاخ کە پێتەختی خانگەلی بابامیری بوو پەلامار دەدا بەلام هیچی بۆ ناکرێ. بە کورتی خەبەر گەیشتە قارەمان میرزا و ئەمیرنیزام لە ئازەربایجان. لە کوشتنی هەباساغا فرە بە پەرۆش بوون. عەولاخانیان سەرکوتە کرد. ئاخرەکەی خان و قادرئاغا ئاشت بوونەوە. عەولاخان کیژی خوی دا بە قادرئاغا. قادراغا وەك بابی بوو بە مەعموری ولاتی موکری. تا ئێستاش هەر بە توانا و دەسەلاتە.

کاتێك عەزیزخانی سەردار لە بارەگای پاشا بوو بە خاوەن ناو و گەیشتە پلە و پایەی بەرز، کار و باری خەڵکی ئەو هەرێمە برەو و گەشەی کەوتی. هێندی لەوان بوون بە خاوەنی ناو و نیشانی دەوڵەتی. حاکم و خانگەلی بابامیری هەموو سەریان بۆ دانواند لە شانسی سەردار تا ئێستا کە ٢٢ ساڵە کار و باری تایفەی موکری گورانی بەسەردا هاتوە. ئەگینا لەپێشدا زۆر بە فەقیری دەژیان.

جارێکیان ئەمیر نیزام لە سەفەری لاجان و شنودا کاتێك مەجلیسی پڕ

بوو له گەورەپیاوانی کوردستانی ئەردەڵان و خانانی موکری، بەتایبەت هەباساغا، له ڕووتەم بەگی بابی نووسەری پرسی: کوردستانی ئەردەڵان و کوردستانی موکری و کوردستانی بابان، کامیان بەسەر هەموانیدا هەیە ؟

بابم تاوێك داما، ئەگەر سنووری ڕاستی پەرانبدبایە، زیانی خوّی بوو. چونکه خوّی له تایفەی بابان بوو. لەگەڵ گەورەپیاوانی بابانیش خزمایەتی هەبوو. بێجگه لەوه شاری سنەی ئەردەڵان نیشتمانی دووەمی بوو. زیاتر لەوه لەگەڵ خانانی موکریش بەتایبەت هەباساغا هاتو و چو و دوستایەتی هەبوو، ماوەیەك بیری کردەوه و پاشان گوتی:

هەمووو تایفەگەلی کورد لەسەر ئەو باوەڕەن که : تایفەی ئەردلان له داب و ڕەسمی ئەدەب و بێگانه دوستی و پاك و خاوێنی و جل و بەرگ و خواردەمەنی، هاوتایان نیه. کاتی ئەنگانەش فرە ڕشید وئازان. بەڵام کوردستانی بابان به سێ سیفەت تاقانەی زەمانەن. یەکەم له سوارچاکی و مەیدانداری، دووەم له ڕاوێژ و ڕاپەڕاندنی کار و باری خەڵك دا هاوتایان نیه. سێیەم گەوره و بچوك هەر کەس پاروتانێکی هه بیٚ له گەڵ دوست میوانان دەیخوا. له ڕاستیدا تێکچونی دەوڵەتیان بێجگه لەو داب و یاسایه شتێکی تر نەبوو. تایفەی موکریش حاکمەکانیان له بنەچەکەی بابامیرن و یەکجار دلیرو ڕەشیدن. هەباس ئاغاش مرۆیکی بەخشندە و له دابی عەشیرەتی دا فره ژیر و تێگەیشتوه. بێجگه له و دوو دەستەی بابانی و ئەردەلانی ئەوی تر پێیان ئێژن فەلاح، مەبەست ڕەعیەت و جوتیاره.

به کورتی ئەمیر لەوه لامی باوکم بنچینەی کاری هەر سێ تایفەی بۆ ڕوون بووه. بڕوای به ئاقل و تێگەیشتن و ژیری ئەو کرد و ڕوژی دوایی شبریك و جبەیەکی کشمیری به خەلات دایه.

به کورتی لەبەر ئەوەی بناغەی کاری من لەسەر کورت برینەوەیه، زیاتر لەوه ڕاپورتی کوردستانی موکریانم به درێژ زانی. چونکه سەرگوزەشتی ئه وانیشم وەك هی بابان و ئەردەلان لەبەرچاو نەبوو.

والسلام علی من اتبع الهدی

# فەسلی هەشتەم

## باسی تایفەی کوردەکانی رەواندز

پاش ئەو تایفانە، باسی حالی کوردەکانی رەواندز دەنووسری، ئەو تایفە کوسەلێك بوون بێ شعور و دوور لەرێگای پیاوەتی. داب و رەسمی کوردەکانی ئەردەلان و بابان و موکری لە نێو ئەوان دا دیار نیە. بەلام لە سەر ئائینی خۆیان پێداگر و یە کجار دلیر و جوامێرن، ماوەی دوو سێ سال یەك تایفە حوکمران بوە.

درێژایی و پانایی خاکی ئەوان لە رەواندزەوە بیگریّ، بۆ هەر لایك شەش حەوت فرسەخ زیاتر نیە. هەمیشە سەریان بۆ حاکمەکانی کۆیە و هەریر دانواندوە. هەچەندە ولاتی کۆیە هەمیشە گویّ لەمست و رعیەتی پاشاکانی بابان بوون. هەروەك کاتێك عوسمان بەگی برا بچوکی مەحمودپاشای بابان حاکمی کۆیە، لە بەر هوکارێك لەوان دلگیر بوو، ولاتی ئەوانی پەلاماردا. حاکمی رواندز ترسا، تکاکاری ناردن تا لیّیان خۆشبرو خوشکی محمدبەگی حاکمی ئەویّ کە بە میر ناسرابوو لە خۆی مارە کرد، بە جەیاز و دەزگا و دەبدەبە هێنایانە خێوەتی عوسمان بەگ. حوسین بەگ لەو ژنە بوە.

## حوکمرانی محمد بەگی ناسراو بە میرە کوێرەی رەواندز

بە کورتی پاش مردنی عوسمان بەگ و شیرزەیی کاری مەحمود پاشای بابان و سەربەخۆیی سولەیمان پاشای برایان، محمد بەگی میری رواندز بناخەی حوکمرانی خۆیّ لە سەر داد و ئینساف دانا و لە زولم و زۆر دوور کەوتەوە. خودای تعالی پشتی گرت و لە ماوەیەکی کەم دا کاروباری رێك و پێك بوو.

ئەو محمدبەگە مرۆێك بوو لە چاوێك نابینا و شەلێش. نەخوێندەوار بەلام خاوەنی رەوشتێکی باش وئەخلاقێکی جوان بوو. لە رادەبەدەر نەترس و ئازا بوو. لە هەوەلەوە نیزیکەی پێنج هەزار تفەنگچی پیادەی هەبوو. رۆژ بە رۆژ ولاتەکەی پتر ئاوەدان دە بوو. لەپێش دا تایفەیەکی سەربزێوی ئەم ولاتەی سزادا و بە جارێك لەبەینی بردن. نەزم و سیاسەتی ئەو لە بەرێوەبەری دا گەیشتەئەو جێگایەگە هیچ تاوانبارێك لەبنێر و مێ دەسەریەوەنەدەچوو. حەپسخانەکەی هەمیشە ژنی تێدا بوو، مەمکی هێندێکیانی دەبری، ژن و پیاوی بە گوێرەی تاوان وەك یەك سزا دەدا. دەلێن پاش رۆخانی ئەو ٧٠٠ ژنی بێ مەمك لەو ولاتەدا هەبوون. بێجگە لەو

پیاوانەی بەبێ چاو و دەست و پێ مابوونەوە.
بارەگای حاکم لە هەموو شار بەرزتر بوە. رووبارێکی گەورە بە داوێنی شارەکەدا دەروا. شاری رەواندز لەسەر چیایەکی بەرز دروست کراوە. بەزەحمەت ئەو شارە دێتە گرتن. دیواری بارەگای حاکم لە سەر بەردی گەورە داندراوە و لەوێوە تا راستی رووبار هیچ بەرژێنێك نیە. جارێکیان لە هاوین دا محمدبەگ لە گەڵ خێزانی لە سەر بانی دەنوێ کێژێکی یەك ساڵەی لە بێشکە دا دەگرێ یك دووجار بە خێزانی دەڵی بێدەنگی بکا، ئەویش ناتوانی، ئاخرەکەی توورە دەبێ، منداڵەکەی بە بێشکەوە توور هەڵدا نێو رووبارەکە. هەروەها لە سەر نیو من ترێ برازای خۆی سەر برێ.

## هێرشی میری رەواندز بۆ سەر کوردە داسنیەکان

بە کورتی، میر محمد پاش ئەزمی وڵاتی خۆی بە شەش هەزار تفەنگچیەوە چیای ژەنگار و دێهاتی داسنیە شەیتانپەرەستەکانی(١٣) پەلاماردا. ئەوە چیایەکی کەلێك بەرزە و سێ سەت گوندی تێدایە. هەمویان شەیتانپەرەستن. لە شوێنی خۆی باسی پیروباوەری ئەوان دەکەین.
محمد بەگی میری رەواندز لەگەڵ ئەو تایفەیە شەرێکی گەورەی لێ قەوما. ئەوانی تێك شکاند. عەلی بەگ و بەدربەگی مەزنی ئەوان تووشی داوی بەلا بوون. پاشان گەرایەوە بۆ شوێنی خۆی. پتر لە هەزار دیلی نێر و مێی داسنی لەگەڵ خۆی هێنا. لە پێشدا عەلی بەگی حاکمی ژەنگاری کە لاوێکی جوانچاك و کارباش بوو، بانگ کرد و گوتی: بۆچی ئێوە دەرکراوی بارەگای خودا بە خاوەن دەزانن و دەست لە فەرمانبەری ئەو هەڵناگرن؟ ئێستا لە دوو کار لە یەکیان سەر پشك بە! یەکەم لەعنەت لە شەیتان بکە و دان بە یەکێتی خودا دا بێنە و محمد بە رێنوێن بزانە. ئەگەر وابکەی پلە وپایەی تۆ زیاد دەکەم و دەتکەم بە ئەمیری هەمو ژەنگار، ئەگەر وا نەبێ دووهەم هەیە، ئەویش شەق کردنت بە شیر. لەوەشدا بەزەییم بە جوانچاکی تۆدا دێ ت، دەنا تاوانبار بە تایبەت بێ دینان بە سەر پەراندن نەبێ دەرباز ناکەم.
عەلی بەگ لە وەلام دا گوتی: خودا بە تاقانە دەپەرەستم. لە ئێتاعەتی مەلیکی ئەکبەر و تاوسیی ئەعزەم دەست هەڵناگرم چونکە ئەو لەحەوت ئاسمان ماموستای هەموو مەلائیکەتانە. میر لەبیستنی وتەکانی توورە بوو، ئەمری کرد بیکوژن پاشان فەرمانی کوشتنی ئەوانی دیکەشی دا. بەدر بەگ هاتەسەر دینی ئیسلام و ئازاد کرا. ئەوانی دیکەش، بێجگە لە سەد کەسیان، کەکوشتیانن، موسڵمان بوون. دەڵێن لەو سەفەرەدا ئەوەندەیان

ماڵی ئەم خەڵکە وەگیر کەوت کە لە ئەژمار نایە.
ئەشیای ئالتون وەك کوپە لە ماڵە کانیان دوزرایەوە. هێندێك دەڵێن بە ئەدرایی پێنجسەت هەزارتمەن لە سکە و شتی تر گەیشتە دەست کار بەدەستانی ناوبراو. بێجگە لەوەی وەگیر لەشکر کەوتبوو میری رەواندز بەو تالآنە ئەوندە لە شەوکەت و سامانی زیاد بوو کە لە حیساب نایە. نیزیکەی چوار هەزار تفەنگچی نۆ سسلمانی لە گوندی داسنیان ئامادەکرد و بە گژ وڵات ودێهاتی دەوروبەریدا کردن، روی کردە هەر شوێنی گرتی، وڵاتی هەولێر و ئاکرە و چیای ژەنگاری تا نیزیك دیاربەکری گرت، وڵاتی هەریر و کوێەشی داگیرکرد. لەلای ئازەربایجان تا دەوروبەری مەرگەوەر و برادوستی گرت. لە ماوەی چوار پێنج ساڵدا، ئەوەندە بە توانا و سەربەخۆ بوو کەبەئاللی کەس دا نەیە.
ئەم کارە لە رادەبەدەر عەلیرەزا پاشای وەزیری بەغدای دلگیر کرد. محمد پاشای والی سولەیمانی کە پیاوێکی ئازاو رەشید بوو کردی بە مەعموری سەرکوتکردنی. لە نێوان ئەو و میری رەواندزدا شەری گەورە قەومان . هیچی بۆ نەکرا و گەرایەوە شوێنی خۆی. رۆژ بە رۆژ ئیعتیبار و دەسەلاتی میر زیادی دەکرد. شەست هەزار تفەنگچی پیادە لە ژێر ئاڵای ئەودا ئامادە دەبوون. هەر هەزار کەس سەروکێکی بۆ دیاری کردبو. وڵاتەکانی داگیر کرابوون، هەریەکەی کابرایەکی رەواندزی لێ کردبوونە سەروك. نەزم و یاسایەکی ئەوتۆی دانابوو ئەوەی ئەو ریگای نە دابایە، نەیدە توانی لە ماڵی خۆی چرا هەڵکات، هەروەك عەبدی بەگ یەکێ لە بارەر پێکراوان و حاکمی هەولێر بوو، نەیدەتوانی چرا هەلکا و بێجگە لە شیلم و برویش هیچ خواردنی دیکەی لە ماڵیدا نەبوو. کابرایەك هوێ ئەوەی لی پرسی لە وەلام دا گوتی : من رەعیەتم وهیچی ئەمیر نیم، پلە و پایەشم نەگەیوەتە روناکایی چرا وچێشتی بە تام وچێژ، ناچار هەر بەم جوزە رایدەبوێرم وخۆم ناخەمەبەر رق وغەزەبی پاشا.

**شەری حەمە رەشید پاشای دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ محمد پاشای میری رەواندزو گرتنی میر**

وەزعی عێراقی عەرەب لە بەر دەسەلاتی محمد پاشای میری رواندز تەواو شپرزە و پەریشان بوو. چونیەتی داماوی خۆیان بۆ کار بە دەستانی دەوڵەتی عوسمانی نووسی. ئەم رووداوانە لە زەمانی دەوڵەتی مەحمود خاندا قەوما . کاربەدەستانی دەوڵەت بۆ لەبەین بردنی کەوتنە خۆ. ناچار حەمە رەشید پاشای سەدری ئەعزەم کە سەرۆکی ئەم سنوور و ناوچانە و

موختاری دەوڵەتی روم بوو، لەگەڵ هشتاهەزار سەرباز و سێ هەزار سوار، بۆ گرتنی رواندز و سەرکوتکردنی محمد پاشایان نارد. لە لایەن دەوڵەتی ئێرانیشەوە، شازادە قارەمان میرزا حوکمرانی ئازەربایجان و محمد خانی ئەمیر نیزام بۆ سنوری لاجان هاتن. لە لەشکری ئازەربایجان و ئەردەڵان و موکری نیزیکەی بیست هەزار کەسیان لە گەڵ بوون. لەو کاتەدا باوکی نووسەر نیزیکەی سەت هەزار تمەنی لە پاشای رواندزەوە بۆ دەوڵەتی ئێران پەیدا کرد. نهێنی نەبێ خوێنەرانی ئەم نووسراوە پێیان وا نەبی کە لێرەدا مەبەستی تایبەتیم هەیە. خوا دەزانی لە سەرەتای نووسینی ئەو کتێبە تا ئێستا لە پێوەنان خۆم پاراستوە. بەڵەت سەرەمرویەك مەبەستی تایبەتیم بەکار نەهێناوە. زۆر کەس لەخەڵکی ئەو سەردەمە زیندوون و هەریەکەی شتێکم لێ پرسیون و ئەم راپورتەم نوسیوە.

هەر چونێك بێ، رەشید پاشای سەدری ئەعزەم بە لەشکرەوە بۆ گرتنی رەواندز لە قوستەنتەنیە وەدەرکەوت. محمد پاشا لە هاتنی ئەو ئاگادار بوو، سەرلەنوێ نامەی بۆ ئەمیر نیزام نووسی و داوای یارمەتی کرد. لەلای ئێرانەوە سولەیمان خانی سەرتیپی مەسیحی بە سێ تیپ سەرباز و پێنجسەت سوارەوە کرا بە مەعموری یاریدانی. بە لام کاتی بزووتنی لەشکری ئێران، رەشید پاشا لە دەرەوەی شاری رەواندز لەشکری کۆ کردەوە. محمد پاشا بۆ بەرگری کەوتەخۆ. محمد باس کە سەرداری گشتی سوپای ئەو بوو، لەبنەوەلە گەڵ رەشید پاشای سەدری ئەعزەم رێك کەتبو. لەبەرئەوەهەر چەندی محمد پاشا لەشکری خۆی بو شەر هاندا، کەس جوابی نەداوە. ناچار ناو براو ملی بۆ لەزاو لەدەرراکیشاو سەری بۆ سەدری ئەعزەم دانواند و لە پەناگا هاتەدەر، رەشید پاشا دەستی بە سەر خەزێنە و سامانی محمد پاشا داگرت ، لەشکری وی لەبەریەك بڵاو کرد، تفەنگ و چەك وچولی لێ ئەستاند و سەرلەنوێ ئەو حەشبمەتە زۆرەی ناردەوە سەر کار و باری قەدیم. محمد پاشای لەگەڵ ئەوهەموو سامانە بۆ ئەستەمبول برد. وڵاتەکانی بەر دەستی ئەوی دووبارە خستەوە ژێر فەرمانی والی. حاکمێکی خەڵکی عوسمانی لە سەر رەواندز دانا. رەسول پاشای برای محمد پاشا کە داوای پەنای لە دەوڵەت کردبوو، بە ماڵ و منداڵەوە لە شاری بەغدای نشتەجێ کرد.

## دیداری سولتانی عوسمانی لەگەڵ میر محمدی پاشای رەواندز

بە کورتی سەدری ئەعزەم، میری رواندزی گەیاندە بارگای سولتانی. لەسەر فەرمانی سولتان ناوبراو بە سوچە و بەراتەوە لەوی راگیرا. نیزیکەی

دوو ساڵ هەروا مایەوە. بەهەلکەوت خانووی ئەو دراوسێ یەکێك لە پیاوە گەورەکانی دەوڵەت بوو. ئەوپیاوە لەگەڵ میری رواندز دوستایەتی پەیداکرد، بەزەیی بە حاڵی داهات، هەمیشە بانگی دەکردە ماڵی خۆی، پیاوەتی دەگەڵ دەکرد. لە دەربەفەت دا لەکن سولتان قسەی چاکی بۆ دەکرد. لە بوختانی سەربەزێوی و یاغی بوون پاکانەی بوو دەکرد، لەماوەی ساڵێکدا ئەوەندەی باس کرد کە سولتان ویستی چاوی پێ بکەوێ. بە کابرای گوت شەوێکی بە بێدەنگی محمد پاشای بینە. لەودەمەدا سولتانەکانی رۆم داب ورەسمیان وابووئەگەر تاوانبارێکیان بە بێدەنگی بانگ کردبایە لە خیانەتەکانی خۆش دەبوون. کابرا هەر مەتڵەبێکی بایە لێی قەبول دەکرا. شەوێك کابرا میری رەواندزی بردە خزمەت سولتان، ناوبراو زۆر بە زەلیلی سەری بۆ دانواند و داوای لێبووردنی کرد. سولتان بەزەیی پێداهات و گوتی: لە تاوانەکانت خۆش بووم. وڵات و شوێنە داگیرکراوەکانت دەدەمەوە بەخۆت، بەڵام ئەگەر لە مەودواوە لەخزمەتگوزاری دەوڵەت سەربادەی، تووشی عەزاب و سزا دەبێ.

محمد پاشا بە شوکرانەی ئەو چاکەی سوژدەی برد و خودای بە شاهید هێنا و گوتی: بە سەر و گیان فەرمانی سولتان قەبول دەکەم و ئەگەر لە بەندەیی و خزمەت سەر بادەم، شەرمەندەی دەرگای خودا و بارگای سولتان بم.

سولتان هەر ئەو دەم جیبەیەکی ئاڵتون درویی خەڵات کرد و گێڕایەوە بۆ شوێنی خۆی. بەیانی بە سەدری ئەعزەمی راگەیاندکە فەرمانی حکومەتی وڵاتەکانی ناوبراو بەناوی محمد پاشا بنووسێ، تەواوی رێبەرانی حکومەت لەوکارەسەریان سورما. کەس توانای بەرپەرچدانەوەی نەبوو، هەر ئەو دەم فەرمانی سولتان بەجێ گەیشت.

## دانانی دووبارەی میری رەواندز و دژایەتی عەلیرەزا پاشای والی بەغدا لەگەڵ ئەو

بەکورتی بەفەرمانی سولتان خەڵات و نیشانی ئەیالەتی ئەو وڵاتە درا بە میر و بەعیزەتی تەواو و دەسەڵاتەوە بەرەو وڵاتی خۆ ی کەوتە رێ. وەکیلی عەلیرەزا پاشای والی بەغدا ئەم رووداوەی پێ ڕاگەیاند. دوای بیستنی ئەو خەبەرە ناوبراو فرە پەژار و نارەحەت بوو. گورج نامەیەکی بۆ سەدری ئەعزەم وکاربەدەستانی دەوڵەت نووسی کە دوای گەیشتنەوەی میر محمد پاشا، من لەسەر کاروباری عێراق لابەرن. چونکە ئەگەر جاری پێشوو پێویست بوو سەدری ئەعزەم بکرێتە مەعموری سەرکوتکردنی، ئەم

چارە ئەگەر سولتان خۆی ئاگری ئەم فیتنەیە بکوژێنیتەوە. هەر ئەو رۆژە نامەی بە تەتەری خێرا بۆ ئەستەنبول نارد. وەکیلی وەزیری بەغدا گورج نامەیەکەی گەیاندە دەستی وەزیرەکانی عوسمانی. هەمویان نامەکەیان بردە خزمەت سولتان و گوتیان عەلی رەزا پاشا لەگەل ئازادی محمد پاشا هاودەنگ نیە و بەم هۆیە لە حکومەتی بەغدا وازی هێناوە. سولتان گوتی: عەلی رەزا پاشا لەکوتەوە تینی لەوە و قسەکانی ئەو لەم بارەوە ئیعتیباریان نیە. سەدری ئەعزەم گوتی: چونکە ولاتی عیراق یەکی لەسنوورەکانی دەولەتە وعەلی رەزا پاشا پیاوێکی گەورەیە، ئەگەر محمد پاشا رێزی لێنەگری و سەری بۆ دانەنوێنێ، بێگومان هەودای ئەزمی ئەیالەتی عێراق دەپسی. ئێستا واباشە کە محمد پاشا لە بەر فەرمانی سولتان بچێتەوە شوێنی خۆی. بەلام بۆ رێز گرتن لە وەزیری بەغدا، بەر لەوەی بچێتەوە مالی خۆی، بچێتە بەغدا و ئاشت بنەوە، پاشان بچێتەوە ولاتی خۆی. سولتان ئەو قسەی پەسند کرد. ئەمری کرد نامەیەك بۆ محمد پاشا بنوسن کە بەگەیشتنی ئەم نامەیە بچێتە بەغدا بۆ دیتنی وەزیر و تەواو کردنی کاری حکومەتی خۆی لەو بخوازێ.

**فەرمانی سولتان بۆ میر محمد لەبارەی دیتنی عەلیرەزا پاشا و سەربادانی میر**

ئەوفەرمانە لە شەش مزلی ئەستەنبول گەیشتە میری رەواندز، کاتی لەنێوەروکی حالی بوو، خۆی لەبێ ئاقلی دا و گوتی: ئەوکاتەی نە چوو بوومە خزمەت سولتان هەرگیز بە بچوکی وەزیری بەغدا رازی نەبووم، ئێستا کە دەستی سولتانم ماچ کردوە، چۆن ئەو عەیبە دێنمە سەرشانم وەلامی سولتانیشی هەرئاوا نوسیبوو دایەوە دەست تەتەر و رێگای داگرت. کاربە دەستانی دەولەتی روم نامەکەیان بە سولتان راگەیاندو لە بێ ئاقلی وبێ تەگبیری ئەو شکایەتیان کرد. سولتان لەرمووی ئەوجارەش نامەی بۆ بنوسن و بێژن وەلی نیعمەتی تۆ تکات لێ دەکات کە پێش گەیشتنەوەی ولاتی خۆی، بچێتە بەغدا بۆ لای عەلی رەزا پاشا وپاشان بگەرێتەوە بۆ ولاتی خۆی، لە بەر ئەوەی شەبەقی مەرحەمەتی ئێمە لەو نۆکەرە دەولەت خوایەی داوە، لە هەمو بارێکەوە چاکی کاروباری ئەومان دەوێت. عەلی رەزا پاشا والی عێراق و حیجازە و بە سەرفەرمانبەرەکانی تریدا هەیە، وا باشە ئێوە بچنە دیتنی ئەو، پاشان بە مەرام و ئاکامی خۆت بگەی.

کە ئەو نامەیە نوسراوە، لە بنەوەش فەرمان درا بەحاکمەکانی سەر رێگا، لە هەر شوێنی نامەی سولتان بگاتە دەستی محمد پاشا و لەسەر

بیروڕای خۆی بهێنێتەوە، هەر لەوشارە ڕایبگرن تا حوکمی دووەم دەردەچێ.

بە کورتی تەتەر بە پەلە کەوتەرێ، لەشاری سیواس گەیشتە میری ڕەواندز، فەرمانی سوڵتانی پێگەیاند. ناوبراو گوتی هەر ئەوەیە کە لە پێشدا گوتومە. من لەت ناچمە کن عەلی ڕەزاپاشا و بە هیچی نازانم وەڵامەکەشی هەربەم جۆرە نوسیوە. کاتێ تەتەر لە فێڵ و لووت بەرزی میر ئاگادار بوو، چوە کن حاکمی شار و فەرمانی سوڵتانی پێ ڕاگەیاند. دەست بە جێ والی خەڵکێکی بۆ ڕاگرتنی محمد پاشا دیاری کرد تا فەرمانی دوایی پێدەگات

ڕۆژی دوایی تەتەر بەرەو ئەستانبول کەوتە ڕێ و نامەی میری دا بە کاربەدەستانی دەوڵەت. هەمویان لە ئاقڵ سووکی ئەو سات بوون. داخی ئەو بەختەوەرێیان خوارد کە ڕووی تێکرد بوو. پاشان سەدری ئەعزەم نامەکەی بردە خزمەت سوڵتان وگوتی من ئەو ئەحمەقەم باش دەناسی، بەڵام چونکی سوڵتان لوتفی لەگەڵ هەبوو، ناچار فەرمانی ئەو بەرپرچ نەدرایەوە. سوڵتان لە قسەکانی سەدری ئەعزەم زۆر تورە بوو، بانگی ئەو کابرایەی کرد کە ڕۆژی هەوڵ میری بەسوڵتان ناساندبوو. سوڵتان گوتی: تۆ منت تووشی هەڵەیەکی گەورە کرد. پیاوێکی پەحمەت هێنا لای من ئابڕووی سەڵتەنەتت برد. کابرا ویستی عوزر بێنێتەوە، لێی قەبول نەکرا. هەر لەجێ فەرمانی دا و سەریان پەڕاند. پاشان بە سەدری ئەعزەمی گوت، بۆ حاکمی بنووسە کە دەست بەجێ محمد پاشا دەجەوالێك بدروی و دەبەحری باوێت.

هەر ئەو ڕۆژە تەتەر کەوتە ڕێ، دوای سێ ڕۆژگەیشتە سیواس و نامەی سوڵتانی دا بەحاکم. شەوی بەسەر میری وەربوون وزنجیریان کرد، هەر وەك بڕیار درابوو دە جەوالێکیان نا و سەریان دروو، دە بەحریان هاوێشت. ئاگری فیتنەی ئەو بە ئاوی دەریا کوژایەوە و ڕێگای نەبونی گرتە بەر.

لەودەمەوە تا ئێستا دەوڵەتی عوسمانی بەسەر ڕەواندزدا حوکمڕانی دەکا. داب و ڕەسمی قەدیم بە جارێك گوێز کراوە. وەك هەمو وڵات تەنزیماتی دەوڵەتێ لەوێ دامەزرا.

*( ڕاپورتی کوردستانی ڕەواندز بە کورتی کوتایی هات )*

لەبەر ئەوەی کاتی ڕاپورتی ڕەواندز گوتمان باسی بیروباوەڕ و ئاینی تایفەی داسنی شەیتان پەرەست دەکەین، ئەوا بەکورتی دێینە سەر باسەکە. پاشان مزل و فرسەخ و ناوی گوند وئەژماری خەڵکی ئەم وڵاتانە

دەنووسرێ. چونکە بەڵای ڕۆژگار پەکی خستووم، باسی گشت شازادەی تایفەی کوردان وەدوا کەوت. بۆیە بە باسی ئەو چەند تایفە وازم هێنا، ئە گەر لەمەویەدوا خودا بمژێنێ لە بەرەمەدا ڕوداوەکانی تری کوردان دەنووسم. ئێستا باسی تایفەی داسنی

## باسی حالی تایفەی داسنی

لە نیزیك موسل چیایەکی زۆر گەورە هەیە، کەبیست فەرسەخ دەوروبەریەتی. ئەم چیایە ژمنگاری ناوەو وشوێنی دانیشتنی کوردە داسنیەکانی شەیتانپەرەستە. ئەو تایفە بڕوایان بە تاقانەیی خودا و نیزیکی شەیتان لە خودا هەیە. بڕوایان بە هیچ پێغەمبەرێکی نیە. دەڵێن خودای تعالی کەسی باشتر لە شەیتان دروست نەکردوە. ئەو مامۆستای هەموو مەلائیکەتانە وتەگبیری کاروباری دونیا هەمو بە دەستی ئەوە، ئەگەر بیەوی دەمرێنێ و بیەوی زێندوو دەکاتەوە. بەبێ ئیجازەی ئەو ئیزرائیل ناتوانی گیانی کەس بکێشێ، ناوی ئەو مەلەکەی گەورە و تاووسی مەزنە.

ئەو تایفە هێندی داب ورەسمیان بۆ خۆ داناوە و بە شەریعەتی دەناسن. دەڵێن ئەو حوکمانە مەلیکی ئەعزەم بۆی هێناوێن. زاناو ڕێبەرەکانیان وایان لە خەڵك گەیاندوە کەتاووسی ئەعزەم هەموو ڕۆژی دیتە لایان و حوکمی دینیان فێردەکات.

ژن مارە کردنیان لە نێو دانیە، ئەگەر بیانەوی کچێك بە مێرد بدەن یەکەم شەو دەبی بووکی بەرنە کن زانای ئەو گوندە و ئەو لەگەڵی بنوی(۱۴) ئەگەر کیژەکەرازی نەبێ و خۆ بە دەستەوە نە دات ئیتر ئەوە مارەییەکەش بەتالە. لەمەی سەیر هێندێجار لە زاناکانیان سەر هەلدەدا. وەك شتی ونبوو بەبێ ڕەمل و حساب دەدوزنەوە. یەزیدییەکان لە رادەبەدەر ئازا و جوامێر و میواندوستن. ئەگەر میوانیان بێ هەرچی هەیانە لە پێشی دادەنێن. باحەدر و خەتار دوو شاروچکەن، بە پێتەختی ئەوان دەژمێردرێن. سەروکی ئەوان عەلی بەگ و بەدربەگ-ن کە لە ڕوداوەکانی رەواندزدا باسیان کرا. پاش زاڵبوونی میری رەواندز بەسەریاندا عەلی بەگ کوژرا و بەدربەگ موسلمان بوو. محمد پاشا کردی بە سەروکی چیای ژمنگار خەلاتی کرد و ناردییە جێگای خۆی. پاش ئەم ڕوداوە کاروباری ئەم تایفەیە شپرزە بوو. وردە وردە خەڵك موسلمان دەبوون. ئەوانەی ماون لە هەژاری و نەداریدا دەژین. حاکمێکی رەواندزی لەسەریانە و بە گوێرەی یاسای دەوڵەتی لەگەڵیان دەجووڵێتەوە.

*(ئەوە بوو بە کورتی باسی تایفەی داسنی)*

# فـەسـلی نـویـەم

## باسی مەنزل و فەرسەخەکانی چوار سنووری کوردستانی بابان و ئەردەلان

باسی قوناخ(١٥) و فەرسەخەکانی چوار سنووری کوردستانی ئەردەلان و بابان و ئەو گوندانەی کە کەوتوونە سەر ریگای کاروان و ریبواران و گوندەکانی کە نێو ریگای ئەم قوناخانەن و لە زستاندا ریبوار و کاروان لیّیان لادەدەن. ناوی گەرەکەکانی شاری سنە و ژمارەی مالەکان و دانیشتوانی ئەم شارە.

- لە شاری هەمەدانەوە تا سنە چوار مزلە. بریتییە لە بیست و چوار فەرسەخ. لە هەمەدانەوە تا سالحاوا(١٦) سیّ فەرسەخە. بە گوێرەی قسەی دانیشتوانی ٩٠٠ مالە. لە سالحاواوە تا هەمەکەسی(١٧) سیّ فەرسەخە. دووسەت و چەند مالێکە. ئەوانەم کاتێکی خۆم کەمەمووری دامەزرانی تیپی هەرشاری ئەسەدئاوا و هێنانەوەی سەربازانی بلاو بوو بووم بژاردوە. ئەوان بە دووزمانی کوردی و تورکی دەپەیڤن. هەمویان شیعە مەزهەبن. لەویوە تا ئەسفەندئاوا(١٨) کە سەرەتای خاکی ئەردەلانە فرسەخێکە، بە کورتی لە هەمەکەسی‌یەوە تا دزە سیّ فرسەخە، چل پنجا مال پتر نیە. دانیشتوانی ئەوی شیعەوسوننی‌نە. لە دزەوە تا قوروە سیّ فرسەخە، سەدوپەنجا مال پترە، زمانیان تورکی‌یە وکوردیش دەزانن. لە قوروە تاچەقلو (چەقلو٢١کیلومتری سەروی روژ ئاوای قوروە) سیّ فرسەخە ونیزیکەی پەنجا مالە، هەمویان ئەهلی سوننەت وجەماعەتن. لە چەقلوە تادێگولان تاگورگاوا (٤ کیلومتری روژ هەلاتی سنە) سیّ فرسەخە، نیزیکەی چل پەنجا مالێکە، هەمویان سوننین. لە گورگاوا تا شاری سنە سیّ فەرسەخە. ئەژماری مالە کانی سنە پێنج هەزارە. بە گوێرەی فەرمانی شاهەنشای ئێران سالی هەزارودووسەت وحەفتاوشەشی کوچی دانیشتوانی ئەو شارمیان بژاردو، گەورەوبچوک سیّ هەزار کەس نوسراوە.

لە ئەسلی کتێبەکەدا هێندی ئەخلاق وئەتواری خەلکی ئەوشارەئاوا باسکراوە : زوربەی خەلکی سنە ئەهلی سوننەت و جەماعەت وشافیعی مەزهبن. سەبارەت بە دراوسێەتی وهاتوچوی بازرگان و بێگانەی ئێرانی هێندی لەخەلك وەدوای شیعەکەوتون. زمانیان کوردی تەواوە وفارسێش باش دەزانن،

ئەسڵی شار بریتی‌یە لە چوار گەرەك: یەكەم گەرەكی ناوەڵایە كەبارەگای حكومەت وخانووی هێندی گەوران لەوێدایە. خسروخان و ئەمانوڵا خان والیە گەورەكان دیوارێكیان لەدەوری كێشاوە، چوار دەروازەی هەیە: یەكەم دەروازەی قەڵاچوالانە روو بە رۆژئاوا. وەك لەباسی باباندا بەدرێژی باسی قەڵا جوالان و دروست كردنیمان كرد، لەپێش سولەیمانی دروست كراوە و ئێستاكە جێگای حاكمەكانە. دووەم دەروازەی تەپولەیە كە كەوتوتە سەر تەپكێكی چكولە. تەپولە بە كوردی‌یانی تەپكی بچووك. ئەو دروازەیە روی لە باشورە. سی‌یەم دەروازەی ناسراو بەعبدالعظیمە رووی كەوتوتە لای لیبلە. چوارەم دەروازەی بازارەكە روی لەرۆژهەلاتە.

گەرەكی دووەمی سنە ناوی قەتارچیانە، خانووبەرەی وەكیلەكانی كوردستان هەمیشە لەوی بوە، چونم كەوتوتە نێوانی قەڵا و ئەم گەرەكە.

گەرەكی سی‌یەم ناوی قەبرئاوایە، گەرەكی چوارەم گەرەكی بازاری ناوە. دانیشتوانی ئەوگەرەكە بازرگان ودوكانداران. بێجگە لەوچوار گەرەكە ،گەرەكی دیكەش لەوچوارگەرەكە و باسی ئەوان دەبی تە درێژە پێدان.

لەشاری سنەوە تا سولەیمانی ۳۶ فرسەخە و شەش قوناغی كاروانە. قوناغی یەكەم لەشارەوە تا دوو وەیسە (۱۹) شەش فرسەخە. لەدوو وەیسە تا جانوری( ۲۰ ) حەوت فرسەخە. لە جانورەوە تا میراوا شەش فرسەخە. لەمیراوا تا پنجوین شەش فرسەخە، لەوشەش فرسەخە پینج فرسەخی تا یەكفرسەخی پنجوین خاكی دەوڵەتی ئێرانە و سەرەتای خاكی بابان. لە ئەسلی كتێبەكەدا باسم كردوە كە كەنگێ وچۆن وڵاتی كوردستانی بابان لە دەست ئێران دەرچوە بە دەوڵەتی عوسمانیەوە لكاوە.

## سیفەتی دەریاچەی مەریوان

لێرەدا باشە باسی دەریاچەی مەریوان بكەین كە خوێنەرانی ئەم نوسراوەیە لێ ئاگادارین. لە پانایی قوناغی رۆژئاوای سنەی ئەردەلان، رێبواران رێگایان بە دەشتی مەریوان دایە. لەدەشتی ناوبراو دەریاچەیەك هەیە بەناوی (زریبار). خەڵكی ئەم مەلبەندە لایان وایە كە ئەم دەریاچەیە لە زەمانی كوندا شارێكی قایم بوە، حاكم و مەحكومی ئەو وڵاتە لە ئەمری خودا سەریان باداوە و رێگای زوڵمیان گرتوت بەر. رێبواری ئەوی و فەقیریان ئازار داوە. پاش ئەوەی فەساد و زوڵم وبلهوریان لەرادە تێ‌پەرێوە، لەتووك و دوعای دەروێشێكی فەقیر و دلبریندار كەوتونە بەر غەزەبی خودا وبناغەی پتەو وحەساری قایم بە جاری دە عەرزی

روچوون‌وسه‌رەو ژێر بوون. ئەم دەریاچەیە لە جێگای ئەوشارە پەیدا بوە. گۆڕی دەرویشەکەش ئێستا لەپەنا دەریاچەلەسەر چیایە.
بە کورتی مەیدانی جەغزی ئەو دەریاچەیە لەسی فرسەخ کەمتر نیە. دەور و بەری ئاسیشەلێن و زەمەند دایگرتوە، ئەسلی دەریاچەکە پاك و روونە، سێ چارەکە فرسەخ پترە. بەکورتی لە پەنجوینەوە تا گوندی گەرێزە حەوت فرسەخە. لە کەرێزەوە تا شاری سولیمانی حەوت فرسەخە. کاروان هێندی جارئەم دوو قوناخەبە سێ رۆژ دەبری.

## باسی سنووری باشوری ئەردەلان تا سنووری موکری

لە شاری سنەوەتا گوندی کچك (٢١) ٢٧ فرسەخە، بریتیە لە ٥ قوناخ، قوناخی یەکەم لە شارەوە تا گزان ٨٢٢) پێنج فرسەخە. لەگزانەوە تا دیواندەرە حەوت فرسەخ، لە دیواندەرەوە تا باشماغ (٢٣) شەش فرسەخ لە باشماغەوە تا سەقز شەش فرسەخە، لەسەقزەوە تا کچك، هەوەلی خاکی موکری سێ فرسەخە.

## باسی سنووری خواروی ئەردەلان بۆ لای زەهاو

لەسنەوە تا زمکان کە ئاخری خاکی ئەم وڵاتەیە بیست وشەش فرسەخە، ئەم مەودایە پێنج یا شەش قوناخە. قوناخی یەکەم لە شارەوە تاگوندی یەمیان شەش فرسەخە. لەیەمیانەوە تا شاهینی چوار فرسەخە. لە شاهینی تا روانسەر چوار فرسەخە. لە روانسەرەوە تا جوانرو سێ فرسەخە. لە جوانروە تا زلان سێ فرسەخە. لە زلانەوە تا زمکان چوار فرسەخە.
باسی سنوری چوار لایەنەی ئەردەلان لێرەدا تەواو بوو، بە توفیقی خوای تەعالا.

## باسی سنووری چوار لایانەی کوردستانی بابان

شاری سولیمانی، بارەگای حکومەتی بابان، سنوری باشوری ئەم وڵاتە، لەدیاری کردنی قوناخەکانی ئەردەلاندا نوسیوە. ئێستا سێ لایەنەکەی دیکەباس دەکەین. لای رۆژ هەڵاتی لەشاری سولیمانی تا رۆخی چەمی سیروان کە مابەینی خاکی بابان و زەهاوە، دوازدە فرسەخە. دەڵێن ئەم مەودایە بە دوو رۆژ یا سێ رۆژ دەبرن. قوناخی یەکەم لەسولەیمانی تا گوندیکنان چوار فرسەخە، لە کنانەوە تا وارماوا سێ فرسەخە. لە وارماوە تا پەنا چومی سیروان پێنج فەرسەخە. ئەم سێ قوناخە هەموی بە پەنا دەشتی شارەزووردا تێ دەپەرێ.

## باسی سنوری خوارووی سولیمانی بۆ لای کەرکوک

لەسولەیمانیەوە تاداری کەلی شەش فرسەخە، لە داری کەلیەوە تا کانیٔ شێنکە پێنج فرسەخە. لە کانیٔ شێنکەوە تا لورق و تالەبان، خانەقای شێخ عبدالرحمانی خەلیفەی قادری چوار فرسەخە، ئەوە ئاخری خاکی بابان و هەوەلی ولاتی کەرکوکە. لەخانەقاوە تا شاریکەرکوک چوار فرسەخە.

## باسی هێندی روداوی جۆربەجۆر و شوێنەواری عەجایب لە کوردستان

لە سولەیمانیەوە تا گوندی ماوەت حەوت فرسەخە، لە ماوەتەوە تا پەنا چوٚنی ئەبەت کە خەتی نێوان خاکی بابان و سەردەشتە چوار فرسەخە. راپۆرتی دیاری کردنی قوناخ و فرسەخەکانی کوردستانی بابان بەکورتی تەواو برو.

## باسی لای رۆژهەلاتی سولەیمانی کەبەسەردەشتی موکریانەوە لکاوە

لە کوردستانی ئەردەلان شوێنێك هەیە بەناوی "هۆیەتو" کەوتوتە نیزیك ساینقەلا و ناوچەی سەقز. چیایەکی لیٚیە بەناوی کەرەلتو کە فرە بەرز نیە. لە لەدی ئەم کێوە بەردتاشان بە دەمی قولنگ چەند خانوی بەردیان تاشیوە. لەزەمانی کوتەوە رێچکەیەکی فرە سەختیان بۆ سەر کەوتن دروست کردوە. دیارە ئێستا ویرانە. تاقە کەسێك بەزەحمەت دەتوانی سەر کەوی، لە نێوە راستی ئەم خانوە ئەشکەوتێکی بەرز وتارێك هەیە کەچاوی بینەران لەدیتنی واق دەمێنی. لە قوژبنێکی ئەشکەوتەکە ئاوێکی ساف و سارد وردە وردە لەبەری میچی دێتەخوارێ، بە کورتی نوسەری کتێب لەتەمەنی ۱۴-۱۵ سالێدا لەگەل باوکی رەحمەتی و لەخزمەت والی رمزا قولی خانی رەحمەتی و هێندی لە گەورەپیاوانی کوردستان چوینەتە تەماشای ئەو شوێنە. بەئەمری والی سومی زۆریان پێکردن. چوینە نێو ئەشکەوتەکە لە سەودای سەد پی‌دا ئاوێکمان هاتەسەر ریگا، بەنێویدا رویشتین، گویا ئەو ئاوەی کە دلوپ دلوپ لەبەری میچیکوشەکە دەهاتە خوارێ لە تەرایی ئەو ئاوە بوە، بە کورتی پاش تێپەر بوون لەو ئاوە نیزیکەی دوو سەت پیٚی دیکە رویشتین تابرونێکی گەورەمان دیت بێجگە لە کەللەسەری ئینسانێك چیتری تێدا نەبرو. لەویشەوە بەقەد هەزار پیٚ رویشتین، میچی ئەشکەوتەکە لەهێندی شوین زۆر نەوی ولە هێندی

جێگاش فرە بەرز بوو، لە ئاخری ڕێگامان شوێنێ هەبوو وەك چوار بازار، وەتاغێکی زۆر گوشاد وبەرز، بەری میچی بەپێپلیکان بوو، نەمانهێشت پتر بڕوین چونکە ترسی ئەوە هەبوو لە گەرانەوەدا سەر دەر نەکەین، لە کەنار و قوژبنان قەلەشتی بەترس دەبینران . بە کورتی لەگەرانەوە دا دەستی یەکترمان گرت وهاتینە دەر، چوون وگەرانەومان پێنج سەعاتی خایاند.

## باسی ئەشکەوتی حەسەنی بەسری لە زرنە

لە دە فەرسەخی شاری سنە بۆ لای خواروو لە نیزیك ڕوانسەر چیایەك هەیە بەناوی زرنە. ئەشکەوتێکی لێیە بە ئەشکەوتی حەسەنی بەسری بە ناوبانگە. نووسەر لە دوورەوە دیتوویەتی، بەلام نەچوە تەماشای بکا. بەلام بەقسەی کەسانی باوەر پێکراو کە چوون و دیتویانە و تەماشایان کردو ونووسەر پرسیاری لێ کردوون، لە زاری ئەشکەوتەکە تاقێکی فرە بەرز هەیە کە ۱۲گەز درێژە، لە ئاخری تاقەکە دارێکی گەورە شین بوە و لقی لە میچی تاقەکە دەرچوە. لە سەروی تاقەکە کولێکی خری بە قەدرایی حەوزێك هەیە. لە قوژبنێك سەکۆیەك لەبەرد و گێچ چاککراوە. هێندی کەس ئێژن شوێنی عیبادەتی شێخ حەسەنی بەسری بووە. بەلام بڕوا بەو قسەیە ناکری چونکە ڕەوشت و شوێنەواری شێخی ناوبراو لە مێژوونووسان شاراوە نیە.

مەولانا ئەحمەد خەلیفەی تەریقەتی نەقشبندی خەلکی ئەو دەوروبەرە. چەند سالێکە کۆچی دوایی کردوە. ئەو گوتویەتی کە ئەم حەسەنی بەسریە ڕێگر بووە وئەم ئەشکەوتەی کردوتە پەناگای خوی، خوا خوی دەزانی.

## باسی تەختی سولەیمان و زیندانی سولەیمان

لە سایینقەلای هەوشار جێگایەك هەیە، تەختی سولەیمانی پێ ئێژن. لە نیزیکی وی چالاوێك هەیە بە ناوی زیندانی سولەیمان. نووسەر ئەم شوێنەی بە چاوی خوی نەدیوە. مانگچی صاحب بارس یەزدانی، بەنازناوی (دەروێشی فانیهیندوستانی) کەسرویەکی ژیر و تێگەیشتوە و لە ئایینی خوی دا پیروز و تەواوە، هەمو تەمەنی لەدنیاگەری وبەتایبەت لە ئێراندا رابواردوە، لەگەل بەندە زۆردۆست ونیزیکە، بوی باس کردووم کە تەختی سولەیمان کولێکی فرە پان و بەرینە. بناخەکەیان بەکاشە بەردی زەلام وتسل وگێچ دارشتوە. پارچەیەك لە قوڕ و چیمەن وەك لوتکەیەك لە

سەرئەم گوڵە دەسووڕێتەوە، مەلەوانان جارێ وا هەیە دە چنە سەر ئەو چیمەنە و کەیفێ دەکەن. سانگچی صاحب گوتی: بە گەزی چەرم وبەردیکی تایبەتی قولایی ئەو گولەم وەدەست هێنا لە شێست گەز زیاتر بوو. درێژایی وپانایشی گوێا هەشتا گەز بوو. باشم لە بیر نیە. هەروەها بەرینی وقولایی زیندانەکەم لە بیرە کە دەیگوت، لە پێشدا کە زاری چالاوەکەم دیت، لە چل گەز پتر ئەدەماتە بەرچاو، پاش ئەوەی بەگەزی چەرم پێوام حەفتا گەزی تەواو بوو. سەیر ئەوە بوو، قولایی چالاوەکەشی بەحەفتا گەز دەزانی، تا ئیرە بیروڕای ناوبراو بوو، بەلام هێندی خەلکی تر قولایی و پان و درێژایی ئەم گول و چالاوە لەوە پتر دادەنێن، وەبال بە ئەستۆی ئەوانەی گوتویانە.

## باسی چونێتی و چیرووکی بابەگورگور

لە ناوچەی ئەسفەندئاوا، سێزدە فرسەخی شاری سنە بۆ لای ڕۆژ هەلات ئیمامزادەیەك هەیە، بە باباگورگور ناسراوە. زیارەتگای ئەو کەسە کەوتوتە سەر تەپۆلکەیەك. کە سوار بەسەر ئەم تەپۆلکەیەدا تێدەپەڕن پێ یان وایە بنی بەتالە. لە ژێر قەبری ئیمامزادە ئاویکی سپی وەك کێنج بەتوندی دێتەدەر. وا دیتە بەر چاو کە ئەوی بوون و بەرز بوونەوەی وەك مەشکە ژەنین دەنگی دیت. کاتێ ئاوەکە بە توندی هەلدەقولێ، پریشك و تەرایی بە تەلەشتە بەردەکاندا دێتە دەرێ. بە زاراوی خەلکی دەوروبەری دەلین: "ئیمامزادە مەشکەی دەژێنێ".

لە پێش مەرلەدەکەی ورتکە بەردبە شکلی مانز و مەرەکێری کەوتونە سەریەك. خەلکی ئەوی زمانیان تورکیە. لە کەرامەتی ئیمام زادەدا دەلین، ئەو شکلەبەردانە کاتی خۆی هەمووجەیران بوون. کاتی کەیشتوونە بەر درگای ئیمامزادە، کورەکەی بەزمانی تورکی بە بابی گوتوە گوێر.. گوێر( واتە ببینە.. ببینە)، کابرا کە ئاور دەداتەوە ئەم حەیرانانە گشتیان بوونە بەرد و تا ئیستا واماونەوە. بەم بونەوە ئیمام زادە و گوندەکەی ژێر تەپولکەش بە "بابەگوێرگوێر" ناسراوە و لە گوزەشتی زەمان و زۆر گوتنیدا بوتە (باباگورگور). لەخوارەوەی ئەم شوێنە تەپۆلکێك هەیە کە هەسر لەلش ئەلشە و پرە لە ئورناوێکی سوور و هەمیشە لە پال خوی دا دەکولی وەك ڕوتی داغ کراو دەنگی دێت و هەلدەقولی. سەیر ئەوەیە قەت کەم و زیاد نابی و هەمیشە وەك خوێەتی. نووسەر فرە حەولی دا کە قولایی ئەو بزانێ، نەیتوانی چونکە ئامرازی ئەو کارەی بۆ ئامادە نەبوو. لە بەر پیری و ناراحەتی ناوی ئیمامزادەم لەبیر نیە. لە تەختەی

زیارەتگایەکەی نووسراوە. لام وایە جەعفەر یا هادی بێ. خوا چاتر دەزانی.

## ئێستا باسی ئەم نشان و شوێنەوارانە دەکەم کە لە مڵکی بابانندان

لە وڵاتی بابان لە یازدەفرسەخی شاری سولەیمانی لەلای چەپی قیبلە، گوندێك هەیە بە ناوی دڵو، لەنێو فرسەخی ئەو جێگایە، زەوییەکی رەنگ سپی هەیە بەپێوانەی ۲۰ گەز بە۲۰ گەز روچوە. قولایی ئەم زەوییە روچووە پێنج گەز دەبێ. لە ژێرەوەی ئەو بەقەدرایی دوازدە گەز زەوی رووچوە و ئەم روچونەی دوایی لە۳۰ گەز زیاترە. لە سەرەوە را تا پانایی خوارەوە پلیکانی بچوك دروست کراون کەبەهاسانی هاتوچوێان پێدا دەکرێ.

لەژێری ئەم شوێنە، جێگایەکی بەدەوری پتەو هەیە. لەبن دیواری لوژبنێکیدا سێ کونی بچوك هەن کە هەریەکەی بە قەد بەری دەستی لێك دوورن. چوار گەز لە وێ دوورتر، سێ حەوز هەن هەریەك بە قەدرایی دوو گەزی چوار گوشە قوول وبەرینن، لەم سێ‌کونەوە سێ خەتی باریکی وەك جوگەلە کێشراون و لە ویوە ئاو دێتە نێو سێ حەوزەکەوە. بە قودرەتی خودای ئەرز و ئاسمانان ئاوی حەوزی لای راستەیان روون وسارد و سازکارە. ئاوی حەوزی نیوەراستیان کەمێك لیڵ و لە رادەبەدەر ترشە، ئەوەندە ترشە کە لە هیچ قاپێك دا، تەنانەت بەرد و ئاسنیش بێ راناوەستێ و دەیشکێنێ. تەنیا لەکولەکە دا دەتوانن بیبەن، بەڵام تامی ترشێکەی لە هەمو ترشیەك خوشترە، بەبێ تێکەڵ کردن دەگەڵ شتی چەور و شیرن ناتوانێ بەکاری بێنێ. توندی و تەرەتی ئەو لەجەوهەری گوگردی زیاترە. زۆر جاردیومە کە بەقەدرایی ۵-۶ مسقالیان لە دیزەی شوربا کردوە، لەبەر ترشی کەس پێ نەخوراوە، بۆ ژانی دەمار وماسانی دەست وپێ و ژانی ئامکان فرەباشە. شەربەتی لەگەڵ ئەدویەی تیز، پێشی رشانەوە دەگری و نەخوشی سردایی چاك دەکاتەوە.

کاتێك کە وڵاتی بابان لەبەردەست ئێران دابوو، مەحمودپاشا یەکێ لە نوکەرانی وەلیعەهدی خوا لێخوشبوو بوو، باوکی نوسەریش بەرپرسی خزمەتی ئەو مەلبەندە بوو، حەبیب الله‌خان ولەزاناغای سەرتیپ، سەرهەنگ ویاوەری تیپی ساخلو بوون ، لە گەڵ باوکیشم لەو پەری دوستایەتی دابوون هەمو پێکەوە چوونە سەیری ئەم جێگایە. لەم دوایەشدا کە لەزاناغا سەرتیپی توپخانە بوو، لە تاران تووشی ژانی دەمارەکانی ببوو، ساڵی

دووجار، بەندەوسولەیمانبەگیپرام لە سەر داوای خۆی لەم ناوەمان بۆ دەنارد.

بەکورتی جوگەلەکەی لای چەپ، ناوی لەرادمەر نالێ وسویتر بوو کە ولاهیش نەیدەتوانی بیخواتەوە. لە راستیدا جیگای سەر سورمانە کە لەجیگایەکی ناوا ناوێك بە سێ جورە تام وچێژ بێتە دەر. فاعتبرو یاالوالابصار

رووداوە بلاوەکانی ولاتی بابان تەواو بوو.

لەشوێنەوار و نشانەکانی ئەردەلأن حکایەتێك مابووە کە لە شوێنی خۆی دا نەنوسراوە و ئێستا دەنوسری.

دەوروبەری شاری سنە سێ چوار جیگا قەبرستانە، لەوانە لەلای رۆژئاوا قەبرستانێك هەیە بەشێخان ناسراوە. جیگایەکی فرە باسفایە. بەر لە دروست کردنی سنە ئەویَ قەبرستان بوە. بەندە خۆی تەئریخی قەبریکی خوێندەوە کە سێ سەت سال پتر بوە. تەئریخی دروستکردنی سنە تا ئێستا دوروسەت و چل و دوو ساڵە. دوو لەتە بەردی خولە مێشی لی هەن هەریەکەی بە قەدرایی سێ چارەك درێژ و نیو گەز پان ودرو گرێ ئەستورن. دەوریان شتێکی وەك خەتی هەلکەنراوی پێداهاتوە. خەلکی شار چل مێردەی پیَ تێژن. نازانم بۆچی ئەم ناوەیان لێناوە. کاتیَ دەگەل یەکێ لەدوستانم چوومە ئەوێ، ئەو بە وردی تەماشای کرد بویَ نەخوێنراوە، بەلام گوتی: لە خەتی کرتی پارسیانە و لەبری ئەوانە.

رووداوە بلاوەکانی کوردستانی ئەردەلأن وبابان تەواوبوو. لەبەر بەرێشانی وناراحەتی ئەم توانی رەوشت وشوێنەواری تایفە کوردەکانی دیکە بنووسم. لەمەودوا ئەگەر خوای تعالا ئەسبابی تەواوکردنی ئەم نووسراوەیەم بۆ ئامادە بکات بۆ تەواو کردنی ئەو تێدەکوشم.

رۆژی دووشەمو ۲۴ی مانگی ذیالقعدەالحرام سالی ۱۲۸۶ی کۆچی . هەزارسلاوی لیَ بیَ، نوسینی ئەو کتێبە تەواو بوو.

# پاشکۆ

به ناوی خوای رەحمان ورەحیم

ناوی پاشاکانی ئالی وەسمان وتەئریخی لەدایکبوون و چوونە سەر تەخت و ماوەی تەمەن و ناشتنیان لە مێژوی خەیرولا ئەفەندی وەرگیراوە. ناوبراو باڵوێزی دەوڵەتی ئێران بووە و لەتاران کۆچی دوایی کردوە و مەیتەکەیان لەهەیوانی رۆژهەلاتی مەرقەدی حەزرەتی عبدالعظیم ناشتوە. دەقی کتێبەکەی ئەوم دیوە، بەڵام چونکی باش لەزمانی تورکی عوسمانی شارەزا نەبووم، تەنیا چەند جێگام لێ وەرگرتوە، لەوانەیتری ناوی پاشاکانە. بەهەلکەوت رۆژێکیان لەباغی دەولەتاوای دەور و بەری تاران چاوم پێکەوت. باسەکەمان گەیشتە بابەتەکانی ناسخ التواریخ. گوتی: میرزای سوپەهر کە نووسەری ئەوکتێبەیە لەرووداوەکانی پاشایانی عەجەم بەشی زۆر وەدوای شانامەی فیردوسی کەوتوە و لە شی کردنەوەی ئەسلی بابەت لای داوە. نوسراوەکەی فیردوسی دەقاودەق هێناوەتەوە، بۆ نمونە گوتویە کەیخوسرەو تاجی بە لوهراسب بەخشیوە، لوهراسب نەوەی کەیان بوە. ئەوە راست نیە، لوهراسب کوری کەیخوسرەوە و میراتی باوك بە کور دەبرێ. دەقی قسەکانی خەیرولا ئەفەندی باڵوێزە کە نوسراو. من گوتم هەموو دیروکنوسەکانی ئیسلام لە سەر ئەو باوەرەن. گوتی وایە، بە لام نووسینی ئەم تەئریخە چەند ساڵ پێش ئیسلامە، لوهراسب کوری کەیخوسرەوە و لەو بارەوە ئیرادم لە ناسخ التواریخ گرتوە. بە کورتی من لە سەری نە رویشتم و باسەکەمان لێرەدا تەواو بوو، چونکە نەمن قسەکانی ئەوم سەلماند و نە ئەویش بە قسەی من لەخەیالی خوی پەشیوان بووە، جارێ ئەو بێرستەی ناوی پاشاکانی عوسمانیم بەمونتەبەر زانیوە ولەئاخری میرالاکرادی بۆ دانانی خۆم دا نوسیومە.

سولتان وەسمان خانی غازی، لەدایکبوونی ۶۵۶، چوونە سەر تەختی ۶۹۹، مردنی ۲۱ی شەعبانی ۷۲۶، ماوەی پاشایەتی ۲۷، تەمەنی ۷۰، قەبری لە خضرابە.

سولتان ئورخان، لەدایکبونی ۶۸۰، چوونە سەر تەختی ۲۷ی شعبانی ۷۲۶، مردنی ۷۶۱، ماوەی پاشایەتی ۳۵، ماوەی تەمەنی ۸۱، قەبری لەحەسار بروسایە.

سولتان مرادخانی غازی، لە دایکبونی۷۳۶، سەرتەخت ۷۶۱، شەهید بوونی ۷۹۱، ماوەی پاشایەتی ۳۱، ماوەی تەمەنی ۶۵، قەبری لە بروسا

گەرەکی جاکروە.

سولتان ئیلدرم بایەزید، لەدایك بوونی ٧٦١، سەرتەخت ٧٩٢، مردنی ٨٠٥، ماوەی پاشایەتی ١٣، ماوەی تەمەنی ٤٤، قەبری لە پەنا مزگەوتی بروسا.

سولتان محمد خانی چەلەبی، لەدایکبوونی ، ٧٨١ مردنی ٨٢٤، ماوەی پاشایەتی ٨، ماوەی تەمەنی ٤٣، قەبری لەمزگەوتی بروسا.

سولتان مرادخانی دوەم، لە دایکبوونی ٨٠٦، سەرتەخت ٨٢٤، مردنی ٨٥٥، ماوەی پاشایەتی ٣٠، ماوەی تەمەنی ٤٩، قەبری لەبروسا.

سولتان محمد خانی فاتحی غازی لە ئەستەنبول، لە دایکبوونی ٨٣٣، سەرتەخت ٨٥٥، مردنی ٨٨٦، ماوەی پاشایەتی ٣١، ماوەی تەمەنی ٥٣، قەبری لە میحرابی مزگەوتی جامع.

سولتان بایەزید خانی غازی، لەدایکبوونی ٨٥١، سەرتەخت ٨٨٦، مردنی٩١٨، ماوەی پاشایەتی ٣٢، ماوەی تەمەنی٦٧، قەبری لەپەنا مزگەوتی جامع.

سولتان سەلیم خانی بادر، لەدایکبوونی ٨٧٥، سەرتەخت ٩١٨، مردنی٩٢٦، ماوەی پاشایەتی ٨، ماوەی تەمەنی ٥١ قەبری لە پەنا مزگەوتی جامع.

سولتان سولەیمان خانی غازی، لەدایك بوونی ٩٠٠، سەرتەخت ٩٢٦، مردنی ٩٧٤، ماوەی پاشایەتی ٤٨، ماوەی تەمەنی ٧٤، قەبری لەمزگەوتی جامع .

سولتان سەلیم خانی دووەم ، لە دایك بونی ٩٣٠، سەرتەخت ٩٧٤، مردنی ٩٨٢، ماوەی پاشایەتی ٨، ماوەی تەمەنی ٥٢، قەبری لەمزگەوتی ئەیا سوفیە.

سولتان مرادخانی سێیەم ، لەدایك بوونی ٩٥٢، سەر تەختی ٩٨٢، مردنی ١٠٠٣، ماوەی پاشایەتی ٢٠، ماوەی تەمەنی ٥١ قەبری لەمزگەوتی ئەیاسوفیە.

سولتان غازی محمد خانی سێیەم، لەدایك بونی ٩٧٤، سەر تەخت ١٠٠٣، ماوەی پاشایەتی ٩، ماوەی تەمەنی ٣٧، قەبری لەمزگەوتی ئەیاسوفیەلە پەنا سولتان سولەیمان.

سولتان ئەحمەدی غازی لەدایك بونی ٩٩٨، سەرتەخت ١٠١٢، مردنی ١٠٣٦، ماوەی پاشایەتی١٤، ماوەی تەمەنی ٢٨.

سولتان مستەفاخان، لە دایك بونی ١٠٠١، سەرتەخت ١٠٢٤، لابردنی ١٠٢٧،.

سولتان وەسمانی دوەم، لەدایك بونی۱۰۱۳، سەرتەخت ۱۰۲۷ مردنی ۱۰۳۱، ماوەی پاشایەتی ۴، ماوەی تەمەنی ۱۸، قەبری لەپەنا ئەحمەدخان.

جاری دوەم سولتان مستەفا، سەرتەخت ومردنی ۱۰۳۲، ئەبری لەئەباسوفیە. شاراوە نەبی ژیانی سولتان مستەفاخان لێم روون نەبوو، هەروای ئەژمار لەدەستم دەر چوو بەلام چونکە لەکتیبی خەیرولا ئەفەندی دا هەروا نووسرابوو، بەندەش بەم شتانە ئەژمارەم هاتە دەست و ئەوەندەی بوم کرابی بو راستی هەولم داوە، ئیستا بچینەوە سەر ئەژماری پاشاکان.

سولتان غازی مراد خانی چوارەم ، لە دایك بونی ۱۰۱۸، سەرتەختی ۱۰۳۲، مردنی ۱۰۴۹، ماوەی پاشایەتی ۱۶، ماوەی تەمەنی۳۱ قەبری لە پەنا ئەحمەدخان .

سولتان براهیم خان، لە دایك بونی ۱۰۲۴، سەرتەخت ۱۰۴۹، مردنی ۱۰۵۸، ماوەی پاشایەتی ۸، ماوەی تەمەنی ۳۴، قەبری لە ئەبا سوفیەلە پەنا مستەفاخان.

سولتان محمد خانی چوارەم غازی لە دایك بونی ۱۰۵۱، سەرتەخت ۱۰۵۸ لابردنی ۱۰۹۹، مردنی ۱۱۰۴، ماوەی پاشایەتی ۴۰، ماوەی تەمەنی ۵۳، قەبری لە باغچەسەرا لەپەنا ترخان خاتونی دایکی.

سولتان سولەیمان خانی دوەم لە دایك بونی ۱۰۵۳، سەرتەخت ۱۰۹۹، مردنی ۱۱۰۲، ماوەی پاشایەتی ۳، ماوەی تەمەنی ۵۰، قەبری لەپەنا سولتان سولەیمان

سولتان ئەحمەخانی دوەم ، لە دایك بونی ۱۰۵۲، سەر تەخت ۱۱۰۲، مردنی ۱۱۰۶، ماوەی پاشایەتی ۴، ماوەی تەمەنی ۵۴، قەبری لەپەنا سولتان سولەیمان .

سولتان مستەفاخانی دوەم ، لە دایك بونی ۱۰۷۴ سەرتەخت ۱۱۰۶، مردنی ۱۱۱۴، ماوەی پاشایەتی ۸، ماوەی تەمەنی ۴۰، قەبری لەپەنا سولتان محمد خانی چوارەم.

سولتان غازی ئەحمەدخانی سی یەم ، لەدایك بونی ۱۰۸۴، سەر تەخت ۱۱۱۵، لابردنی ۱۱۴۳، مردنی ۱۱۴۹، ماوەی پاشایەتی ۲۷، ماوەی تەمەنی ۶۵، قەبری لەپەنا دایکی.

سولتان مەحمود خانی غازی، لە دایك بونی ۱۱۰۸، سەر تەخت ۱۱۴۳، مردنی ۱۱۶۸، ماوەی پاشایەتی ۲۵، ماوەی تەمەنی ۶۰، قەبری لە پەنا مستەفا خانی .

سولتان وەسمان خانی غازی دوای برای ، لەدایك بونی ۱۱۱۰، سەرتەخت ۱۱۶۸، مردنی ۱۱۷۱، ماوەی پاشایەتی ۳، ماوەی تەمەنی ۶۱،

قەبری لە پەنا سولتان مەحمودخان.
سولتان مستەفاخانی سی یەم ، لە دایك بونی ۱۱۲۵، سەرتەخت ۱۱۷۱، مردنی ۱۱۸۷، ماوەی پاشایەتی ۱۶، ماوەی تەمەنی ۶۲، قەبری لەمزگەوتی شەریف.
سولتان عبدالحمیدخانی غازی ، لەدایك بونی ۱۱۳۷، سەرتەخت ۱۱۸۷، مردنی ۱۲۰۳ ماوەی پاشایەتی ۱۵، ماوەی تەمەنی ۶۶، قەبری لە مەدرەسەی باغچەسەرای .
سولتان سەلیم خانی سی یەم، کوری عبدالحمید خان ، لەدایك بونی ۱۱۷۵، سەرتەخت ۱۲۰۳، لابردنی ۱۲۲۲، مردنی ۱۲۲۳، ماوەی پاشایەتی ۱۸، ماوەی تەمەنی ۴۸، قەبری لەپەنا مستەفاخان.
سولتان مستەفاخانی چوارەم، کوری سولتان سەلیم، لەدایك بونی ۱۱۹۳، سەرتەختی ۱۲۲۲، ماوەی پاشایەتی۱، ماوەی تەمەنی ۳۰، قەبری لەپەنا سولتان عبدالحمیدخان .
سولتان مەحمودخانی دوەم غازی، لە دایك بونی ۱۱۹۹، سەرتەخت ۱۲۲۳، مردنی ۱۲۵۵، ماوەی پاشایەتی ۳۲، ماوەی تەمەنی ۵۵، قەبری لەشوینی تایبەتی.
سولتان غازی عبدالمجیدخان، لە دایك بونی ۱۲۳۵، سەرتەخت ۱۲۵۵، مردنی ۱۲۷۷، ماوەی پاشایەتی ۲۲، ماوەی تەمەنی ۴۰، قەبری لەمزگەوتی سولتان سەلیم شوینی تایبەتی.
سولتان عبدالعزیزخان، لە دایكبونی ۱۲۷۷، تائیستا یازدەسال لە پاشایەتی ئەو تیپەریوە. تەواو
لە لاپەری ئاخری کتیبەکەدا، باسی کوشتنی کیژی محمد خان وەزیری پیشوی کوردستان کراوە، وەرگیرانی ئەو لاپەرەم پی زیادی بوو.
«وەرگیر»

# پەراویزەکان

١ - سروج النحب، بەرگی یەکەم، لاپەرەی ٣ - ٣٨١

٢ - شەرەفنامە لاپەرەی ٣٢ - ٣٣

٣ - تاریخ عالم آرای عباسی، بەرگی دووهەم، لاپەرەی ٨١٤

٤ - تاریخ مشاهیر الکراد، بەرگی یەکەم، لاپەرەی ١

٥ - قونیە شارێکە لە کوردستانی تورکیا، مەرقەدی مولانا جەلالەدینی رومی لێیە

٦ - پاس ئیلان ئیل رستەکەی ناتەواو ماوەتەوە

٧ - فەرسەخ (فەرسەک) شەش کیلومەترە

٨ - یەك کرور پێنجسەد هەزارە.

٩ - لە ئەسلی کتێبەکەدا "مشافشیا" نووسراوە. کاك محمد رئوفی توکلی کردوویە بە "مشافە" واتە گفتگو کردن. لەوانەیە "مسافت" بوویی. واتە مەودا. بەلام هەرچی بێ کوردیە یەتییەکەی هەر ئەو مانایە ئەدا کە نووسیومە. ك. ح.

١٠ - مستوفی لە ئیزامی حکومەتی عەجەمدا، بەو کەسانە گوتراوە کە موچەگر و دەفتەردار و خەزێنەدار بوون.

١١ - بە دانانی معتمدالدولەی مامی ناصرالدین شاه بە حاکمی کوردستان، ئیتر حوکمرانی کورد لە ئەردەلان کوتایی پێهات.

١٢ - کاك محمد رئوف توکلی کورە گەورە بە "سەرگەورە واتە رئیس" لێس حالی بوە. فارسیەکەی (سربزرگ) نوسراوە لە ئەسلی دا پسر بزرگ واتە کوری گەورەبوە و لە چاپدا "پ" یەکە کەوتوە چونکە دوایە "ئەحمەد بەگ" باسی بابی دەکات.

١٣ - نوسەری ئەم کتێبە، بە پشت بەستنی بەو نووسەتە ناڕەوایە کە درلوئە پاڵ یەزیدیەکان، ئەوان بە شەیتانپەرەست دادەنی. دیارە دەبێکە بێ پنج و بناوانی و بوچی ئەو قسەیە ساخ بوتەوە. (ك.ح)

١٤ - بردنی بووك بۆ کن زانای گوند یا سارخەکردن، بە تەواوی درویە و دوژمنی یەزیدیەکان ئەو بوختانەیان ساز کردوە، یەزیدی ویا بە زاراوێك داسنی تیرەیەکی کوردن کەزوربەیان لە ناوچەی ژەنگاروشێخان لە نیزك موصل دەژین. هێندێکیش لەقەفقاز وگورجستان و ئەرمەنستان وروژخی دەریای مازەندەران وئالستای وکامچاتکا ولە چین بەناوی دیکە دەژین. بە لەولی گەروکی ئینگلیسی روزیتا فورس ساڵی ١٩٣١ ژمارەیان ٢٥٠هەزار کەس بوە. بەلام لە ئەنتیجەی ئازار و ئەزیەت و چەوسانەوەدا تا ٦٠ هەزار کەس کەم بوونەوە. زانایان لەسەرئەو باوەرەن کە وشەی "یزیدی" لە "یەزدان" خودا وەرگیراوە ئەوەش راست نیە کەگویا بنەچەکەیان دەچێتەوە سەر یزیدی کوری معاویە.

ئەوان بروایان بە دوو خودا هەیە، خودای چاکە و خودای خراپە. دەلێن خودای چاکە خاوەن رەحمەت و لی بووردنە ولەت خراپە لەوسەرەمل نادا.کە وابوو دەبێ خودای خەراپە ویا شەیتانپەرەستن تا لە شەری وی لەئەمان دابن.

ریبەرەکەیان ئەمیری شێخانە ولەشێخان دەژی. خاوەنی دەسەلاتێکی زوور بوە. بۆ

ئەنجامی فەرمانەکانی، ئەمیری بچوکتری لە بەر دەست دایە، گەورەترین سەرۆکی ئایینی ئەوان ناوی باباشێخە و ئەم پلەیە میراتی‌یە. ئەو دەتوانێ لەمەسەلەکانی دینی سەر بەخۆیان لێرا بدات.

یەزیدی‌یەکان ژن هێنانی غەیری خۆیان پێ گوناهە، لەرەنگی شین بێزارن خۆ لە بەکارهێنانی ئەم وشانە دەپارێزن کە پیتی "ط" یا "ش"ی تێدا بێت. گاجوت بۆ ڕۆژێك دەکەنە قوربانی، کوشتنی پەلەوەر و حەیوانانی دیکە و برینداری کردنی داری پیرۆز بەگوناح دەزانن، کاتی ڕۆژ هەلاّت و ڕۆژئاوا سوژدە بۆ یەبکەری داعیایەك دەبەن بە ناوی "مەلەکە تاوس" لەسەر ئەو باوەڕەن کە شێخ عدی ئەو کەسەی دەیپەرستن کەسالّی ۱۱۶۰ وەفاتی کردوە، لە هەر دەورانێك بە شکلێك دەردەکەوی ولەگەلّ مەلەک تاوس یەیەکی دەزانن. خاوەنی دوو جۆر کتێبن، یەکیان بەناوی "جلوە" و ئەوی تر "مصحەفی رەش".
بەگشتی لە سەر یەزیدیەکان لێکۆلینەوەی زۆر کراوە کە باسکردنیان بەدرێژی لێرەدا جێ نابێتەوە بێجگە لەوە،، سەرەرای ئەم هەمو شیکردنەوە و لێکۆلینەوە، هێشتا زۆر لە بیروباوەری ئەوان نەناسراوە، چونکە سەبارەت بە ئازاردانیان بە درێژایی مێژوو، ئەهان ترسیوە و خەلك لە راز و نەهێنیکانیان ئاگادارنین. بردنی بووکی پێش زاوا بۆ کن زانای گوندی، بوخشانێکی دروە. هەروەها شێخ رەزای تالّەبانی لە بەستە شیعرێك دا بوختانی بەکاکە سیبەکانی دەوروبەری کەرکوك کردوە کەگویا لە جێژنی ئاییەتیان دا ژن وپیاو پێك رەدەبن و تێکەلّ دەبن. بۆ ئەم تیدمایە هیچ بەلّگەیەکی نەهێناوەتەوە، دیارە هۆیەکەی نا ئەبلی عەشیرەتی بوە.
● محمدامینی زەکی کوردوکوردستان و مێژوی سولیکەری لە کوردستان (راستکەرەوەی کتێب)
۱۵ـ فرسەخ لە کوردی دا فوناخیشی پێ دەگوترێ و شەش کیلومیترە (ك.ح)
۱۶ـ مالحاوا ۲۳ کیلومیتری سەرووی ڕۆژئاوای هەمەدانە و لە پەنا جادەی هەمەدان ـ سنەیە.
۱۷ـ هەمەکەس لەسەر ریگای هەمەدان ـ سنەیە. ۴۰ کیلومیتر لە سەرووی ڕۆژ ئاوای هەمەدانە.
۱۸ـ ئەسفەند ئاوا گوندێکی سەر بەقورومیە. لەلای سەروی شارستانی بیجار، لە خوارەوە سونقر و کولیایی، لە ڕۆژ هەلات، خرابەندەلو، لە ڕۆژئاوا بیلاق.
۱۹ـ دوو وەیسە ـ گوندێکە لە گلانەرزان، بەشێکی دەوروبەری سنە و ۱۷کیلومیتری سەرووی ڕۆژئاوای سنەیە.
۲۰ـ جانۆمر ـ گوندێکی بچوکە لە ناوچەی سەرشێوی شارستانی مەریوان.
۲۱ـ کچك ـ لە مەلبەندی تررجان، ۱۴کیلومیتری خوارووی ڕۆژئاوای بۆکانە.
۲۲ـ گزان ـ گوندێکە لە مەلبەندی حەسەناوای دیواندەرە. دوازدە کیلومیتری حەسەناوا. دیواندەرەیە.
۲۳ ـ باقساغ ـ گوندێکە لە بەشی تیلەکۆ ـ ۵۴کیلومیتری ڕۆژئاوای دیواندەرەیە.

# *** بەرهەمەکانی نووسەر ***

## نووسراوەکانی نووسەر:

١-کاروانێك لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢-ولاّمێك (کوردی فارسی)
٣-لە دەوری رێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکرات کۆ بینەوە
٤-رەخنە لەسەر کتێبی حوسێنی مەدەنی
٥-رێنوێنی شەری پارتیزانی
٦-چەند قسەیەك لەگەڵ خەبات
٧-کورد و فەرهەنگی بێگانە
٨-لێکۆلینەوەی "کورتەباسێك لە سەر سوسیالیزم" کوردی و فارسی
٩-تایبەتی کوتکرەی شەشەم
١٠-کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خودموختاری
١١-لە بیرەوەریەکانم (بەرگی یەکەم)
١٢-یادی هێمن
١٣-لە بیرەوەریەکانم (بەرگی دووەم)
١٤-لە بیرەوەریەکانم (بەرگی سێیەم)
١٥-لە پێناو چیدا
١٦-لە بیرەوەریەکانم (بەرگی چوارەم)

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردوونی بە کوردی:

١-دایك - ماکسیم گورکی
٢-ژیان و کردەوەکانی لێنین
٣-ئەفسانە کوردییەکان - رۆدینکۆ
٤-زەوی بچوك - برێژنێف
٥-مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید
٦-قانوونی بنچینەی ئابووری سوسیالیستی
٧-کۆمەلە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بێگانە.
٨-حەمە چکۆڵ (ئینجە مەمەد) -یاشار کەمال
٩-ئوسولە سەرەتاییەکانی فەلسەفە -ژورژ پولستیر
١٠-نامەی گوڵەبان کراوەکان
١١-کورتە مێژووی کۆماری بولغارستان
١٢-ئازادی یا مەرگ - کازانتزاکیس
١٣-رەوشی کوردان (مێژووی بابان و ئەردەلان)